# فەرهەنگ
# و
# لێکحاڵیبوون

# فەرهەنگ
# و
# لێکحاڵیبوون

**بەشداران:**

- مەسعود محەمەد
- فەرهاد شاکەلی
- شکور مستەفا
- فەلەکەدین کاکەیی
- د. شێرزاد نەجار
- د. مارف خەزنەدار
- د. رەشاد میران
- د. فازڵ جاف
- کەریم شەریف قەرەچەتانی

# فەرهەنگێکی شێواو
# ڕۆشنبیران لەو شێواوتر

فەرهەنگ «ڕۆشنبیریی»، یەکێکە لە گرفتە سەرەکییەکانی ئێستای کوردستانی ئازاد. بەدرێژایی مێژووی ئەم وڵاتە هیچ کارێکی پوخت و بەبەرنامە لەسەر ئەم بوارە نەکراوە. ئەم قسەیە کاتێک بێ گرێ دەبێ ئەگەر هەوڵوتەقەلای فەردی ڕۆشنبیرانی کوردستانی لێدەر بکەین ، کە بە شێوەی جیا جیا، لە زۆربەی بوارەکاندا کاریان کراوە.

پاشکەوتوویی فەرهەنگی، ڕەگوڕیشەیەکی قوڵی هەیە ، چونکە تاکو ئێستا نەک هیچ حکومەتێک، بگرە تاکە دەزگایەکیش بە شێوەیەکی مونەزەم کاری تێدا نەکردووە. هەربۆیە زۆربەی بارەکان بە خاوی ماونەتەوە ،بە تێپەڕینی زەمانیش، چەندی فەرهەنگی دەوروبەر بەرەوپێشەوە چووە، بەهەمان نسبەتیش فەرهەنگی وەستاوی کوردستانی ئاڵۆزتر کردووە.

لەو پرۆسەی سەرەوەدا، فەرهەنگی وڵاتانی دراوسێ کە لەهەمانکاتدا داگیرکاریش بوون،بەجۆرێکی سەلبی کاریان کردۆتە سەر فەرهەنگی میللەتێکی ژێردەستە، کەتەنانەت بیرکردنەوە لە پوختە کردنی زمانیش، بە تاوان و یاغی بوون دادەندرا.

دوو شێوەزاری زمانی کوردی، ئاستەنگێکی دیکەی سەر ڕێی پێشکەوتنی فەرهەنگەکەیەتی. ساوایی کە نیشاندەری ناتەواویی پرۆسەی پێگەیشتنی ئەم زمانەیە، وایکردووە کە پێگەیشتنی ڕۆشنبیریی بە یەک شێوە نەبێت. کاتێک زمان یەکگرتوو نەبوو، واتا و مەفهومە فەرهەنگیەکانیش فاسیلە لێکدی وەردەگرن و لێکحاڵیبوون بەزەحمەت دەکەوێ.

زمانی کوردی، قەت بەشێوەیەکی ڕەسمی بۆ دەوڵەتداری بەکانەهێندراوە، بۆیە ، ڕوناکبیرانی کوردستان، تێکەڵ بەزمانی ئەو وڵاتە بوون کە پێیەوە لکاوون، بوونە بەشێک لە فەرهەنگی ئەو وڵاتە. ئەوەش وایکردووە دابڕان لە مێژووی ڕۆشنبیریی کوردستاندا جێ ببی و هەست بە قوڵیی مێژوویی نەکرێ.

توندوتیژی داگیرکار وایکردوە، کە ڕووناکبیری کورد هیچ وەختێک نەتوانێ کار لەناو قوڵایی ڕۆشنبیریی وڵاتەکەیدا بکات، بەترس و لەرزەوە لەقەراغ مەسەلەکاندا بە شۆڵەوە خەریک بێت. ڕوناکبیری کورد بۆی نەلواوە ئازادانە کار بکات، بە بێ منەتی هەڵوێست وەربگرێ. بۆیە ترسنۆکانە ڕاهاتووە.

لایەنێکی دیکە لە شێواوی ڕوناکبیران، کاردانەوەی ناواقیعیانەیانە لەبەرامبەر دەسەلاتی خۆیی، کە لە قۆناغی ڕزگاریدا پەیدا بووە. بۆ تێهەڵهێنانەوەی گرێی ملکەچی زەمانی داگیرکار، لە کاتی ئازادیدا ،هەڵوێستی دڕدۆنگانە لە دەسەلاتی نیشتمانی وەردەگرێت ، تاڕادەیەک بووە بەرهەڵستکاری ناکاریگەریش.

بۆ لێکۆڵینەوەی ئەم باسانە، گفتوگۆیەکی پشو درێژمان دەستپێکرد.

ڕاوبۆچوونی ژمارەیەک ڕوناکبیری ناسراو و دەستڕەنگینمان لەم تەوەرانە کۆکردەوە. بەو هیوایەی توانیبێتمان لە دەرگای مەسەلە ئاڵۆزەکان بدەین و سەرنجی خاوەنفکران بۆ زیاتر کارکردن لەم بوارە پڕ بایەخە ڕاکێشین.

نابێ ڕۆلی یەکێتی نووسەرانی کورد لقی هەولێر، لەبیر بکەم،کە بە کۆڕە دۆڵەمەندەکانیان،بەشدارییەکی باشیان لەو بوارەدا کرد. ژمارەیەکی زۆر لە گفتوگۆیەکان بەمیوانداری ئەوان کراوە، لە گۆڤاری گولانی هەفتانەشدا بلاو کراونەتەوە.

حوزەیرانی ٢٠٠٠

## مەسعود محەمەد:

# دیموکراسی زۆر ئەریستۆکراسییە

*** مامۆستا جەنابت هەموو نووسینەکانی خۆت بۆ مناقەشە کردنی ئەو بیروڕایانە تەرخان کردووە  کە لە ناو کۆمەڵی کوردەواریدا لە هەردوو بواری سیاسی و فکری، سەریان هەڵداوە بە تایبەتی ئەو بۆچوونانەی تۆ بە نامۆت داناون. بۆ نموونە بەشێکی زۆرت بۆ مناقەشەکردنی فکری کۆمۆنیستی تەرخان کردووە. ئێستا ئێمە لە ژیاندا کەوتنی  کۆمۆنیزممان دیت، لەسەر ئاستی جیهانی و نیشتمایدا. ئامانجی جەنابت لە کردنەوەی ئەم باسانە چی بوو، بۆ دژایەتی کۆمۆنیزم بوو یان بۆ روونکردنەوەی فکری کوردی بوو؟ هەندێک دەڵێن مەبەستی یەکەمت هەبووە.**

** من لە گەروی کوردایەتیەوە بۆ شیوعیەت و  بوونی شیوعیەت چووم، بەڵام خۆ کورد ،شتێکی جودا لەمرۆڤایەتی و مێژوو وئەو پرۆسەیە نیە، کە لە دنیادا هەیە. من مناقەشەی شیوعیەتم کردووە، ئەو شیوعیەتەی کە بە کوشتن و بڕین، یەکسانی دروست دەکا ، ئەو شیوعیەتەی وادادەنێ کرێکار وجوتیار پڕۆلیتاریان ودەبێ ببن بە حکومەت. دەبێ *بزانین کۆمەڵی کوردی نەک ئامادەگی شیوعیەت و ئیشتراکیەتی نیە*، بگرە *تەنانەت هی بۆرژوازییەتیشی* نیە. کورد،خاوەنی هیچ شتێک نیەکە سیستەمێکی لەسەر بنیاد بنرێت، جگە لەو سیستەمەی کە وەکو نەمامێک دەچێنرێ و دەبێ ئەو نەمامە ساوایە ئاو بدرێ، خزمەت بکرێ و بیپارێزرێت. ئەوەش لە کوردستان گەلێک بە زەحمەت دەست دەکەوێ. جا شیوعیەتێک کە ئایدیۆلۆژیایەکەی نەهێشتنی «چینی ناوەڕاست»ە ـــ کە ئەگەر ئەو چینە نەبی شارستانیەت نامێنێ،چونکە هەر چی تاکتیک و علم و شارستانیی *هەرچی ئەوەی ناوی لێدەنێی* پێشکەوتن هێناویتیە بەر ـــ دەیەوێ سیستەمێکی نوێ بنیاد بنێت.جوتیاری بەستەزمان کە پێنج هەزار ساڵە لە پشت گاجووت زەوی دەڕوشێنی و ئێستا ئیمزای خۆی فێرنەبووە، چی لەدەست دێت؟  لە وڵاتی ئێمەدا پڕۆلیتاریا هەر پەیدا نەبووە ،گریمان ئەگەر پڕۆلیتاریای خوێندەواری وەک پڕۆلیتاریای بەریتانیاشمان هەبوو،کرێکاری کارخانە چۆن دەتوانی ببیتە مامۆستای زانکۆ، چۆن دەتوانی ببیتە وەزیر ،کرێکار چۆن دەتوانی ببیتە سەرکردەی سوپا، چۆن دەتوانێ بێتە سەرۆک کۆمارو بێتەزانای فیزیا؟.. ئەو شتانە دوورن لە هەموو ئەو کەسانەی کە دوورن لە بابەتەکە.

لای من مرۆڤ هەمووی یەکسانە، کەس لە کەس بەڕێزتر نیە. تەنها پێوەرێک بۆ ڕێز ڕێژەی داهێنان و تێگەیشتن و ئەو خزمەتەیە کە مرۆڤ پێشکەشی خەڵکی دەکات. من کە دەڵێم شیوعیەت بۆ کورد دەستنادا، نەک هەر دەستنادات، بگرە شتێکی مەحاڵیشە. کوردێک کە لە هەموو تەمەنیدا سەرافیکی نەبووە، باسی بانکی نەکردووە، کوردێک ٢٥٠٠ ساڵە لە مێژوو دابڕاوە و لە دەرەوەمیدا دەژیت، چۆن دەتوانێ شیوعیەتێکی وەها بەنازوفیز کە دەبێ بۆرژوازیەت و ئیشتراکیەتی بەجێ هێشتبێ، ببێ بە شیوعی، ئەمە خەیاڵێکە، هەتا لە یەکێتی سۆڤێتی پێشووشدا دەرچوو کە خەیاڵاتە. جابۆیە دەبێ من بەرهەڵستی ئەو فکرە بکەم.

*** لەسەر ئاستی نەتەوەییش؟**

**** هەڵبەت** لەرووی ئینسانی و واقیعبینی و هەر ناوێکی لێدەنێی ،دژی شتێکم کە هەوڵ بدات ئەو مستەحیلە بێتەدی. جا ئەو ڕێگەیەی کە شیوعیەتی جیهانی گرتیەبەر ڕێگەیەکی کوێرە، چونکە ئەو بە بۆچوون لە بۆرژوازییەتەوە دەڕوا بۆ ئیشتراکیەت ،لە ئیشتراکیەتەوە دەڕوا بۆ شیوعیەت. بە قەناعەتی من لەوە بەولاوە دەچی لەبۆ ئەنارشیزم کە دەکا بێ حکومەتی.

*** بڕوات بەواقیعیەتی ئەو قۆناغانە هەیە کە شیوعیەت داینابوون؟**

****** ئەوە لە شوعیەتی مارکس دا هەیە. هەرچەندە بڕواناکەم کەسمان ئەوەندەمان خوێندبێتەوە بزانین هەموو شتەکانی مارکس چیان گوتووە. کاتی مەقولەیەکی دەخوێنی دەڵێ پێشکەوتنی مێژوویی بە پێشکەوتنی کەرستەی بەرهەمهێنانەوە بەندە،ئەمن شێت ،دەبم، چونکە کەرستەی بەرهەمهێنان داهێنراوی دەستی مرۆڤە. ئەو دێت عەرەبانە لە پێش ولاخ دادەنێ، دەڵێ عەرەبانە خەڵک دەگەیەنێتە نازانم کوێ. ئاخر ئەوە ئێسترو ئەسپە کە رایدەکێشێ ،مرۆڤەکە کەرستەی بەرهەمهێنان دروست دەکا. بە قەناعەتی ئەو ڕێبازەی کە مارکس گرتی ـ لەگەڵ هەموو بلیمەتی خۆی، بەردەوام گوتومە ئەگەر ١٠ کەس *بلیمەت بن لە دنیا، یەکیان مارکسە بیکەی ٩ یەکیان مارکسە بیکە ٨، ٧. یەکیان مارکسە، ئەوانە هەموو دەزانم ـ بەڵام کابرا لە سیاسەتەوە بۆ بابەتەکە چووە نەک لە عەلمانیەت و پیشەسازییەوە.* چونکەدەیەوێ چینی کرێکار بگەیەنێ بە حوکم، *لەگەڵ هەندێ وردەکاری ئەولا ئەولا...*

*** تۆ دەڵێی ئەگەر کار بکاتە لایەنی کۆمەڵایەتی ویەرابەری ئینسان، من لە هەموو کەس کۆمۆنیستترم .تۆ بە دژی کۆمۆنیزم ناسراوی.بۆیە لەو قسەیەت حاڵی نابم.**

****** لە یەکسانیدا بەڵێ. با ئەوەشت پێ بڵێم من لە دەروونی خۆمدا کە لە عێراق دەژیم ، ئەگەر داهاتی نەتەوەیی بەسەر تاکەکاندا دابەش بکرێت، منیش وەکو تاکێک پشکێکی ئەو داهاتەم بەر دەکەوێ ، بەڵام ئەگەر خزمەتێکم پێشکەش کرد نابێ لێم بستێنن،کە داهێنانێکم کرد دەبێ حەقێکم بدرێتێ. *لە راستیدا لە هەر دەهەزار مرۆڤێک یەکێکیان ، دروستکەری شارستانیەتە.* بۆ نموونە بۆ ئەو *کارەبایەی تۆ لەبەری دانیشتووی وبەلاتەوە ئاساییە، قەرزاری ئەدیسۆنی.* فەردیک دروستی کرد. *شارستانیەتی ئەم سەردەمە لەدەوروو پشتی نسبیەی ئەنشتاین دەخولێتەوە.* بەڵێ من کە دەڵێم *لە هەزاری یەک لەئینسان شارستانیەت پێش دەخات،* نەختێک غەدرم *لەداهێنەران کردووە* چونکە ژمارەیان گەلێک لەوە کەمترە.

***تۆ پێتوایە کۆمەڵی کوردەواری ئامادەگی پێشکەوتنی زۆر کەمە بۆیە دەبێ هەنگاوە گۆڕانکارییەکان وەک منداڵ بپارێزرێن. بۆ ئێستای کوردستان مەبەستت چیە؟**

** کۆمەڵی کوردستان و کورد ئەگەر ناوی لێدەنێی، ئەگەر ئێرەیەو ئەولاترە، یەک رێی لە پێشە؛ ئەویش بریتیە لە پاراستن و بەردەوامی تەجرەبەکەیان. تۆ ولاتێکت نیە دانی پێدانرابێ. مەنشوری رۆژهەلاتی ناوەڕاست کە سیاسەتی جیهانیش لەگەڵی دەڕوا، لە کولانەی رۆژهەلاتی ناوەڕاستەوە بە گوێرەی سودی خۆیان ئەگەر چاودێریەکی کورد بکەن هەر ئەوەندە دەکەن و هەر ئەوەندەشیان لێ داوا دەکرێت.ئەوانە نە مامەمانن ، نە باوک ونەدایکمانن، ئێمە مەرحەبا لە کەس ناکەین، ئەگەر ئەوان مەرحەبایێکمان لێبکەن دەبێت مەمنونیان بین.

کورد ئێستا لە پلەیەک دایە، وەکو کابرایەک سواری بەلەم بووە و لە دەریا دایە ،نازانی دەگاتە وشکانی یان نا. دەبێ خۆی قوتار بکا. گەر بپرسی چی بکەین لە کوردستانی خۆمان کە چەندێکی رۆیی کرا بە عەرەب؟ ئێستا مەسئولیەت لە ئەستۆی (یەکێتی و پارتی)دایە، چونکە من نامەوێ خوانەخواستە هیچ لایەکیان عەیبداربکەم، دەزانم ئەگەر لایەکیان فەوتا لایەکەی دیکەش دەفەوتێ. ئەمەشم پێش ساڵێک بەهەردووکیان گوتووە: کە ئەگەر ئێوە یەک نەبن نەسیحەت سودی نیە، ئەگەر یەک نەبن کورد داهاتووی نیە، ئەگەر یەکتان ئەویدیکەی خوارد، ئەوی تریش نامێنێ، هەردووکیشتان ئەوە دەزانن. ئێستاکە بەرپرسیارییەتیەکە لە ئەستۆی ئەو دوو حزبەیە،هەڵبەت ئەگەر فێڵ لە خۆمان نەکەین و ئەگەر بێت و قسەی راست بکەین.

*** ئەگەر بێینەوە سەربابەتی دیموکراسی . ئەمڕۆتەنگژەی سیاسی لە کوردستاندا هەیەو شەڕی ناوخۆ بەردەوامە. کە باس لە ئاشتی دەکرێ باس لە پێکهاتنەوەش دەکرێ، بەلام تاکە رێگە ئەوەیە هەر دوولا بڕوایان بە دیموکراسی هەبێ و کێشەکە بە هەڵبژاردن چارەسەر بکرێ.جارێ مەبەستم مناقەشەکردنی لایەنە سیاسیەکە نیە ، پتر لەوەی مەبەستم ئەوەیە ئێمە ئەزموونێکی بەناو دیموکراتیمان دەستپێکرد، بەلام کورد تەحەمولی ئەوەی نەکرد. پاش ئەو ٥-٦ ساڵە دەتوانین مناقەشەیەکی بکەین و ئەنجامی لێوەربگرین؟**

** دیموکراسی وەک خەڵک تێیدەگا؛ بەرگێکە هەر لەبەری بکەو خوا حافیز، قەت ئاوا نیە. دیموکراسی بە تەعبیری خۆم تا بڵێی ژیانی شارستانیە بە هەموو زانست و تەکنیک و پێشینەی فەرهەنگی و ژێرخان و سەرخان ، بەهەموو سەدەها ساڵی لێرەبەپێشەوە کە قسەی کردبێ .شارستانییەت بە دیموکراتیەتەوە قسەی کردووە. دیموکراسی تەرجەمەی شارستانیەتە. زۆر زۆر بەداخەوە ،مەگەر ئێمە وەک شانامە و ئەسکەندەرنامە، بۆ خۆمان پاڵەوانی و رۆڵێک دروست کەین ئەگینا ئەو دیموکراسییەی جەنابت قسەی لێدەکەی بێتە ئاراو کایەوە، بەو ئاسانیە نیە کە خەڵک بیری لێدەکاتەوە.

با نموونەیەکت پێ بڵێم وقسەی خۆم ئەبڕمەوە: پێشتریش گووتومە فیوداڵێکی ئەورووپای بەر لە٥٠٠ - ٧٠٠ ساڵ کە لەقەلاکەی خۆی یان لە کۆشکەکەی خۆی دەینارد بە دوای هونەرمەندی سەردەم ،تا بێت وێنەیەکی درووست بکات، چی شارستانیی ئەو کاتە هەبووە لەو ساتەدا، لەشێوەی نانخواردنەوە بگرە تا جلوبەرگ پۆشین و چەک و تفاق، هەر هەمووی تۆمار دەکرد و لە باوکەوە بۆ کوڕ

دەگوازرێتەوە.ئینجا وەرە ئەمە لەگەڵ دیوەخانی یەکێ لەسەرەک عەشیرەتەکانی کوردستاندا بەراورد بکە، مەگەر منداڵێک بە رەژو لەسەر دیواری دیوەخانەکەی نەختێک خەتخەتانێی کردبێ .

جا لەو رۆژەوە حسابی بکە، ٦٠٠ ساڵی تریشی بهاوێسەر لە پێشکەوتن، کە جەنابت داوام لێدەکەی بێم دیموکراسی چ لێبکەیم؟ پێم بروا بفەرموو ئەگەر یاسا کە هێزی سیاسەتی بەدەستەوەیە لە کوردستان نەبێ ، دیموکراسی لەخۆدا ناتوانێ لە کوردستان دروست ببێ. یەعنی دەبی بە تەواو مانا داکۆکی لێبکەین، دەبێت خۆت بکەیتە خزمەتکارو پارێزگای ئەو شتەی کە تۆ پێی دەڵێی دیموکراسی، هەتا ئەگەر شانسی سەرکەوتنت نیو یان لە نیویش کەمتر بێت ، ئەوا دیسان سودێکی زۆرت بەو خەڵکە گەیاندووە. ئێستا لە یەکەمی هەڵبژاردندا ٥٠بە٥٠ بوو ،خەڵکەکە سورە بۆ دەنگدان، بەڵام دوای ئەوەی دەنگیدا، خۆ هیچ رای بە دەست نەما. حزب و ئەوانە زاڵ بوون کە چەکیان بەدەستەوە بوو. تەنانەت وەزارەتی بەرگریش هیچ چارەسەرێکی پێنەبوو چونکە لە ژێر دەسەڵاتی حزبەکان دابوو. ئینجا ئەو دیموکراتیەتەی جەنابت بەو ئاسانیە لە منی دەپرسی کە چارەیەکی بۆ بدۆزمەوەو کورد لە خۆیدا بگرێ، بەو ساناییە نیە. ناڵێم خوانەخواستە بێ ئومێدت کەم، بەڵام ئومێدەکە بەو مەسافە کەمە نیە کە هەروا دەستی لە بۆ درێژ بکەی وەک دەچینە بازاڕ تەماتە دەکڕین، دیموکراتیەت زۆر بەنازو فیزە زۆر ئەرستۆقراتیە.

*** باسی پاشکەوتنی کۆمەڵی کوردەواریت کرد، ئەگەر لەبەر چاو بگرین کە بە درێژای مێژووی هاوچەرخ، ناکۆکی بە چەشنی شەڕ لە ناو کوردا هەر هەبووە، چەندی لەم ناکۆکیە دەگەڕێتەوە بۆ کەموکورتی لەفکری کوردیدا، بە قۆناغەکانی خۆی لەو کاتەوە تاکو ئێستا؟**

*** کەمو کورتییەکە تەنها لەشتێکی دیاریکراودا نیە. پێشتر فکری کوردی نەبووە ،کوردایەتی نەبووە. لە ٢٥٠٠ ساڵەوە کەس فکرێکی نەبوو. ئەگەر بڵێین میدیا کوردە کە من بە کوردی دەزانم لە ٢٥٠٠ ساڵەوە کوا حکومەتەکەی؟ تەنانەت من دەڵێم لە دەرەوەی مێژوو دەژین. ژیانی خێڵەکی هەبووە، ئەویش ئەوە نیە لە بەرگەشەگەشی چاومان، نەخێر، چونکە بازرگانی نەبووە، هاتووچۆ نەبووە، هەر خێڵێک لە قاوغێکدا دەژیا، ئەوسا سەرۆک خێڵ خیانەتی لە خێڵەکەی خۆی نەدەکرد . کەچی ئێستا بارودۆخ وایکردووە ئەو خێڵەش نەمێنێ، ئێستا تەنانەت وای لێهاتووە سەرۆکی خێڵ خۆێ پێش هەموان خیانەت لە خێڵەکەی خۆی دەکات. ئێستا ئێمە لەبارودۆخێکی گەلێ سەختداین.*

*** باسی یەکبوونی نێوان دوو حزبی پارتی ویەکێتیت کرد. پێتوایە دەبێ ئەم دوو حزبە یەکبن، نەک هەر یەک بگرن، بەڵکو یەکبن؟ لەمانەوە من وا تێگەیشتم کە جەنابت لەو تێڕوانینەوە باسی دەکەی کە کۆمەڵی کوردەواری بەو سادەییەی کە هەیەتی تواناى فرەحزبی و فرەرایی نیەبۆیە پێویستە یەک حزبی هەبێ تایەک ناوەند هەبێ، دەکرێ پتر ئاگاداری لایەنی فکری و پراکتیکی ئەم رایەی جەنابت بین؟**

** ئەگەر حکومەتەکەت عادل بوو، وەزیرەکەت دز نەبوو، پۆلیسەکەت حەرامخۆر نەبوو، ئەوا ئەوسا تۆ دەتوانی لە رێی حکومەتێکی وەکو ئیمامی عومەر عەدالەت بنوێنی و لەدەوری ئەو عەدالەتە وردە وردە خەڵکەکە پێڕابگا .ئەگەر وڵاتانی

پەیوەندیدار و دوژمنەکان لێبگەڕێن و خۆ بەخۆ نەکەوینە شەڕ و ململانێوە، یەک حزبی بێت یان دوو حزبی فەرقی نییە ،گرنگ ئەوەیە کە تۆ حکومەتێکی عادلی زۆر رێکوپێکت هەبێ .تا ئەو دوو حزبە بەرامبەری یەک بە پرچەکی ولەسەرپێ بۆ شەڕکردن بمێننەوە ،ئەوا هەموو ساتێک ئەگەری ئەوە هەیە سەرلەنوێ لێکبدەنەوە.
من کە گووتم ئێوە دەبێ یەکبن، مەبەستم ئەوەیە کە دنیا ٥ دەقیقە نیە، هەزاران ناکۆکی و بیروڕای دژبەیەک هەنە ،گیروگرفتی سیاسەتی جیهانی و سەدان شتی دیکە هەیە.

لەراستیدا کێشەی کورد پێویستی بە توێژینەوەی زانستیانە هەیە وناکرێ هەروا بە سادەیی چاوی پێداخشێنرێ. من دژی شیوعییەت بوومە کە گوتویەتی ئەوی بڵێ کوردم سەری دەبڕم. لە دژی شیوعی بوومە کە راوەپێشمەرگەی کردووە.ئەوەی من بۆ شیوعی بە پەرۆشم لە دڵی خۆمدایە، کە چ خەسارەتێکی گەورەیان لە خۆیان و لە کورد داوە. زێدەڕۆیی نیە لە قسەکانم جارەها من تێفکریوم لە کۆتاییدا کە لە دژی شیوعیەت دەنووسم، کاتێ ئێمەو خۆیان دۆڕاندوە ئەوان خۆیان دۆڕاندووە هەزارەهایان مردن و کوژران، هەزارەها یەخەی کوردیان گرت ، نەیاندەهێشت جوڵە بکەین، ئەوەی لە کیس خۆیان و لە کیس ئێمە چووە ،شتێکە یەکجار لەولای تەحەمولی کوردەوەیە.

*** ئەگەر بێینە بەرەکەی دیکە، واتا بەری دژی شیوعی کەوا سەرمایەداری کوردە، تۆ بیمەنی پاشکەوتوویی لە سەرمایەداری کورد، لە بۆرژووازی کوردا چۆن دەبینی؟ زۆر بەلامەوە گرنگە بەراوردێک لەنێوان پێش راپەڕین و دوای راپەڕین بکرێ. ئێمە لەدوای راپەڕین هەندێ داودەزگامان بۆ مابوو، بەلام هەمووی تالان کران و ئاودیوکران و بردرا بۆ ولاتانی دیکە. پێمەوایە ئەمە دوورە لە سیفاتی بۆرژوازی نیشتمانی یان دەوڵەمەندی نیشتمان پەروەر کە دەیەوێ ولاتەکەی خۆی دەوڵەمەند بێ، کەچی دەوڵەمەندی کورد ئەو تاوانەی کرد. چۆنی هەڵدەسەنگێنی ؟**

** من لەبەرامبەر ئەو دۆخەدا گووتومە، چەند سەیرە مرۆڤێک بێ خانوەکەی خۆی هەڵوەشێنێ، ئەمەی جەنابت باسی دەکەی وەک ئەوە وایەکە مرۆڤی کورد بێت خانوی خۆی هەڵوەشێنێ.

دەڵێن بەنداوی بێخمە بەملیاری لێ خەرج کراوە، بەچەند ملیۆنێکی ناقابڵ دەفرۆشرا. ئەمە شتێکە کە *وەرشکەستی شارستانیەت و تەنانەت وەرشکەستی سیاسی* دەگەیەنێ.

*** لەسەر ئەوەی جەنابت بەوەرشکەست بوونی سیاسی ناوی دەبەی، ئەو کات، بەرەی کوردستانیش کەمێک شەرعیەتی بەم شتەدا ، حزبەکان هەموو بەشداربوون لەو بڕیارەی بەرەدا بۆ ئاودیوکردنی سامانی ولات.**

** بڵێم چی؟ نەدەبوایە وابێ. لەگەڵ رێزم بۆ هەموویان کە ئەوەیان کرد. من گووتومە ئەو بارودۆخەی کە ئێستا سیاسەتی کوردی عێراقی تێدایە، زۆر ئاڵۆزو تێکهەڵکێشە، زۆر فرە دەرگایە. جا ئەو هەناسەی ئەفکاری ئەوروپایی کەدێ زۆر غەریب تێکەڵ بەو تەخەلوفی شارستانی و بەو هەموو دواکەوتوویەی کە هەیە ، دەبێ ،ئەوە جۆرە لێڵیەک دروست دەکا. گووتومەئەگەر بێتو من بە سکرتێری یەک لە دوو حزبانە دابنێن ،سەرەڕای ئەوەی کە چاوم لە ماڵی دنیا نیە و خۆشم بەمرۆڤێکی

واقیـع بین دەزانم، بەڵام دیسـانیش ناتوانم مـانـگێک دەوام بکەم، یان دەکـوژرێم یان دەبێ دەست لەکـار بکێشـمـەوە. ئاشکرایەئێسـتـا حـزبیـەکان وەک مـن راشکاوانە قسەناکەن، بەڵام مـن دەیڵێم؛ بارودۆخـەکە هێندە ئاڵۆزە کە من زۆر جـار بەزەیم بە سەرکردەکاندا دێتەوە.

*** بارزانی لە سەشـتەکاندا کۆتایی بەم دوویەرەکییە هێناو بزووتنەوەی سیاسی کوردستـانی یەکخست،یەک دەنگ و یەک رایی هێنایەدی، پاشان لە کوردستـاندا دوای دوو دەیە، ئێستا کاتێ لە بزووتنەوەی سیاسیدا مناقەشە دەکرێ،خەڵک هەست بەو بۆشـاییـە دەکا کـە بـارزانی بەجـێی هێـشـت. من مـەبەسـتم ئەو لایـەنـەیەتی کـە جەنابت باسی یەکبوون دەکەی لەبزووتنەوەی سیاسیدا یەک فەرمانڕەوایی زانا کە بە عـومـەری کـوڕی خـەتابت چواند. هەست دەکـەی ئەمـە ئێسـتـا چەند پێـویسـتی بەژیاندنەوەی ئەو کەلەپورە هەیە کە مەلا مستەفا بەجێی هێشتووە بۆ یەک خستنی بزووتنەوەکە و پڕکـردنەوەی ئەم بـۆشاییە کە لە رووی فکریەوە کورد ناتوانێ کامل بێ.**

** پرسیارەکەت خۆشە، بەڵام وەک بڵێی واقعی نیە.جارێ ژیاندنەوەی مەلا مستەفا مەحاڵە. کاکە من کوڕی مەلای گەورەم، بەڵام وەک ئەو مەلا نیم. مەلا مستەفا زیندوو نابێتەوە، ئەگەر زیندووش ببێتەوە ــ لەگەڵ هەموو ئیحترامم بۆ گەورەیی، چونکە دەزانم لە کوردستان پێشتر سەرکردەیێکی وانەبووە، بەڵام هەر لەزەمانی خۆیدا لێی هەڵگەڕانەوە، برایم ئەحمەد لە (٦٤)ەوە دەستی کرد بە براکوژی ،دواتر یەک دوو جاری دیکە شەڕ لەگەڵ مەلا مستەفا کرا ـ بارودۆخ جودایە لەگەڵ ئەو سەردەمەی کە ئەو تێیدا ژیاوە.

*** دێینە سەر باسی ئازادی کە نزیکە لە مەسەلەی دیموکراسی و جەنابت مناقەشەت کرد. بەو کۆمەڵە تایبەتمەندییانەی کە ئێستا مناقەشەت کرد، پێتوایە چەند بوار بۆ ئازادی فـردی هـەیە لە ناو کـۆمـەڵی ئێـمـەدا تا بتـوانێ بەشێـوەیەکی رێکوپێک بەشداری لەو بنیادنانە فکری و ئیداریە بکات کە جەنابت بەبیرتدا دێ؟**

** **ئـەو**کەسەی کە دەیەوێ لە کردەوەو بیروڕادا ئازاد بێ، ئەوا بێدەسەڵاتە، خۆشت دەزانی هەتا ئێستا داکۆکی لەخۆی نەکردووەو رەنگە نەشکا. ئەو کەسەی کە سوود لە ئازادی وەردەگرێ، بەبەردەوامی دەکەوێتە بەرامبەر ئەو لایەنەی کە ئازادیەکە لەو و لەدەسـەڵاتی ئەو کـەم دەکـاتـەوە و ئەویش پـتـر شـەڕت لەگـەڵ دەکـا وبەشـەڕیش بەرەورووی دیموکراتییەت دەبێتەوە.

*** مەبەستت لایەنی دەسەڵاتدارە؟**

** ئەولایەی حـەقـەکـە بۆ ئەو خـۆشـە ،یەکجـار زەعیـفـە و هیچ دەسـەڵاتی نیـەو بەتەمـاش نیـە دەسـەڵات بگـرێتـە دەست و بە تەمـاش نیـە تورە بێ و هەڵگرێتـەوە. لایەکەی دیکەش ــ کە من لەم قسەیەیەمدا مەبەستم کەسێکی دیاریکراو نیە ــ، بەڵام خـۆت دەزانی ئەوەی دەسـەڵاتی بەدەسـتـەوەیە سـوود لەخـێـر و بێـرەکـانی وەردەگرێ، واتا بۆ بەرژەوەندی خۆی نکۆڵی لە راستییەکان دەکات و چاوپۆشیش لە زۆر شـتی نارەوا دەکـا. ئەو هاوکـێـشـەیەی تۆ دەتـەوێ پێک بێت، سـاڵـەهای سـاڵی گـەرەکـە و وابە ئاسـانی نایێتـەدی. وەکـو گـووتم ئەگـەر سـەرۆکـەکـانی سـەرێ وەکـو عـومـەری خـەتاب نەبن، خۆ لەبیر نەکەن بە رۆحێکی وەکو کاکە ئەحمەدی شێخ ،زۆر

زۆر زەحمەتە بارودۆخی ئێستاکە بگەیێننە حاڵێک دیموکراتیەت بەخۆیەوە بگرێ .

*** ئەوەی کەمن تێبگەم، تۆ پێتوایە لە رووی تاکەکەسیشەوە، مرۆڤی کورد ئەو ئامادەییەی نیە وەکو مرۆڤێک مومارەسەی ئازادی خۆی بکات؟**

****** ئەگەر حەز لەقسەی خۆش بکەی دەتوانین بڵێین کوردەکە هەروا پێک هاتووە، با راستگۆ بین، دەزانی بەشێکی زۆر زۆری لەو کوردانەی کە پێیان بگووترێ رۆشنبیر، شیاویوون پێیان بگووترێ هەڵگری بیری دیموکراتیەت، ئەوانە هەموویان رۆیشتن بۆ خارج. بە زۆری کۆچیان کرد. ئەوەی دەمێنێتەوە بەشێکی لەگەڵ دەسەڵات دایە، کەئەویش بۆخۆی ناتوانێ دژی خۆی بێ. بەشێکیشی دانیشتووە لەماڵی خۆی ئەگەر مامۆستایەک یان شتێکە. *نازانم کەس هەیە لە دەرەوەی دەسەڵات وەک رۆشنبیر مابێتەوە؟* جا لێرەدا تەنیا ئومێدێک کە هەبێ ئەوەیە کە لایەنەکان پتر لێک نزیک بنەوە.

*** بەنیسبەت هۆکارەکانی پاشکەوتن کە لە کۆمەڵی کورددا هەیە، لە پاراستنی پاشکەوتوویەکە هەندێکیان ناوخۆیین و هەندێک لەوانەیە دەرەکی بن، کام لایان زاڵە هۆکاری دەرەکی یا ناوخۆیی؟**

****** هەردووکیان کارلێک دەکەن تۆ پاشکەوتنەکەت هەندێکی بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە بەعومری خۆت حکومەتت نەبووە. هەڵبەت کە حکومەتت نەبووە پاشکەوتووی، ئەوی لەسەریشەوە حکومەتە هەر بەپاشکەوتووت دادەنێ، ئەگەر بواری هەبێ هەلابەهەلات دەکات .لەبەر ئەوەهەردوو فاکتەرەکە پێکەوە دەڕۆن، تا ئەو رۆژەی کورد نەگا بە سەربەخۆیی هیچی واناکرێ ،واتا ئەوەی کە دەبێتە حکومەت بەپەرۆش بێ ئەو خەڵکە پێبگەێنێ.

*** بەگشتی مامۆستا من وایتێگەیشتم هەندێ جار پێم جیا ناکرێتەوە کامیانی؛ رەشبین یان گەشبین، واقیعبینی جەنابت بەلای کامیاندایە.**

****** ئەوەی من دەیڵێم قەت رەشبینی نیە. باوەڕ بکە، واقعیەتێکە کە هیچ ئەلتەرناتیڤێکی بۆ شک نابەم.

*** باشە لەواقیع بینی دا هیچ ئاستەنگێکی بێ ئەلتەرناتیف هەیە؟**

****** قوربان تۆ ناتوانی دوا لەمن بکەی کوردستان لەسەر شانم دانێم. من وەکو واقعبین کە هاتووم بۆ نموونە رەخنە لە شوعیەت دەگرم ،یان وەختی خۆی رەخنەم لە رەوتی مارکسی ناو پارتی دەگرت ، بەدرێژایی ئەو چەند ساڵە لە (٦١)ەوە کە دەکاتە (٣٦) ساڵ پێشتریش نوسینم هەبووە-من بەرژەوەندی خۆم لەبیر کردووە، من خاوەنی فلسێک نیم، هەرچی موڵکی هەمبوو بە پێی یاسای حکومەتی عێراق و یاسای حکومەتی هەرێم، رۆیی. موچەیەکی خانەنشینم هەیە بە ٣ مانگ بایی پێنج نەفەر کەبابە. ئەمە داهاتی منە لە بەغدا. لەسەر ساجی عەلی چەندی توانیبێتم لەمێشکی خۆم گوشیوەو کردوومەتە نووسین ، چەندەی ئیمکانم بووبێ لەگەڵ ئەوانەی خاوەن ران و حورمەتێکیشم دەگرن و ئەوی توانیبێتم لەقسەی چاکە کردوومە.

*** پرسـیـارەکـە بەرەو رووی جـەنابـت ناکـرێ وەکـو خـاوەن دەسـەڵاتێک، بەڵام وەکـو خاوەن دەسەڵاتێکی فیکری جەنابت موناقەشە دەکرێی؟**

** قوربان تێدەگەم، ئەوە من فکرەکەی خۆم 36 ساڵە بڵاو دەکەمەوە.

*** ئەم واقیـعبینەی ئێسـتـا گوێمـان لێی بوو زۆربەی تراژیدیا و کـارەسـاتەکە باس دەکا، باشە بۆ دەرچوون لەم کارەساتە پێویستە چی بکرێ.**

** نووسـینەکـانم بخـوێنەوە، بزانە رەخنە لە چی دەگرن؟باخـەڵکەکە بـەقسـەم بکا، ئێـسـتـا هـەر دەبێ ئـەو شـتـانە دووبـارە بکەمـەوە. من ٣٦ سـاڵە تێـدەکـۆشـم بەو دەسەڵاتەی خۆم دەسەڵاتم بەسەریدا بێ.

*** مـامۆستا ئەوەی بەلامـانەوە گرنگ بوو لەگەڵ جـەنابت مـوناقەشـەیمان کرد، ئەگەر شتێک ماوە پێتوایە بواری گوتنیمان پێت نەداوە و پێویستە کە بگوترێ، فەرموو؟**

** یەک شت هەیە باسـمان نەکرد کە دەڵێی لە دژی شیـوعی بوویتە، من هەرگیز لە دژی هیچ مرۆڤێک نیم بەقەدەر ئەوەی کە بەدکاری دەکا ،من لەدژی هەرمرۆڤێکم کە بەدکـاربێ، جـا ئایدیۆلۆژیای دژی کـوردایەتی بێ ، دژی مـرۆڤـایەتـی بێ، یان دژی عـەدالەت بێت. هـەڵبـەتە من لەسنوری خـۆمـدا دوژمنی ئـەوم بەبێ ئەوەی دەمـانچـەم هـەبێ. ئەم قـسـەیەش رەنگە نەخـتـێ کـاڵ بێ، من بۆ *شـیـوعی کـریاوم* ، *شـیـوعیم لە بەندیخـانە دەرهـێناوە، من شـیـوعیم گـەڕاندۆتەوە بـۆ سـەرکـار، من بە ئـۆتۆمـۆبێلی وەزارەت شیوعیم گەیاندۆتە ئەو جێگایەی کە تێیدا ئاسودەیە*، واتا قـەت پێت وانەبێ کەمن لە رووی مرۆییەوە دژایەتی کەسم کردبێ.

*** وەکو تاکـە کـەسێک پێمـوایە ئەگەر جـەنابت لـەبەرەیەکی فـیکریدا بـوویی کـە بەو پەڕی ئازادی و جـورئەتەوە رای خـۆت دەربڕیوە ئەم رایەش بەشـێـوەیـەکی ئیـجـابی کـاریگەریی بە سەر فـیکری مرۆڤی کوردیدا هـەبووە . مـەبەستم لە مـوناقەشـەکە تەنیا لایەنە فـیکریـەکە بوو. زۆر سـوپاسی جـەنابت دەکـەم کە رێت پێدام ئەم مـوناقشـەیە بکەین .دڵنیـام جێی سـەرنجی خـەڵکە بەتایبـەتی دوای راپەڕین رۆشنبـیرانی گـەورەی وەکو جەنابت لەو ناوچەی ئێمە کاریگەریان بە ئاسانی نەگەیشتۆتە خەڵک.**

** زۆ سـوپاس ئیـنشـائەڵلا لـە ئایندەدا لە بـارێکی خـۆشـتـر و بەرەو گـەشـایی تر جارێکی دیکە یەکدی دەبینینەوە.

# باسکردنی ڕۆڵی ڕۆشنبیرانی کورد لەکاری سیاسیدا*

## فەرهاد شاکەلی

[سەرۆ قادر: نووسین و هەڵوێست و بیروڕاکانی مامۆستا فەرهاد شاکەلی بەشێکن لە نووسین و هەڵوێست و بیروڕاکانی نێو بزووتنەوەی شۆڕشگێڕی لە کوردستاندا . بەڕێزی یەکێکە لەو ناوانەی کە لە نێوئەدەبی بەرهنگاری و ئەدەبی شۆڕشگێری گەلەکەماندا، هەموو خوێنەر و ڕۆشنبیران دەیناسن. لەلایەکی دیکەوە مامۆستا فەرهاد شاکەلی یەکێکە لەو نووسەر و ڕۆشنبیرانەی کە پتر لە(٢٠) ساڵە لە ئەوروپا دەژییەت، بەڵام توانیویەتی حزور و بوونێکی بەردەوامی لە نێو ڕۆشنبیری کوردیدا هەبێ کە ئەوە بایەخ و تایبەتمەندییەکی یەکجار زۆری بۆ فەرهەنگ لە کوردستاندا ،هەیە.چونکە هەروەکو هەموو لایەکتان ئاگادارن ئێستا پێشکەوتنی فەرهەنگ (ڕۆشنبیریی) لە کوردستاندا بەبێ بەشداریی ئەو بەشە فراوانەی گەلەکەمان کە پێی دەگوترێ جالیەی کورد و لە ئەوروپا و وڵاتانی دیکەدا دەژین، مەیسەر نابێ.

لایەنێکی دیکەی زۆر گرنگ کە پێموایە زۆر جار باسی لێوە کراوە و ڕای ئیجابیشی لە سەر هەبووە ،ئەوەیە کەوا پێویستە بۆ پێشخستنی ڕۆشنبیریی کوردی، لە نێوان ئێرە(کوردستان) و ئەوروپا(دنیای پێشکەوتوو کە بەشێکی زۆری ڕۆشنبیرانی کوردی تێدادەژین )پردێکی زۆر پتەو هەبێ. ئەو کەشوهەوایەی کە لەوێ هەیە توانایەکی زۆر بەڕۆشنبیری کورد دەدا تا بتوانێ بە شێوەیەکی سەربەخۆ و ئازادانە بیربکاتەوە و بەشێکی زۆر لەو کەلەبەرە پڕبکاتەوە کە لێرە لەناوخۆی وڵاتدا هەیە. چونکە لەبەر هەر هۆ یان فاکتەرێک کە ببێ ،ڕەنگبێ ڕۆشنبیری کورد نەتوانێ لێرە لە نێوخۆی وڵاتدا بەو شێوە ڕێکوپێکە بیر بکاتەوە. کاتێ کە گەمارۆیەکی گەورەمان لەسەرە بەتایبەت لەو ڕووەوە کە ڕۆشنبیری کورد ناتوانێ بگاتە دنیا و گەمارۆی دووەمیش بە هەمان شێوە کە بەرهەمی ڕۆشنبیری لە دنیادا ناگا بەئێمە و ئەم قەتیسمانەی ڕۆشنبیرانی کورد لەنێو وڵاتدا بەدڵنیاییەوە دابڕانێک درووست دەکات.

لە هەمانکاتدا ئەوەی بەلای منەوە گرنگە ئەوەیە کە کاک فەرهاد شاکەلی یەکێکە لەو ئەزموونە ڕۆشنبیریانەی دەرەوەی وڵات کە توانیویەتی بێلایەنی وبوێری و سەربەخۆیی خۆی لە بیرکردنەوەدا بپارێزێ و لەدەستیان نەدات. بەداخەوە

ژمـارەیەکی زۆر لە رۆشنبـیـرانی کـورد کـاتێ دەگـەنە دەرەوە، رەنگبێ ئەو ئەرکە نیشتمانییەی کە لێرە لێیان چارەڕێ دەکرێ، بەجێنەگەیەنن.

فەرهاد شـاکەلی، یەکێکە لەو کەسـانەی کە لەنێـودڵی ئەوروپاشـدا توانیویەتی وەکو کـوردێکی سـادە و زۆر لەخـۆبـووردوو لەژیانی تایبـەتی خـۆیدا، بمێنێـتـەوە و لە هەمانکاتیشدا سوودی لەو تواناییانەی کە لە رووی زمان و فەرهەنگ لە ئەورووپا هەن، وەرگرتووە.

بۆ ئێمە کە لەنێوخۆی وڵاتداین، گەڕانەوەی رۆشنبیران بۆ خستنەڕووی بیروڕای خـۆیان، گـرنگیـیـەکی تـایبـەتی هـەیە، تەنانـەت ئەگـەر ئەو رۆشـنبـیـرانە بـتـوانن گفتـوگۆیەکی زۆر سـادەش دروست بکەن، بەڵام بە شـێوەیەک کە ئەم گفـتـوگۆیە سادەیە پەیوەندی بەوەوە هەبێ کە ئێمە چۆن دەمـانەوێ فەرهەنگی وڵاتەکەی خۆمان بژاربکەین و چۆن دەمـانەوێ رۆڵی رۆشنبیـرانی کورد لە بنیـادنانەوەی کوردسـتـان و لە درووسـتکردنی ئەو ئەزموونەی کـەوا ئێسـتا لەپێشمـانە بۆ بەڕێوەبردنی خۆمـان لە وڵاتەکەماندا و بۆ کامڵکردنی پرۆسـەی دیموکراسـی لە کوردستاندا دیاری بکەین ـــ چونکە گومـان لەوەدانییە کە بەبێ بوونی رۆشنبیـران ناکرێ چاوەڕێی هاتنەکایەی سیستەمێکی دیموکرات بین و ئەگەر دەسەڵاتی سیاسی چاودێرێکی بەسەرەوە هەبێ ئەوا ئەو چاودێرە رۆشنبیرانن ].

*فەرهاد شاکەلی:*

سەرەتا لە وشەی (ئینتەللەکتوێل) کە ئەڵبەتە بە ئینگلیزی(Intellectual)ی

پێدەڵێن دەست پێدەکـەم، کـە واتاکـەی لە کـوردیدا دەکـاتە (رووناکـبـیـر) جگە لە ( Intellectual) تێـرمـێکی (زاراوەیەکی) دیکەش هەیە بە ئینگلیـزی ئەویش (Intelligentil)ە کە هەردووکیـان لە رووی پێناسـەی (Lexical) فـەرهەنگییـەوە جیـاوازییەکی ئەوتۆیان نیە، بەڵام رەنگە شوێنی بەکارهێنانیـان کەمێک جیا بێ، یان مـەبەست لەوەی کـە (Intellectual)و(Intelligentia) چیـە، لەو رووەوە هـەندێ جیـاوازی هەبێت. ئەوەیان کە جیـاوازییـەکە چیەو چـۆنە زۆری لەسـەر ناڕۆین، بەڵام پێـم وایـە (Intelligentia) تا رادەیەکی زۆر پەیوەندی بە رووناکـبیـرانی روسیـاوە هەیە و لە سەردەمێکدا وەک گروپیـان چینێکی بە ژمارهاتوون. ئەڵبەتە لای فەڕەنسی و ئینگلیـزەکانیش بەکـارهێندراوە، بەڵام ئێستـا لەم سـەردەمەی ئێمـەدا ئەوەندەی من ئاگـام لە زمـانی ئینگلیـزی هەیە،(کە هـێندە ئاگـام لە زمـانی رووسـی نیـە) لەزمـانی ئینگلیــزی دا(Intellectual) بووە بە وشـەی بەرامبـەری ئەوەی کە ئەمڕۆ ئێمـە پێیدەڵێین (رووناکبیر)یان بە گوتەی هەندێ کـەس(رۆشنبیر)و شێوەیەکی ستاندارادی وەرگرتووە.

«رووناکبیـرانی کورد لە ناو هـەموو رووناکبیـرانی رۆژهەڵاتی ناوەڕاسـتدا، کەمترین کەسێکن کەقاوقیژ دەکەن» مەبەستم لەو مـەسـەلەیە ئەوەیە کە کەمترین کەسێکن دەنگیـان دەبیسـترێ (دەنگی رووناکبیـرانی دیکەی میـللەتانی رۆژهەڵاتی ناوەڕاست رەنگە تا رادەیەک ببیستـرێ، بەڵام دەنگی رووناکبیـرانی کورد نابیسترێ) ئەڵبەتە ئەگەر باسی کەسێک بکەین بەوەی کە بڵێین (دەنگی نابیسـترێ)یان(بێ دەنگە) بە

دوو شێوە لێک دەدرێتەوە یەکەمیان ئەوەیە کە ئەگەر باوکێک بەم سیفەتانە باسی کوڕەکەی خۆی بکات ئەوا ئەمە نیشانەی باشیەو واتا کوڕەکەی زۆر بە ئەدەبە، بەڵام لە لێکدانەوەی دووەمدا بۆ ڕووناکبیرێک ئەمە سیفەتێکی باش نیە کە بێدەنگ بێت. بێدەنگ بوون و دەنگ کزبوون و دەنگ نەبیستراني ڕووناکبیر بە هیچ جۆرێک دیاردەیەکی باش و (پۆزەتیف) ئیجابی نیە.

باسکردنی ڕووناکبیر بەسیفەتی(بێدەنگ) هەروەک گوتم ڕەنگ بێ سیفەتێکی (نیگەتیڤ) بێت، چونکە لە دنیــــای ئەمــــڕۆدا ئامــــادە بوون، هەبوون یان(Representation) نوێنەرایەتی کردن بۆ ڕووناکبیر شتێکی گرنگە. واتە لە نێو هاوکێشە سیاسی و ڕووناکبیرییەکانی دنیای ئەمڕۆدا، بوون و ئامادەبوونی ڕووناکبیری هەر میللەتێک و نەتەوەیەک مەسەلەیەکی ژیارییەو پەیوەندی بە ژیان و مردنی ئەو نەتەوەیەوە هەیە.

بێگومان مەسەلەی دیاربوون و دیارنەبوون یان لەبەرچاوبوون و نوێنەرایەتی کرانی ڕووناکبیرانی نەتەوەیەک یان گەلێک، لەسەر ئاستی جیهانی، مەسەلەیەکە کە لەگەڵ سیاسەت و لەگەڵ تەرازوو و پارسەنگی هێزی سیاسیدا بەتەواوی تێکەڵاو و تێکچڕژاوە. واتا ئێمە ناتوانین مەسەلەی (Representation) نوێنەرایەتی کران یان بوونی ڕووناکبیر لە مەسەلەی سیاسی یان هێزی سیاسی، یان پارسەنگی هێزە سیاسیەکان جیا بکەینەوە. دیارە کە یەکسەر گوتمان لە سیاسەت جیا ناکرێتەوە ئەوا پرسیارێک دێتە پێشەوەو ئەویش ئەوەیە کە **ئایا سیاسەت کاری ڕووناکبیرە؟ ئایا پێویستە ڕووناکبیر بۆ دەرخستن و سەلماندنی خۆی سیاسەت بکات؟** ئەمەش وا دەکات کە ئێمە لەسەرەتادا بگەینە ئەو دووڕیانەی کە هەم باسەکەی من پەیوەندی پێوە هەیەو هەمیش هەموو ئەو باسانەی کە لەبارەی ڕووناکبیری و دەسەڵات و سیاسەتەوە دەکرێ، پەیوەندییەکی ڕاستەوخۆیان پێوەیە، پرسیارە کە زۆر ئاشکرایە، **ئایا ڕووناکبیر سیاسەت دەکات یان نایکات؟ ئایا دەبێ سیاسەت بکات یان نەیکات؟**

**ئەگەر نەیکرد بۆ نەیکات؟ واتا ئەگەر سیاسەتی نەکرد بۆ دەبێ نەیکات و ئەگەر کردی بۆ دەبێ بیکات؟** ئەمانە لەو مەسەلە گرنگانەن کە دەبێ لێیان بکۆڵدرێتەوە.(فاکتۆر)یان هۆکارێکی گرنگ لەم هاوکێشەیەدا، مەسەلەی (Mass media) یان دەزگای ڕاگەیاندنەکە دیارە لە وەرگێڕاوە عەرەبیەکەی(وسائل الاعلام) ڕاهاتووە، بەڵام زاراوەی(Mass media) بە تەواوی ئەم مانایە ناگەیەنێ و مانایەکی دیکەی هەیەو فارس پێی دەڵێ (رسانەهای گروهی) ڕەنگە هێشتا ئەمەیان ڕێک وپێکتربێت. مەسەلەکە مەسەلەی پەیوەندی نێوان ڕووناکبیرو(Mass mme-dia)، یان دەزگاکانی ڕاگەیاندنە. چونکە دەزگاکانی ڕاگەیاندن ڕۆڵێکی یەکجار گەورەیان لە گەیاندنی دەنگ و ڕەنگ و بیروباوەڕ و هەڵوێستی ڕووناکبیردا بە خەڵک هەیە و ئەمەش گەیاندنی پەیامی ڕووناکبیرە بە خەڵک، بەڵام **ئایا ڕووناکبیر دەتوانێ بەراستی بێ ئەوەی گوێبداتە هۆکاری سیاسی پەیامی ڕووناکبیرانەی خۆی بگەیەنێتە خەڵکی؟** ئەمەش یەکێکە لەو پرسیارە هەرە سەختانەی کە وەڵامدانەوەی ئاسان نیەو تەنانەت لێکۆڵینەوە لەبارەشیەوە ئاسان نیە.

لەسەرەتادا گوتم پەیوەندی ڕووناکبیرو سیاسەت یەکێکە لە پەیوەندییە هەرە ئاڵۆزەکان و بەراستیش ئەمە یەکێکە لەو بەرانەی کە پێم وانیە هیچ سەختیەک بۆ

رووناکبیر هێندە زەحمەت بێت «ئەوەی کە من باسی لێدەکەم وەک **(رووناکبیر)**، مەبەستم **رووناکبیری راستەقینەیە** و باسی **(زۆرە رووناکبیر)** ناکەم و لێرەشدا مەبەستم کەسێکی دیاریکراو نیە، بەلاّم لە راستیدا هەروەک چۆن لەناو زۆربواری دیکەدا شتی **(زۆر)** یان نارەسەن هەیە ئاوهاش لە ناو رووناکبیراندا، رووناکبیری راستەقینەو هی ناراستەقینەش هەیە». ئەگەر ئێمە لە گۆشە نیگایەکی مێژووییەوە تەماشا بکەین ئەوا دیاردەیەکی زۆر سەیر دەبینین کە ئەویش ئەوەیە لێرەدا رووناکبیر(دیارە مەبەستم رووناکبیری کوردەو جاروبار هێندەی پەیوەندی بە چەمکی رووناکبیری بەگشتی هەبێت ئەوا ئەوکاتە باس لە هی گشتی دەکەم ئەگەر نا بەتایبەتی من باسی رووناکبیری کورد دەکەم)، کاتێ لەرووی مێژووییەوە لە رووناکبیری کورد بکۆلدرێتەوە ئەوا دەردەکەوێ کە بەشدارییەکی زۆر چالاکانەی لە سیاسەتی کورد دا، کردووە. رووناکبیری کورد لە پێناو ئەو ئامانجەیدا کە خۆی باوەڕی پێی هەبووە، لەنێو ئەو هێزو پارت و گروپانەی سەرگۆڕەپانی کوردستاندا، کاری کردووە. هەر رووناکبیری کوردیش بووە کە بە پلەیەکی گەورەو نالێم بەپلەی یەکەم، بەلاّم بەرادەیەکی زۆر هێزی سیاسی(حزبە سیاسیەکانی) گەیاندۆتە دەسەلاّت، واتا گرتنە دەستی دەسەلاّت لەلایەن پارتە سیاسیەکانەوە لە مێژووی کورد دا (کە دەڵێم مێژووی کوردیش مەبەستم تەنیا ئەمڕۆ نیەو باس لە درێژایی مێژووی کورد دەکەم) لەسایەی رۆڵی رووناکبیرانەوە بووە.

دیارە مەبەستیشم لە گرتنە دەستی دەسەلاّت لەلایەن هێزە سیاسیەکانەوە بە مانای دەوڵەت یان حکومەت نییە و بگرە ئەوەی هاتۆتەکایەوە جۆرێک بووە لەدەسەلاّت و نزیک لەدەسەلاّت، چونکە کورد هەموو دەمێک دەوڵەت وئیدارەی نەبووە، بەلاّم بەردەوام شێوەیەک لە دەسەلاّتی بەدەستەوە بووە.

لە بەرانبەر ئەم کارەی رووناکبیر بۆ هێزی سیاسی ئەنجامی داوە ئاخۆ دەبێ چ پاداشت و خەلاّتێکی بەنسیب بوو بێ؟ زۆر بەڕاشکاوی و بەبێ جیاوازی دەتوانم بڵێم هەمیشە ناشوکری و ناسوپاس گوزاری بووەو لێرەشدا من مەبەستم ئەوە نیە کە تەنیا لایەنە نیگەتیڤەکە بخەمە روو، بگرە هێزی سیاسی تا ئەو دەمەی کە گەیشتۆتە دەسەلاّت پێویستی بە رووناکبیر بووەو کاتێ کە جڵەوی دەسەلاّتی گرتۆتە دەست ئەوا رووناکبیری لە بیرچۆتەوە. بۆ ئەوەی باسەکەمان رێکوپێکتر بێت و بتوانین لە یەکدی تێبگەین واتا ئێوە لە مەبەستی من بگەن و منیش لەوە تێبگەم کە ئێوە چۆنی وەردەگرن، پێویستە پێناسەی(Intellectual) رووناکبیر بکەین کە شتێکی گرنگە.

بۆ پێناسەکردنی رووناکبیر کۆمەڵێ زاراوە (Term) هەن، بەلاّم ئەو زاراوانەی کە بۆ پێناسەکردنی رووناکبیر بەکاردێن لە هی زانستەکانی دیکە کەمترە هەرچەندە هەموو ئەو پێناسانە زۆر لە یەکترییەوە نزیکن. واتا هەموو ئەو پێناسانەی کە من بۆ رووناکبیر خوێندوومنەتەوەو بیستوومن کاتێ دەگاتە بواری مەفهومی گشتی رووناکبیر ئەوا لە یەکدی نزیک دەکەونەوە. کەچی کاتێ دێینە سەر وردکردنەوە (Details)ی مەسەلەکان دەبینین ئەو پێوەرەی کە بۆ دیاریکردنی رووناکبیر یان ناڕووناکبیر بەکار دێت و لە هەمان کاتیشدا لێکیان جیا دەکاتەوە. ئەوا لە میللەتێکەوە بۆ شارستانیەتێکی دیکەو لە کۆمەڵگایەکەوە بۆ کۆمەڵگایەکی دیکە گۆڕانی بەسەردا دێت. واتا پێوەرەکانی دیاریکردنی ئەوەی کە کێ رووناکبیرە، کێ

دەتوانێ رووناکبیر بێت و کێ دەبێ رووناکبیر بێت، دەگۆڕێن و لەم پێناسانەدا جیاوازییەکی ئاشکراو بەرچاو هەیە.

هەموو ئەوەیش کە پەیوەندی بە خودی رووناکبیری کورد و پێناسەکەیەوە هەیە، ئەویش پێناسەیەکی نەگۆڕینە، چونکە ئەگەر لەرووی مێژوویییەوە سەیری بکەین ئەوا دەبینین ئەو پێناسەیەی کە بۆ رووناکبیری کورد دانراوەو ئەو پێوەرەی کە رووناکبیری کوردی پێ پێوراوە لە قۆناغەکانی ژیانی کورد دا گۆڕانی بەسەردا هاتووەو بە واتایەکی دیکە لەسەردەمێکدا یەکێک بەپێی هەندێ پێناسەو پێوەر بە رووناکبیر دانراوە، بەڵام دواترو لەسەردەمێکی دیکەدا ئەو پێناسەو پێوەرانە هەڵوەشاونەتەوەو پێوەرو پێناسەی دیکە جێیان گرتوونەتەوە.

ئەگەر دووبارە لەرووی مێژووییەوە تەماشا بکەین، ئەو زاراوەی کە بۆ نێوهێنانی رووناکبیر بەکار هاتووە تا ساڵانی (١٩٢٠)یش وشەی (مونەووەر) بووە. واتا بە رووناکبیر دەگوترا (مونەووەر)، دیارە مونەووەریش ئەو(Term) زاراوە گشتییە بوو کە لە ئیمپراتۆرییەتی عوسمانیدا نەک هەر بە تەنیا لەلایەن کوردەوەو بگرە لەلایەن میللەتانی دیکەشەوە بەکار هاتووە، واتا خەڵک بە خوێندەوارو رووناکبیریان گوتووە مونەووەر کە بەمانای (مثقف)ی عەرەبی و (رۆشنبیری) ئێستای کورد بەکار دەهێندرێت و مەبەستم ئەوەیەکە (Term) زاراوەیەکی گشتی بووەو کوردیش وەک میللەتانی دیکە وشەی (مونەووەر)ی بەکار هێناوە.

پێناسەی کۆنی (مونەووەر)یان ئەو کەسانەی کە بە مونەووەر لە قەڵەم دراون بە گوێرەی ئەو کۆمەڵە تێکستەی کە من خوێندوومەتەوە چ تێکستی سەربە کورد بێت یان تێکستی سەربە خەڵکی دیکەی نێو ئیمپراتۆرییەتی عوسمانی، بەر لە هەمووان (مەلایەکان)، فەقێیەکان(دیارە ئەو فەقێیانەی لە خوێندنی باڵادا بوون نەک ئەو فەقێیانەی تازە دەستیان بە خوێندنی ئایینی کردبوو)، شێخەخوێندەوارەکان، سۆفیەکان و دەرەبەگەکان پێیان گوتراوە مونەووەر یان (رووناکبیر)و ئەم پێناسەیە تا ساڵانی ١٩٢٠ یان کۆتایی سەدەی نۆزدەهەم درێژەی هەبووەو رووناکبیر ئەم کەسانەی گرتۆتەوە کە مەلاو سۆفی و شێخ و دەرەبەگ بوونە. لە ناو ئەو کەسانەشدا جارویار گروپێکی بچوک نەک زۆر گەورە، لەو کەسانەی کە لە خوێندنگەی بەناو مۆدێرنی عوسمانیدا خوێندبوویان، هەبوو. ئەمانە کەسانێک بوون کە سەربەم چین وتوێژانەی پێشوو نەبوون، بەڵام لە مەکتەبی تازەو خوێندنگە عوسمانیەکاندا خوێند بوویان(بە تایبەتیش لای خۆمان رەنگبێ هەندێ ناوی وەک (روشدییە)یان شتی لەو بابەتە هەبووبێ) و لە دەزگای کارگێڕی عوسمانیدا یان بەتایبەتی لە لەشکەری عوسمانیدا کاریان کردووەو پلەی سەربازییان هەبووە. ئەمانەیش هەر رووناکبیر لە قەڵەم دراون و بەتەنیا چین وتوێژەکانی پێشوو رووناکبیر نەبوونەو ئەوانەش بەشێک بوون لە رووناکبیرانی ئەودەم.

دووبارە هەر سەبارەت بە (مونەووەرە)، کورد هەر لەسەرەتای ئەم سەدەیەوە یان باشتر وایە بڵێین هەر لە کۆتایی سەدەی رابردووەوە هەندی (Term) زاراوەی بۆ خۆ دروست کردووە. دوو لەو زاراوانە سەرنجی منیان راکێشاوە کە زۆر سەیر و لەهەمان کاتیشدا زۆر لێکدی نزیکن، یەکێکیان ئەو زاراوەیەیە کە لە رۆژنامەی کوردستاندا، میقداد میدحەت بەدرخان بەکاری هێناوەو پێی دەڵێ (خوەندا)و ئەم

زاراوەی لەبری رووناکبیر بەکارهێناوە کە بە خوێندنەوەی تێکستەکە بۆت دەردەکەوێ کەوا مەبەستی لەبەکارهێنانی ئەم زاراوەیە (رووناکبیر) بووە.

پیرەمێردیش(حاجی تۆفیق بەگی پیرەمێرد)، لەژمارە(٣)ی ئازاری ١٩٤٣دا، وشەی (خوێندەوار)ی بەکارهێناوە ئاشکرایە کە(خوەندای) کرمانجی و (خوێندەواری) کوردی (کرمانجی) خواروو هەردووکیان بەمانای (Educated)یان (Literate)ی ئینگلیزی دێن، واتا ئەو کەسەی لە قوتابخانە خوێندوویەتی و ئەمەش بۆ مانای راستەقینەی رووناکبیر بەکار نایەت، بەلآم ئەوان ئەو زاراوانە یان بەکارهێناوە.

لە سەرەتای سەدەی بیستەمدا دەبینین کۆمەڵێک رووناکبیری کورد لە ئەستەمبوڵن و لە پێناو مەسەلەی نەتەوەکەیاندا خەباتی سیاسی دەکەن، بەلآم ئەمانە هەر چەندە گروپ و رێکخراوی سیاسیشیان دروست کردبێ دیسان لەپاڵ ئەوانەدا کتێب و گۆڤاری کوردیشیان بلآوکردۆتەوە.

ئەمانەی دوای گەڕانەوەیان بۆ کوردستانی خواروو کە زۆربەیان خەڵکی ئەم بەشەی کوردستان بوون، رۆڵێکی چالاکانەیان لە نێو حکومەتی شێخ مەحمودی نەمردا بینی و هەندێکشیان لەچوارچێوەی حکومەتە عێراقیەکەدا رۆڵیان بینی کە هەر لەو سەردەمەدا دروست ببوو. نموونە زۆرەو پێویست بەناوهێنییان ناکاو مەبەستمان ئەو چەند رووناکبیرەیەکە لە سالآنی ١٩٢٠ بۆ ١٩٢٥ گەڕانەوە کوردستان و بەشدارییان لە حکومەتی شێخ مەحمود کرد، یان وەکو تۆفیق وەهبی و ئەمین زەکی بەگ کە بەشدارییان لە حکومەتی عێراقیدا کرد.

وێنەی رووناکبیری کورد فرەلایەنەیە کە لەم سی چل ساڵەی رابردوودا بە خۆیەوە گرتووەو ئەمەش پەیوەندییەکی راستەوخۆی بەوەوە هەیە کەوا ژمارەی رووناکبیران زیادی کردووە. بۆ نموونە لەسەرەتای ئەم سەدەیەو تا سالآنی ١٩٢٠ ژمارەی رووناکبیران زۆر کەم بووە، بەلآم بە تایبەتی لەم سی چل ساڵەی رابردوودا، ژمارەی رووناکبیری کورد یەکجار زیادی کردووەو ئەمەیش جۆرە پێناسەیەکی دیکەی رووناکبیری دەوێ و من هەر پێناسە کۆنەکەی رووناکبیر وەرناگرم و پێناسەیەکی دیکەی رووناکبیر دەخەمە روو. ئەوەی لەپێشدا باسمان کرد هۆکارێکی ئەو فرەلایەنیە بووە و هۆیەکەی دیکەش دەگەڕێتەوە بۆ بوونی ئەو رێکخراوو حزب و پارتە سیاسیانەی کە بەشدارییان لە خەباتی رزگاریخوازانەی گەلی کورد دا کردووەو ئەم دوو هۆکارە وایان کردووە کە چەمکی رووناکبیر لەم سی چل ساڵەی دواییدا گۆڕانی بەسەردا بێت.(فاکتۆر)یان هۆکاری سیاسی یاخود گرووپە سیاسیەکان هەلومەرجێکی زۆر تێکچڕژاو و ئاڵۆزی رەخساندووە بەوەی کە ئەم هێزە سیاسیانە لە راستیدا لەسەرەتادا هێزی ئۆپۆزیسیۆن یان بەرهەڵستکاری سیاسین، بەلآم دوای ماوەیەک لە سروشتی بەرهەڵستکارییەوە دەگۆڕێن بۆ هێزی خاوەن دەسەلآت و ئەم گۆڕانەش لە خۆیدا کاریگەرییەکی زۆری کردۆتە سەر رووناکبیرو پێناسەی رووناکبیرە هەروەک لە پێشتریشدا گوتم هێزە سیاسیەکانن کە لەپێشتردا بەرهەڵستکاریان ئۆپۆزیسیۆنن و خەڵکی بە خەباتکارو جەنگاوەری سیاسییان دادەنێ، هەرکەبوونە حکومەت(مەبەستم ئەم پێنج شەش ساڵەی دواییە کە لە کوردستانی عێراقداو پێشتر حکومەت نەبووە) دەبن بە خاوەنی پۆلیس و دامودەزگای ئیداری و...هتد و هەر حزبەش بەندیخانەی خۆی پەیدا دەبێ و ئەوەش

دیاردەیەکی تازەیە لە سیاسەتی کوردا. لەبەر ئەوە بۆ پێناسەی رووناکبیری ئێستا دەتوانین چی بڵێین؟ رووناکبیر بەگشتی مەبەست لە رووناکبیرو ئەوەی کە خەڵک بەوە ناوی دەبەن، ئەوانەن کە نووسەر، شاعیر،(دیارە لەلای ئێمە جیاوازییەک خراوەتە نێوان شاعیرو نووسەرەوە)، رۆژنامەنووس و خەڵکی ئەکادیمین.

ئەوەم گوت بۆ ئەوەی وەک(Criteria) یان پێوەرێکی گشتی بێت بۆ ئەوەی کە ئێمە بتوانین بیر لە رووناکبیر بکەینەوەو لەناو کۆمەڵگای کوردوارییەوە پێناسەی رووناکبیری پێ بکەین. تێگەیشتن لە رووناکبیریان دانانی پێوەر بۆ ئەوەی کێ بە رووناکبیر دابنێین یان کێ بە رووناکبیر دانەنێین ناکرێ بە هیچ شێوەیەک لەو نرخ و چەمکانەی کە لەناو کۆمەڵگای کوردەواریدا سەردەستن، دوور بخرێتەوە، واتا ناکرێ دوور لەم چەمکانە بیر لە رووناکبیری کورد بکرێتەوەو دەبێ بە لەبەرچاوگرتنی ئەم چەمک و نەریتە ئەخلاقی و رووحیانەی کە لەناو کۆمەڵگای کوردەواریدا هەن باس لە رووناکبیر بکەین. دیارە ئەمانەش بەشێکیان دەبنە هۆی سنوردانان بۆ ئەوەی کە بزانین کێ رووناکبیرە، هەروەها هاتنی شێوە دیتنی ئەوروپایی و رۆژئاواییانە بۆ ناو کورد، ئەویش بۆ خۆ رۆڵی لەمەدا بینیوە کە کێ بە رووناکبیر دادەندرێت.

شتێک کە زۆر سەرنجی منی راکێشاوە ئەوەیە کە لەناو ئەو رووناکبیرانەدا، ئەو کەسانەی کە خوێندنی تەقلیدی یان خوێندنی مزگەوتیان خوێندووە بە رووناکبیر ناژمێردرێن و ئەمەش بەلای منەوە زۆر سەیرەو لەکاتی ئامادەکردنی ئەم باسەدا زۆر بیرم لێ کردۆتەوەو زۆریش سەرنجی راکێشاوم.

نەک هەر ئەمانەو بگرە ئەوانەی کە لە مەکتەبی(ناسێکولار) یان ناعیلمانیدا خوێندوویانە بە رووناکبیر ناژمێردرێن و ناخرێنە چوارچێوەی رووناکبیرەوە، ئێستا لەم پێناسەیەی کە ئەمڕۆ بۆ رووناکبیر دەکرێ نە مەلا و نە شێخ و نە سۆفی هەر چەند خوێندەواریش بن بە رووناکبیر ناژمێردرێن، مەگەر ئەوەی لەو چوارچێوە ئایینیەی خۆیان دوور بکەونەوەو تەنانەت لەرووی جل وبەرگیشەوە بگۆڕێن ئەوجا بە رووناکبیر دەژمێردرێن.

ئەوە زۆر سەرنجی منی راکێشاوەو بۆ ئەوەش نموونەمان هەیەو بە بەڵگەوە باسی لێدەکەم، ئەمانە واتا شێخ و مەلاو سۆفی وەختێک بە رووناکبیر دەژمێردرێن کە مۆرکی ئایینی و نەریتە تایبەتیەکانیان لێ دابماڵدرێ و دەبێ بەشداری لە خەباتێکی سێکولار دا بکەن جا چ خەباتی سیاسی بێت یان فەرهەنگی، ئەگەر لەمانەدا بەشدارییان کرد بە رووناکبیر دەژمێردرێن.

ئەو نموونانەش کە هێناومنەتەوە هەموویان باک گراوندێکی ئایینیان هەیە. مامۆستا هەژار، مامۆستا هێمن، جگەر خوێن، مامۆستا جەمیل رۆژبەیانی و مامۆستا مەلا مجەمەدی مەلا کەریم، هەر پێنجیان لە مەکتەب و مزگەوت خوێندوویانەو ماوەیەکیش مەلایەتی و فەقێیاتیان کردووە، بەڵام لەبەر ئەوەی لەکەش وهەوای خۆیان دابڕاون و بە هەموو شێوەیەک لێ دوور کەوتوونەتەوەو دەستیان بە خەباتێکی سێکولاری سیاسی و فەرهەنگی کردووە بە رووناکبیر لە قەڵەم دراون.

تاقە رێزپەڕێک کە بەردەوام بووە لەسەر مەلایەتی خۆی و بە رووناکبیریش ژمێردراوە، مامۆستا عەلادین سەججادییە. هەروەک هەموومان دەزانین سەججادی یەکێکە لە رووناکبیرە هەرە گەورەکانی ئەم سەدەیەی ئێمە و بێ ئەوەی لە مەلایەتی

دابـبـرِیٚ (پێم وابێ تا ئـەو ڕۆژەی کـە مـردیش هـەر ئیـمـام بوو) بە ڕووناکـبـیـر دەژمێردرێت. ئەگینا هیچ کام لە ڕووناکبیرانی کورد بە ڕووناکبیر نەژمێردراون تا ئەودەمەی کە ئەو مەرجانەیان تێدا بەدی کرابێ کە خەباتێکی سێکولاری سیاسی و فـەرهـەنگی و..هـتـد ئـەنجام بـدەن. لەناو ئەو ناوانە دادەبوو ناوێکی دیکەش بێنم کـە ئەویش مامۆستا محەمەد ئەمین بۆزئەرسەلانە لە کوردستانی سەروو کە مەلا بووەو مەلای دوازدە عیلم، بەڵام تا ئەودەمی کە مەلاو موفتی بووە کەس بە ڕووناکبیری نەزانیوە، ئێستا کە جلی غەیری مەلایەتی دەپۆشێ و وەک ئیمەمانان دەژی بە ڕووناکبیر دەژمێردرێت و ئەوەش شتێکی زۆر سەرنج ڕاکێشەلای نووسەرانی کوردو هەموو ئەوانەی کە باسی ڕووناکبیری دەکەن.

لێرەدا پرسیارێک دێتە پێشەوە، ئەوەیە دەکرێ مرۆڤ هەم ڕووناکبیربێت و لە هەمان کاتیشدا مەیلی بەلای ئایین دا هەبێت؟

ئەو نموونانەی پێشتر باسم لێوەکردن، وروژێنەری ئەم پرسیارەن چونکە کە تۆ ئەوانە بە ڕووناکـبـیـر نەزانی دەبێ پرسـیـار بکەین ئایا کـەسـێک هەرچەند خوێندەواربێت دەکرێ ڕووناکـبیری و ئایین بەیەکەوە کۆبکاتەوە، ئەوە یەکێک لەو مەسەلانەیە کە دەبێ گفتوگۆی لەسەر بکرێت. ئەڵبەتە لێرەدا مەبەستی من لە ئایین، ئایینی ئیسلامە چونکە لای کلتوری میللەتانی دیکە ئەو موشکیلەیە دروست نەبووەو تەنیا لە ناوچەی ئێمەدا ئەو گرفتەی لێیە کە ئەو خەڵکانەی کە نزیکن لە ئایین بە ڕووناکـبـیـر لە قـەڵەم نادرێن. بە واتایەکی دیکە مـەبەسـتم ئـەوەیەکە ئایا دەکرێ ڕووناکبیری و ئایین و مەیلی ئایینی کۆبکرێتەوە بەبێ ئەوەی ئەو کەسە ئەو مەترسی و ریسکەی بکەوێتە سەر کە خەڵک لێی تێ نەگات و بە جیدی وەری نەگرن؟

ئەمـە دیارە ئەنجامـێکە کـە پێـی دەڵێن(Westernization) واتا تەغـەروب یان غەربییەت یان پەیدابوونی عەقل و مەفاهیم و چەمکی غەربی لە ناوکۆمەڵگای ئێمەدا. دیارە ئـەو چەمکانەی کـە لە ڕۆژئـاواوە هـاتوونـەتە نێـو ئـێـمـە وەکـو چەمکی ڕووت هـاتوون ئـەگـینا هـیچ بناغـەیەکی نـە ئابـوری و نە زانسـتـی و نە تـەکنۆلۆژی لە کوردستاندا نیە.

مـەبەستم لەوەش ئەوەیە کە کۆمەڵگای کوردی ئەو کۆمەڵگایە نیە کە لە پێودانگەی ئابوری، تەکنۆلۆژی و زانستیەوە وەکو ڕۆژئاوا خەڵکی سەربە ئایین یان دژ بە ئایین بخاتە نێو قاڵبی ئەوەی کە ڕووناکبیرەیان ڕووناکبیر نیە.

ئەو بایەخ و نرخە ڕووحیانەی کە لە کۆمەڵگای جیاوازدا هەیە، لە هەندێ بارودۆخی تایبەتیدا، گۆڕینیان زۆر ئاسان نیەو ناکرێ بە ئاسانی جێ پێیان لەق بکرێ. بۆ نموونە ڕووناکبیرێکی کورد ناتوانێ ئەو نرخە مۆراڵیە(ئەخلاقیە) بنەڕەتیانەی کە لایەنی جیاوازی نێو کۆمەڵگای کوردیی پێ کۆدەبنەوە، پشتگوێ بخات ، دەبێ بەبایەخەوە لێیان بڕوانێ و دەبێ بیر لەوە بکاتەوە کە ئەو نرخانە چین بۆ ئەوەی بتوانێ وەک ڕووناکبیرێک بەردەوام بێت.دیارە ئەگەر لە کۆمەڵگای کورەواریدا یەکێک هاوجنس باز(Homosexual)، بێت زۆر زەحمەتە بە ڕووناکبیر لە قەڵەم بدرێت ــ دیارە لەمـەشـدا مـەبەسـتم لەو کـەسـەیە کـە بە ئاشکرا هاوجنس باز بێت و ڕووناکـبـیـریش بێت ــ لە ڕۆژئاوا زۆر بەئاسـانی مـرۆڤ دەتوان هـاوکـات هـەم ڕووناکـبـیـرێکی گـەورە و هـەمـیش چالاکـتـرین هاوجنس باز بێت. بێگومـان لەنێـو

ڕووناکبیرانی ئێمەشدا هەن کە هاوجنس بازن، بەڵام بەدزییەوە. واتا هەردوو شتەکە( ڕووناکبیری و هاوجنس بازی)یان لە یەک کاتدا بۆ کۆنەکراوەتەوە وئەمەش ئەوە دەگەیەنێ کە لە کۆمەڵگای کوردیدا ڕێگە نادرێت کەوا کەسێکی ڕووناکبیر هاوکات هاوجنس بارێکی بەئاشکراش بێت.

بەکورتی ڕووناکبیر ناتوانێ ئەو نەریت و بەها ئەخلاقی و کۆمەڵایەتییانەی کە لە کۆمەڵگادا هەن، پشتگوێ بخات و ئەمانە دەبنە سنوورێک بۆ ناساندنی ڕووناکبیر. لێرەدا بەمەبەستی نیشاندانی ئەو جیاوازییەی کە لەنێوان کۆمەڵگای کورد و ڕۆژئاوا و ئەو جیاوازییەی کە لەتێڕوانینی مرۆڤی کورد و ڕۆژئاوایی بۆ چەمکی ڕووناکبیر، هەنە نمونەیەک دەهێنمەوە:

زۆر ڕوناکبیری گەورەی ئەورووپا هەن کە بەئاشکرا ـ چ ئێستا و چ لە ڕابردوودا ـ هاوجنس باز بوونە.دیارە ئەمەش لە ئەورووپاش مێژوویەکی دوورودرێژی نییە و دەگەڕێتەوە بۆ سەرەتای ئەم سەدەیە. ئۆسکار وایلد، ڕووناکبیرێکی گەورەی بەریتانیا بووە و بەئاشکراش هاوجنس باز بووە،بەڵام لە هەمانکاتدا لە سەر ئەوە تووشی گیروگرفت و زیندانی کران بووە لە ڕابردوودا و لە سەرەتادا کەس وەکو نووسەر یان ڕووناکبیر حیسابی بۆ نەکردووە، بەڵام دواتر ئەم بەهایانە گۆڕان و ئێستا یادی(١٠٠) ساڵەی مردنی دەکەنەوە و بەڕێزەوە ناوی دێنن و ئۆسکار وایڵدیش ببوو بە یەکێک لە هەرە کەسایەتییە گرنگەکانی فەرهەنگ و کلتوری ئەورووپا.نمونەیەکی دیکە لەسەر هاوجنس باز بوونی ڕۆشنبیر، ئاندرێ ژیدی فەڕەنسییە کە خەڵاتی نۆبڵی ساڵی١٩٤٧ی وەرگرتووەو بە ئاشکراش هاوجنس باز بوو.

دیارە ئەخلاقی کەسی پێوەرێکی گرنگە بۆ ڕۆشنبیری کورد، بەڵام بۆ میللەتانی دیکە ئەوە هێندە گرنگ نیە دیارە ئەو جیاوازییەش باسم لێوە کرد ئەوەیەکە لە کۆمەڵگای کوردەواری کە لە کۆمەڵە نرخ و بەهایەکی ئەخلاقی و ڕووحییەوە سەرچاوەی گرتووە ناکرێ بیرلەوە بکرێتەوە کە کەسێکی ڕووناکبیر بە ئاشکرا هاوجنس بازبێت، بەڵام سەیرەکە لەوەدایە کە کۆمەڵگای کوردەواری ئەوە قەبوڵ دەکات کە ڕووناکبیرێک خوێن ڕێژ و پیاو کوژبێت. واتا جیاوازییەکە لێرەوە دەست پێدەکات کە بە گوێرەی نەریت و ئەونرخانەی کە لە کۆمەڵگای ئێمەدا سەردەستەن ڕووناکبیرێکی کورد بەهۆی بەرپرسیاریەتی و ئەو بەشدارییە ئایدۆلۆژی و فاناتیکیە کوێرکوێرانەی کە لەگەڵ حزبەکەیدا دەبکات، دەتوانێ بەشداری خەباتی سیاسی و چەکداری بکات و لەسەردەمێکدا ناچارە خوێن بڕێژێت، پیاو بکوژێت. لێرەدا مەبەستم لە خوێن ڕشتن و پیاوکوشتن، خوێنڕشتن و پیاوکوشتنی دژمن نیەو مەبەستم خوێنڕشتنی خۆبەخۆ کوردییە. لەمبارەیەوە نموونەی زۆرمان هەیەو پێم وابێ پێویست ناکا ناوی کەس بێنم و مەبەستیشم هیچ هێزێکی سیاسیش نیە، بەڵام دەزانم ڕوناکبیری واش هەیە.

جیاوازییەکە لێرەوە دەست پێدەکات ئەو کەسەی کە خوێن ڕێژو پیاوکوژە لەهەمان کاتدا نوسەرو شاعیرو ڕووناکبیرێکی باشەو لەناو کوردا وەردەگیرێ سەرەڕای ئەوەی کە هەموو کوردێک دەزانێ فلانکەس پیاوکوژ و خوێنڕێژە، مرۆڤێکە کە خەڵکی کوشتووەو دەستی بە خوێنی خەڵک سوورە. ئەمە بەعەیب وەناگیردرێت، بەڵام ڕووناکبیرێکی هاوتای ئەو ئەگەر هاوجنس بازبێت بە ڕووناکبیر لە قەڵەم نادرێت چونکە نەریتە ئەخلاقی و ڕوحیەکانی کۆمەڵگای بەزاندووە.

ئەوە تەنیا وەک وێنە دەهێنمەوە بە بێ ئەوەی من هەڵویستی خۆم سەبارەت بەم مەسەلەیە دەربڕیبێت.

بەشێکی دیکە کە پەیوەندی بە باسەکەمەوە هەیە بریتییە لەباک گراوندیان پاشخانی مێژوویی ڕووناکبیر.

ئەگەر لە مێژووی ۲۰۰ تا ۳۰۰ ساڵی ڕابردووی کورد ورد ببینەوە ئەوا دەبینین ئێمە چەند ڕووناکبیرێکمان هەیەکە بەسەر مێژووی فیکری و سیاسی ئێمەوە دیارە. یەکەمین ڕووناکبیرێک کە سەرنج ڕادەکێشێ، ئەحمەدی خانیە (۱۷۰۵-۱٦٥۱).

ئەحمەدی خانی نەک هەر ڕووناکبیرێکی گەورەیە بەڵکو بەشێوەیەکی سیاسیش بیردەکاتەوە، بەداخەوە هەرچەندە ئێستا بەیتەکەیم لەبیر نیە، بەڵام پێی وایە کە کورد دەبێ خاوەنی کتێب و مەعریفەت بێت و وەکو ڕووناکبیرێک بیر لەو مەسەلەیە دەکاتەوە. ئەو هیواو ئامانجانەی کە خانی هەیەتی زۆر لە هیواو ئامانجەکانی میللەتەکەوە نزیکن و لە مونتەڵەقی میللەتەکەی خۆیەوە بۆشتەکان دەچێت. خانی ڕووناکبیرێکی فرەلایەنەیەو شارەزاییەکی باشی لە زانستەکانی سەردەمی خۆی هەیەو لەهەمان کاتدا پەیوەندی لەگەڵ ئەمارەتی بۆتاندا هەبووە کە پەیوەندییەکی سیاسیەو بە پەیوەندی لەگەڵ دەسەلاتی سیاسیدا لەقەڵەم دەدرێت، بەڵام هەرگیز ئەو پەیوەندییەی پەیوەندییەکی خۆش و باش و دۆستانە نەبووە. واتا لەلایەک ڕەخنەی لێ دەگرێ و لەلایەکی دیکە لەبەر کورد بوونی شانازیشی پێوە دەکات. لێرەدا خانی هەڵوێستێکی دوو لایەنەی هەیە.

خانی لە ڕووی گەشەکردنی فکری ناسیۆنالیزمی کوردییەوە کاریگەرییەتیەکی مەزنی هەیەو بەبێ هیچ دوو دڵی و گومانێکەوە دەتوانین خانی بە باوکی ناسیۆنالیزمی کوردی لەقەڵەم بدەین. ئەم چەمکی ناسیۆنالیزمەی کوردم لەو کتێبەدا کە خۆم بە ئینگلیزی بەناونیشانی (Kurdish Nationalism in Mamuzin)وە نووسیومە خستۆتە بەر باس و گفتوگۆکە ناسیۆنالیزمی کوردی چۆن لەسەر دەستی خانیەوە داکەوتووە، بەڵام دیارە ئەوروپییەکان بە هیچ جۆرێک ئەم مەفهومەی ئێمەیان قەبوڵ نیە. من موناقەشەیەکی زۆرم لەگەڵ(مارتین ڤان برونەسن)ی هۆڵەندیدا هەیە کە کوردۆلۆژیکەو ماوەی (۲٥) ساڵ دەبێ ئاشنایەتیم لەگەڵیدا هەیەو ئەو پێی وایە کە بیرکردنەوەی کوردی سەبارەت بەو ناسیۆنالیزمەی خانی هەڵەیەو خانی پێی خۆشە پاشایەک هەبێت و وڵاتەکەی یەکبخات کە لەوەشدا مەبەستی کورد نیەو وەک کابرایەکی عەشیرەیی بیر لەو باسە دەکاتەوە. بەهەرحاڵ ئەوە مەفهومی ئەوروپییەکانەو من هیچ هیوایەکم بەوە نیە کە دەبێ لەگەڵ کوردناسە ئەوروپییەکاندا ڕێککەوین چونکە من دەزانم ئەوان چۆن بیردەکەنەوە.

خەلیفەیان جێگرەوەی خانی، حاجی قادری کۆییە کە دیسان هەر لەسەر بیروباوەڕەکانی خانی بەردەوام بووەو گەشەی بەوبیروباوەڕانە کردووەو مەفاهیمی نوێی تایبەت بە خۆی خستوونەتە سەر. بەلای کەمەوە حاجی قادر (۳۰) ساڵی کۆتایی تەمەنی خۆی لە ئەستەمبوڵ ژیاوە (ئەوەندەی من لە ژیانی تێگەیشتبم)و پەیوەندییەکی زۆری لەگەڵ بنەماڵەی بەدرخانییەکاندا هەبووە کە لە بنەڕەتدا میری بۆتانن و هەر لە ڕێگەی ئەوانیشەوە بووە ئاشنای لەگەڵ عەدەبیاتی خانیدا پەیدا کردووە. هەر ئەمەیش بۆتە هۆی ئەوەی کە بیری نەتەوەیەتی لای حاجی قادری کۆیی

پەیدا ببێت. من لە شارێکدا قسە دەکەم کە پیاوێکی وەکو مامۆستا (مەسعود محەمەد) کۆمەڵی شتی لەسەر حاجی قادر نووسیووە و من هەرچیەک بڵێم قەت ناگاتە پەراوێزی قسەکانی بەرێزیان، بەلاّم ئەویش جەختی لەسەر ئەوە کردووە کە حاجی قادر بەرلەوەی لە کوردستان دەرچێت ئەو چەمک و بیرکردنەوانەی نەبووەو دواتر لە ئەستەمبوڵ پەیدای کردوون و ئەوەش دیارە لە رێگەی بنەماڵەی بەدرخانیەکان و ناسینی خانیەوە بووە.

حاجی قادری کۆیی جەخت لەسەر ئەوە دەکات کە بۆ ئەوەی کورد بتوانێ وڵاتەکەی خۆی واتا کوردستان رزگار بکات دەبێ لە رووی سەربازییەوە ئامادە بن و خۆیان پڕچەک و تفاق بکەن و بخوێنن. ئەوە ئەو مەرجانەن کە حاجی قادر بۆ رزگاریی کوردستان دیناون واتا رێکخستنی، شەڕی چەکدارانەو زانیاری. هەروەک دەڵێ(ئەسبابی شەڕ پەیدا بکەن تۆپ و تفەنگ و هاوەن)

لە جێگەی دیکەشدا باس لەوە دەکات کە پێویستە میللەتان کتێب و رۆژنامەو..هتد، هەبێ و پێویست بەوە ناکا نموونەی لێ بێنینەوەو پێم وابێ زۆربەتان ئاگاداریتان سەبارەت بە حاجی قادری کۆیی و چەمکەکانی هەیە.

خاڵێکی دیکە کە گرنگەو پێویستە لێرەدا باس بکرێت ئەوەیە کە پێم وابێ لەرووی زەمەنیەوە دەکەوێتە پێش حاجی قادر، بەلاّم لەبەر ئەوەی جیاوازی لەگەڵ هێڵی حاجی قادر و خانی دا هەیە بە جیا باسی دەکەم و ئەویش گەڕانەوەی حەزرەتی مەولانا خالیدی نەقشەبەندییە بۆ کوردستان. مەولانا خالید لە ١٧٧٩ لەدایک بووەو لە ١٨٢٧ وەفاتی کردووە. گەڕانەوەی مەولانا خالید بۆ کوردستان و دامەزراندنی تەریقەتی نەقشەبەندی موجەدیدی کە دوایی لقی خالیدیشی لێ بۆوە واتا ئەو لقەی کە مەولانا خالید خۆی لە کوردستان دایمەزراندو ناویان نا (خالیدییە)، (کە سێ لقی هەیە (موجەدیدیە)،(نەقشەبەندی)و(خالیدییە) ئەویش یان باشتروایە بڵێین مەولانا خالیدو تەریقەتەکەی کاریگەرییەتیەکی یەکجار گەورەی رووناکبیرانەی بەسەر کۆمەڵی کوردەواریدا هەبووە. ئەو چەمکانەی کە مەولانا خالید هێنانی و ئەو کاریگەرییەتیە سیاسیەی کە مەولانا خالید لە رۆژهەلاّتی ناوەڕاست و تەنانەت لە دەرەوەی رۆژهەلاّتی ناوەڕاستیش هەیبوو، ئەوەندە گەورەیە کە دەبێ بەتایبەتی باسی لێوە بکرێت نەک بەم شێوە سەر پێییە، بەلاّم من تەنیا وەک نموونە دەیهێنمەوە.

ئەگەر سەیرێکی شۆڕشەکانی کورد بکەین دەبینین لە بەشە جۆربەجۆرەکانی کوردستاندا، سێ لە گەورەترین ئەو شۆڕش و راپەڕینە چەکداری و سیاسیانەی کە کورد کردوونی، سەرکردەکانیان سەربە تەریقەتی نەقشەبەندی خالیدی بوونەو ئەوانەش شێخ عوبەیدوڵڵای نەهری، شێخ سەعیدی پیران و بنەماڵەی مەلا مستەفای بارزانین کە هەر سێکیان سەربە تەریقەتی نەقشەبەندی و بەشە تەریقەتی (خالیدی)ن.

هەموو ئەوانە رۆڵێکی زۆر گەورەیان لە راپەڕین و بزووتنەوەی رزگاریخوازانەی کورد دا بینیوە. جگە لەمانەش لەبواری فەرهەنگی و رۆشنبیریشدا کەسانی سەربەم تەریقەتە رۆڵێکی گەورەیان هەبووە. خۆشبەختانە لەم رۆژانەدا کتێبێک بەناوی (Naqshbandis) نەقشەبەندییەکان بە ئینگلیزی بلاّوبۆتەوە کەمن تیایدا گوتارێکم لەبارەی بنەماڵەی (سیراجەدین)یەوە کە بە شێخە نەقشەبەندییەکانی

هەورامان ناسراون نووسیو، بەڵام هەر لەوێ بە دوورودرێژی باسم لە ڕۆڵی تەریقەتی نەقشـبەندی کردووە لە کوردسـتاندا و ئەوەندەی کە پەیوەندی بە ژیانی کلتوری و ڕۆشنبیرییەوە هەبێ خراوەتەڕوو و نموونەی زۆرشیم لەوبارەیەوە هێناوەتەوە.

دوای گەڕانەوەی مەولانا خالید ئەو کاردانەوە خێرایەی کە بەرچاوە ئەوەیە یەکسەر لە دوولاوە دەکەوێتە ناکۆکیەوە، لەلایەک لەگەڵ هەندێ لە میرەکانی باباندا(نەک لەگەڵ هەموویاندا)و بە تایبەتی لەگەڵ مەحمود پاشای باباندا کە بەینیان زۆر ناخۆش بووەو ئەو نێوان ناخۆشیەش ئۆباڵەکەی لە ئەستۆی مەحمود پاشا بووە و لەلایەکی دیکەشەوە لەگەڵ ڕێبەرانی تەریقەتی قادری دا کە لەوکاتەدا شێخ مارفی نۆدێی نوێنەری هەرەدیاری تەریقەتی قادری بووە.

بەرلەوەی کە مەولانا بگەڕێتەوە، تەریقەتی قادری لە کوردستاندا، تەریقەتێکی دامەزراو بووەو پێگەیەکی فراوانی لە کوردستاندا هەبووە.

بەدڵنیاییەوە گەڕانەوەی مەولانایەکی چالاک و پڕ لە هێزو جووڵە بووەتە مایەی مەترسی چ بۆ میرەکانی بابان و چ بۆ تەریقەتی قادری. لەبەر ئەوە دەتوانین لە پاشخان وزەوینەی ئەو ناکۆکیە تێبگەین.

شتێک لێرەدا، لەڕووی روناکبیرییەوە و ئەوەندەی کە پەیوەندی بە مەولانا خالیدەوە هەیە گرنگە ئەو موناقەشە ڕووناکبیرییەکە دروست بووە نەک ئەو موناقەشە شەخسیەی کە هەبووە لەنێوان ئەو و خەڵکی دیکە،یان شێخ مارفی نۆدێ دا. ئەگەر ژیاننامەی مەولانا خالید بخوێنینەوە(هەرچەندە من نەم ژماردووە)پێم وایە نزیکەی (٢٠) کتێب لەو سەردەمەدا نووسراون کە بەشی هەرە زۆریان کورد نووسیونی و هەر هەمووشیان گفتوگۆو موناقەشەن کەیان جوێن دانن بە مەولانا خالیدیان لە داکۆکیکردن لە مەولانا خالید دانووسراون.

(Debate) یان ئەو باسە فکرییانەی کە کراوە هۆکارەکەیان گەڕانەوەی مەولانا خالید بووە بۆ کوردستان و ئەمە لەڕووی فکرییەوە زۆر گرنگە کە کۆمەڵە باسێک بە شێوەی ڕووناکبیرانە موناقەشە بکرێن و دەست بۆ تفەنگ نەبردرێت و بە شێوەی گفتوگۆ نووسین بێت.

ئەمەش جێی سەرسوڕمانەکە بەر لە سەدو ئەوەندە ساڵە توانرابێ لە کوردستاندا موناقەشەیەکی فکری لە ڕێی نووسینەوە بکرێ، هەروەک دەزانین دوایی مەولانا خالید بوو بە هێزێکی گەورەو تەریقەتی نەقشەبەندی بوو بە گەورەترین پێگەو فراوانترین تەریقەتی کوردستان و بە کردەوە تەریقەتی قادری خستەلاوەو تەریقەتی نەقشەبەندی بوو بە تەریقەتی یەکەم لە کوردستاندا و ئێستاش هەر ئەو پێگەیەکی ماوە، بەڵام کاریگەرییەتی تەریقەتی نەقشەبەندی لە کوردستاندا بەتایبەت لەبواری کلتوریدا لەگەشت تەریقەتەکانی دیکە پترە کاریگەرییەتی مەولانا خالیدو تەریقەتی نەقشەبەندی کە من لێرەدا مەولانا خالید وەکو نموونەی ڕووناکبیرێکی ئایینی باس دەکەم و مەسەلە تەنیا تەریقەتەکەی نیەو لە چوارچێوەی باسی ڕووناکبیریدا باسی مەولانا خالیدیش دەکەم. تەریقەتی موجەدیدی، خالیدی و نەخشەبەندی کە مەولانا خالید هێنای کاریگەرییەتیەکەی تەنیا لە کوردستاندا نەمایەوە(کۆمەڵێ توێژینەوەی باش هەیە کە ڕەنگبێ پێویست بەوە نەکات کە بە دوورودرێژی لێیانەوە بدوێین. بەڵام باسی کاریگەرییەتی خەلیفەکانی مەولانا لە ئەندۆنسیا دەکات. لە ئەندۆنسیای

ئەمرۆدا كۆمەڵێ خەليفەی مەولانا خاليدی لێيە كە تا ئێستاش لە ژيانی سياسی و كلتوری ئەندۆنسييادا چالاكی دەنوێنن- لەباشووری ئەفريقيا كۆمەڵێ لە خەليفەكانی مەولانا خاليد هەن و ئێستاش چالاكن چ لە رووی سياسيەوە چ لەرووی كلتوريیەوە- لەداغستان پێم وابێ هەموومان ئەو شێخ شاميلە دەناسين كە رەسوڵ هەمزەتۆف لە كتێبەكەيدا باسی دەكات، ئەو كابرايە يەكێكە لە خەليفە راستەوخۆكانی مەولانا خاليد- لە چيچانی ئەمرۆ كە بەشێكی زۆری ئەو شەڕە رزگاريخوازييەی كە لەوێ دەكرێ پەيوەنديیەكی راستەوخۆی بە مەولانا خاليدو خەليفەكانی مولانا خاليدەوە هەيە- لە بۆسنەو هەرزەگۆڤينيا، من خۆم كۆمەڵێ خەليفەو موريدی نەقشەبەنديم بينيووە كە سەربە حەزرەتی شێخ عوسمانی نەقشەبەندی سيراجەدينی دووەم بوون و لەوێ لە سياسەتی وڵاتەكەی خۆشياندا بەشداری دەكەن) مەبەستم لەوە ئەوەيە كە كاريگەرييەتی مەولانا خاليد هەر لە كوردستاندا نەمايەوەو مەولانا خاليد بوو بە رێبەرێكی جيهانی و رێبەرێكی كورد كە كاريگەرييەتی بەسەر جيهانەوە بوو، بەڵام بەداخەوە ديارە كورد كەمتر ئاشنايەتی. رەنگە پێتان سەير بێت ئەگەر بڵێم لە ئەوروپا بەدەيان و سەدان توێژينەوەو لێكۆڵينەوەی قووڵ و بەپێز (ئەوەندەی من ئاگاداريم)بە ئينگليزی و لەسەر مەولانا خاليد نووسراوەو بەڵنيياييەوە ئێستا كە خۆشبەختانە پرۆفيسۆر حاميد ئالگەر كە خۆی ئينگليزەو خەڵكی خوارووی لەندەنەو بووەبە موسڵمان وپرۆفيسۆری رۆژهەڵاتی ناوەڕاستە لە زانكۆی بێركلی لە كاليفۆرنيا، كتێبێكی بەدەستەوەيە لەسەر ژيانی مەولانا خاليد و من خۆم پێرار لە ئەستەمبۆل بينيم و چەند رۆژێك بەيەكەوە بووين و رەنگبێ لەم چەند مانگانە يان لەم رۆژانەدا بڵاو بكرێتەوەو ديارە بەدڵنياييەوە وێنەيەكی باشتری مەولانا خاليد دەدا بە كورد. دەكرێ لەبارەی كاريگەرييەتی كلتوری مەولانا خاليد بەسەر كۆمەڵگای كورديیەوە چەند شتێك باس بكەين.

وەك دەزانين ئێمە سێ شاعيری گەورەی سۆفيمان هەيە(هەرچەند شاعيرمان زۆرە)، بەڵام من پێم وايە شاعيرە سۆفييەكان بە پلەی يەكەم ئەوانەی مەلای جەزيری، مەولەوی(سەيد عەبدولرەحيمی تاوەگۆزی)و (مەحوی)، دوو لەوانە سەربە مەولانا خاليد يان خەليفەكانی مەولانا خاليدن. هەردووكيان چ مەحوی و چ مەولەوی لەسەرەتادا خەليفەی شێخ سيراجەدينی يەكەم بوونە ديسان بە هۆی تەريقەتی نەقشەبەندييەوە،يان بەهۆی نزيك بوونيان لە خانەقای نەقشەبەنديیەكانەوە رۆڵێكی گەورەيان بينيووەو رووناكبيری گەورەشيان لێ دەرچووە.

هەر بۆ نموونە باسی مەلا حاميدی كاتب ١٨٠٢-١٨٩٢ دەكەين كە رووناكبيرێكی زۆر گەورەبووەو مەلای شێخ عوسمانی سيراجەدين بووەو بەشێك لەو كارە گرنگانەی كردوويەتی ئەوەيەكە شەرحێكی دوورودرێژی لەسەر (مثنوی و معنوی) جەلالەدينی رۆمی نووسيووە، هەروەها شەرحێكی لەسەر (گلشن راز)ی شێخ مەحمودی شەبستەری نووسيووە. كتێبێكی ديكەشی هەيە كە من خۆم ئەويانم بە دەسنووس هەيە بەناوی(رياض المشتاقين) كە ئەمە پتر بيوگرافيەكە لەبارەی شێخ سيراجەدين و مەولانا خاليدەوە.

ئينجا ديمەسەر كرۆكی باسەكە كە رەنگبێ لە هەمووی گرينگتر بێت و ئەويش ئەوەيە (Intelleckual)ی كورد يان رووناكبيری كورد لە ناو تۆرێكدايەو چۆن كەوتۆتە ناو ئەو تۆڕەوە. بەعادەت وايە لەلای ئێمە كاتێ باس لە رووناكبير دەكرێ

دەگــــــــوترێ(Conscience)یان ویژدانی مــــیللەت، دیارە ئەم ناوە بۆچی بــــــۆ(Intellectual) یان رووناکــبـیـردانراوە.چونکە وا چاوەڕوان دەکـرێت کـە رووناکبیر ویژدانی گەلەکەی بێت بۆیە ئەم ناوەی لێندراوە، ئایا رووناکبیر ئەم رۆڵە دەبینێ یان نا ئەوەیان مەسەلەیەکی دیکەیە، بەلام (رووناکبیـر )چاوەڕوان دەکرێت ئەو رۆڵە لە کۆمەڵگاکەی خۆیدا ببینێت.

ئەمەش دیارە پەیوەندی بەوەوە هەیە کەوا رووناکبیر لەگەڵ میللەتەکەی خۆیدا دەژیت و هەڵگری ئەو هیواو ئامـانجانەیەکـە لای میللـەتەکەی بە چاوی شـتێکی پیـرۆزەوە سـەیر دەکـرێن، بەلام کـاتێ کـە دەڵێن ویژدان دەبـێ جـۆرەکـانی ویژدان لـەبەر چاو بگرین و چەند جۆرێکی جیـاوازی ویژدان هەیە، ویژدان هەیە زینـدووە، ویژدان هەیە چالاکە، ویژدان هەیە ئازار دەچێژێ ئەوە تێرمی سـۆفیـەکـانە کـە ویژدان بێـدەنگ نابێت، ئەوەمـان بیـردەخـاتەوە کە بەشێکی لەئایەتێکی قورئانیدا هەیە و بەشـەکەی دیکەی لەناو تێرمی سۆفیەکاندا هەیە و ئەویش تێرمی (نفس)ە.

(نفس) لەلای سـۆفیـەکـان مـانـایەکی تایبـەتی هـەیەو ناتوانم پێناسـەی (نفس) بکەم، بەلام رەنگبێ پێناسـەیەکی سـۆفیـانەی بکرێ کە دەڵێن هەندێ شت بەزەوق دەکرێ نەک بەعـەقڵ و زەوق و عـەقڵ جیـاوازن و لەباسی (نفس)دا دەڵێن (٥-٦) پلەی نفس هەیە و نەفسی ئەمارە، نەفسی لەوامە، نەفسی موتمەئینە، نەفسی رازییە، و نەفسی مـەرزییە. ئەمـانە چەند پلەیەکی جیـاوازی نەفسن ئەڵبـەتە سێی دوایـیان لەئایەتێکی قورئاندا هەن کە دەڵێ (یا ایتـها النفس المطمئنه ارجـعی الیٰ ربک راضـیـه مرضیـه فـادخلی فـی عـبـادی وادخـلی جنتی)، بەلام نەفـسی ئەمـارە لەشـوێنی دیکەو لای سـۆفیـەکان باسی لێـوەکراوە. دەبێ ئەو بەراوردە لەگـەڵ رووناکبـیردابکرێ چونکە رووناکبیر (نفس) یان ویژدانی میللەتێکەو وەک گوتم ویژدانی زیندوو هەیە، ویژدانی چالاک (Activ)هەیە، ویژدانی ئازار چێژ، بەلام ویژدانی بێدەنگ نا. پێم وابێ لەبەر ئەو پلە جیاوازانەی ویژدان، ئەوەی کە جاران پێی دەگوترا ویژدانی میللەت، ئێستا کـراوە بە دەنگی مـیللەت، واتا ئەو پێناسـەیەی کـە (10-20) سـاڵ پێش ئێـسـتـا دەیانکردو دەیان گوت رووناکبیر ویژدانی میللەتە ئێستا بەشێوەیەکی دیکە تەعبیری لێ دەکرێ و دەگوترێ، رووناکبیـر دەنگی میللـەتەکەیەتی. دووبارە ئەوەیش کە دەڵێن (رووناکبیر دەنگی میللەتەکەیەتی) ئەو چاوەڕوانییە کە خەڵکی لەرووناکبیر هەیەتی، بــــەلام (contrast) یان ناکۆکیـە کە لێرەو دەست پێدەکات کە رووناکبیـر چۆن دەتوانێ دەنگ و ویژدانی میللەتەکەی بێت؟

و لەو کاتەدا دەبێ هەڵوێستی لەبەرامبەر سیاسەتدا چۆن بێ؟

(چونکە وەک دەزانین میللەت بەر لەهەموو شتێ چاوی لـەسیاسـەت و دەسـەلاتە) دەبێ رووناکبیر چی بکات بۆ ئەوەی بتوانێ دەنگی میللەتەکەی بێت؟

لەرابردوودا دەبینـین حـاجی قـادری کـۆیـی و ئەحـمـەدی خـانی دەنگی میللەتـەکـەیان، بوون بۆ نموونە خـانی مـەودای نێـوان خـۆی وەک شـاعـیـرێـک و مـیـری بۆتان وەک دەسـەلاتدارێـک دەبینـێ و باشـی تێـدەگـات. هەڵوێسـتی خـانی هـەڵوێسـتـێکی رەخنەگرانەیە، ئەگەرچی هەروەکو گوتم هەندێ جار رەخنەکەی نەرمە.

حـاجی قادر لەژێر دەسـەلاتێکی سـیـاسـیدا نەژیاوە رەنگە بەحوکمی ئەوەی کە خـۆی

خەڵكی بەشێكی كوردستان بووەو لەبەشێكی دیكەی كوردستاندا ژیاوە، راستەوخۆ رووبەڕووی دەسەڵاتی سیاسی نەبۆتەوە. رەنگە ئەوكاتەی كە لە كوردستانی عێراق بووە رووبەڕووی نوێنەرانی دەسەڵات (ئاغاكان وشێخەكان)، نەك دەسەڵاتی راستەقینە، بوویێتەوە، بەڵام لەو (٣٠) ساڵەی دوایی تەمەنی كە لە ئەستەمبوڵ ژیاوە رووبەڕووی دەسەڵات نەبۆتەوە یەكجار نەبێ كە باسی میرێكی كورد (یەزدان شێر) دەكات. ئەویش بەو شێوەی دەڵێت بیستوومە كە میرێكی كورد ماوە بەنێوی (ئەو ناوەكەی راستەوخۆ نایەنێ) یەزدان شێر و ئەگەر كورد هیوایەكی مابێت، ئەگەر شتێك بۆ كورد بكرێت ئەوا یەزدان شێر دەتوانێ بیكات و تەنها ئەو جارەیە باسی میرێكی كورد دەكات، ئەوە لە كتێبەكەی مامۆستا سەردار حەمید میران و مامۆستا كەریم شارەزا لە لاپەڕە (٩٢) دا باسی كراوە.

وەك گوتم ئەو چاوەڕوانیەی كە رووناكبیر چۆنی بتوانێ دەنگی میللەتەكەی بێت و رۆڵیشی لە رووداوەكانی میللەتەكەیدا ببینێ، چاوەڕوانیەكە ئەو مەفهومەشی دەدا كە دەبێ رووناكبیر بەشداری لە سیاسەتیشدا بكات رووناكبیر ئەندامێكی كۆمەڵگاكەی خۆیەتی و ویژدانێكی زیندوو یان یەكێك لە پلەكانی ویژدانی هەیە كە هەست بە ئازار و ناخۆشی میللەتەكەی دەكات و لە بەرامبەر ئەمەشدا دەبێ بەرپرسیارییەتی هەبێ، بەڵام دیسان جاری وا هەیە ئەم بارودۆخە وا لە رووناكبیر دەكات كە بێدەنگ بێت یان هەڵوێستی جیاواز دەرببڕێت. ئەگەر رووناكبیرێك بیەوێ بەرپرسیارییەتی خۆی قەبوڵ بكات و بیەوێ بەرامبەر بەكۆمەڵگاو نەتەوەكەی بەرپرسیار بێت، ئەوا بێ گومان لەگەڵ سیاسەتدا تووش دەبێت، بەواتایەكی دیكە ئەگەر بیەوێ بەرپرسیارییەتی هەبێ ئەوا ناتوانێ لەسیاسەت و دەسەڵاتی سیاسی و پێگەی سیاسی دووربكەوێتەوەو ئەمەش ناخۆشترین ئەركە كە دەكەوێتە سەرشانی رووناكبیرێك چونكە لەلایەكەوە ویژدانی پێی دەڵێ بەرپرسیاربێت و كاربكات و دەنگی میللەتەكەی بێت و لەلایەكی دیكەوە رووبەڕووی سیاسەت و دەسەڵاتی سیاسی دەبێتەوە. بەم پێیە ناخۆشترین هەڵوێست ئەو هەڵوێستەیە،كە رووناكبیر لەگەڵ سیاسەتدا تووشی دەبێت.

بۆ ئەوەی رووناكبیر بەرپرسیارییەتی خۆی وەربگرێت دەبێ لەسیاسەت نزیك بێتەوەو لە هەمان كاتدا دەبێ ئەو نرخانەی كە هەیەتی بیان پارێزێ چونكە كۆمەڵە نرخێك لەلای رووناكبیر دروست بووەو دەبێ و ئەو ناچار بیپارێزێ ئەمە چۆن دەكرێ؟

چونكە لەو كاتەدا دەبێ رووناكبیر پاك بێت، بەڵام لەكوێ؟ لەناو فەزایەكی سیاسی پیس و بۆگەندا رووناكبیر دەبێ لەناو سیاسەتێكی پڕ لە درۆ ودەلەسەدا، راستگۆبێت كە ئەمە زۆر زەحمەتە، بەڵام رووناكبیر دەبێ ئەم دووانە بەیەكەوە كۆبكاتەوە بەشێوەیەك كە لەلایەكەوە خۆی راستگۆ بمێنێتەوەو لەلایەكی دیكە لەگەڵ خەڵكانێك داهەڵسوكەوت دەكات كە درۆزن و ناڕاستن رووناكبیر دەبێ دەست پاك بێت، بەڵام لەناو كۆمەڵێكدا دەژیت (مەبەستم سیاسەتە) كە دزەو خەریكی دزییە و بەردەوام دزی لەخۆی و میللەت و خەڵكی دیكە دەكات، مانەوەی رووناكبیر دەبێ رەسەن (Orignal) بێت، بەڵام ئەو لەناو خەڵكێكی موزەیەفدا دەژیت و ئەمەش دیسان رووبەڕووبوونەوەیەكی زۆر ناخۆشە و لە دوایشدا هەر سەبارەت بەدەست پاكیەوە، رووناكبیر دەبێ دوور بێت لەبەرتیل خۆرییەوە ( Corruption) ئەم

زاراوەی ( Corruption)ە تەنها بەمانای بەرتیلی مادی نیەو مانای دیکەشی هەیە. رووناکبیر دەبێ پاک و خاوێنی و دەست پاکی خۆی لەناو کۆمەڵێکی بەرتیل خۆردا، بپارێزێت.

ئەمانە هەموو ئەو ناکۆکیانەن کە رووناکبیر لەهەڵسوکەوت لەگەڵ سیاسەتدا تووشیان دەبێ و رووبەڕوویان دەبێتەوە، بەڵام دیسانیش ئەمە هەر هەمان پرسیار دووبارە دەبێتەوە کە مادام رووناکبیر هەستی بە ویژدانی خۆی و بەرپرسیاریەتی خۆی کرد چۆن دەتوانێ لەم کۆمەڵگایە دوورکەوێتەوە کە ناتوانێ لێی دوورکەوێتەوە؟ لەلایەکەوە ئەمە واقیعی کۆمەڵگاکەیە و لەلایەکیشەوە ناچارە هەڵوێستی خۆی بپارێزێت کە زۆر زەحمەتەو ئاسان نیە.

سەرەڕای ئەمە رەنگبێ رووناکبیران کۆمەڵە خەڵکێکی دیاری کراو و بێ دەسەلاتی دیاریکراو بن و، بەئاسانی بزانرێت کە رووناکبیران کێن، بەڵام بەرامبەرەکەیان کێیە؟ من بۆ ئەم بەرامبەرە وشەی (Flock)م بەکارهێناوە کەمانای کەرتێک سیاسەتمەدار لەبەرامبەری وەستاوە کە هەرچی ساختەو درۆی دنیایە دەیزانن، بەڵام رووناکبیرەکە ئەوە نازانێ بەلای منەوە ئامانجی رووناکبیر نەئەوەیەو نە دەبێ ئەوەش بێ کە بگاتە دەسەلات، واتا نابێ دەسەلات ئامانجی رووناکبیربێت و دەبێ لەدەسەلات و چەمکی دەسەلات دووربێت. هەروەها نابێ لە پەراوێزی دەسەلاتیشدا بسوڕێتەوە ئەگینا ئەودەمەی کە بکەوێتە نێو ئەو چوارچێوەیەوە، زۆر لەمەرجەکانی خۆی دەدۆڕێنێ.

چونکە هەر هەنگاوێک کەبەرەو دەسەلات بیهاوێ بەقەدەر ئەو هەنگاوە لە واتاو نرخەکانی رووناکبیری دووری دەخاتەوە.

ئەگەر بەگشتی قسە بکەین مەبەستمان کەس نەبێت، سیاسەتمەدارێک دەتوانێ گوێ نەداتە نرخ و بەهاکانی باوی نێو کۆمەڵ چونکە ئەو پێی وایە دەسەلات تاکە ئامانجیەتی و هەوڵیشی بۆ دەدات و بۆگەیشتن بەو ئامانجەش دەتوانێ هەموو رێگایەک بگرێتە بەرو هەموو وەسیلەیەکیش بەکاربێنێت، بەڵام رووناکبیرێک ناتوانێ ئەوە بکات.

کە دێینە سەرتایبەتمەندیەکانی رووناکبیری کورد ئەوا هەندێ تایبەتمەندی سەیر لە رووناکبیری کورددا دەبینین کە دەبنە هۆی قورس بوونی ئەرکەکەی. ئەو تایبەتمەندییانە بریتین لەوەی کە لەلایەکەوە دەبێ ئۆپۆزسیۆن بێت و بەرامبەر بە داگیرکەرانی کوردستان بوەستی بەبێ کۆت و مەرج- مەبەستم ئەوەیە کە دەبێ دژی ئەودەسەلاتانە بێت کە کوردستانیان داگیر کردووە- هەروەها نابێ سازش لەسەر ئەو پرەنسیپ و بنەمایانە بکات، کەچی سیاسیەتمەدار دەتوانێ وانەکات و بەپێچەوانەی رووناکبیر هەڵوێست وەرگرێت. سیاسەتمەدار پرەنسیپێکی هەیە و دەڵێ (دوژمنی دوژمنەکەم دۆستمە)، بەڵام ئایا رووناکبیرێک دەتوانێ وابڵێت؟ پێم وابێ یەکێک لە گوناهە گەورەکانی رووناکبیر ئەوەیە کە وەک سیاسەتمەدار بیربکاتەوەو بڵێ دوژمنی دوژمنەکەم دۆستمە، ئەمەیان بۆ سیاسەتمەدار دەگونجێ چونکە مونتەڵەق و ئامانجەکانی جیاوازە، بەڵام بۆ رووناکبیرێک ناگونجێ کە بڵێ دوژمنی دوژمنەکەم دۆستمەو ئەگەر وابکات لە میللەتەکەی خۆی دوور دەکەوێتەوە.

هەروەها نابێ دۆستایەتی هێزە ئیمپریالیزمییەکانیش بکات چونکە بمانەوێ و

نەمانەوێ و ناکرێ هێزە ئیمپریالیستییەکانی دوێنێ و ئەمڕۆ بەدۆستی میللەتی کورد لەقەڵەم بدەین. سیاسەتمەداری کورد زۆر بە ڕێکوپێکی و جوانی قاڵبێکی تیۆری دەدۆزێتەوەو ئەو ئیمپریالیستەی کەتا دوێنێ ئەو پێی وابوو پیاوخۆری جیهانەو و دنیا داگیر دەکات ئەمڕۆ بە دۆستی دەزانێ و زۆر بە چاکیش تەوقەی لەگەڵدا دەکات و دەبێ بە دۆستیشی، بەڵام ئەمەکاری ڕووناکبیرنیەو نابێ بەهیچ جۆرێ سازش لەگەڵ هێزە ئیمپریالیستییەکان و داگیرکەرانی کوردستاندا بکات. کاتێ کە سازشیان لەگەڵدا بکات ئەوا ئەو سازشە لەسەر حیسابی ڕووناکبیریەکەی و بەهاونرخە باوەڕ پێبووەکانی دەبێ.

ئەرکێکی دیکەی ڕووناکبیری کورد ئەوەیە کە دەبێ لەبەرامبەر هێزی سیاسی نێوخۆیی دا ئۆپۆزسیۆن بێت چونکە ئەگەر بیەوێت وەک ڕووناکبیر بمێنێتەوە دەبێ لەبەرهەڵستکاریدا بێت. ئەمەش دیارە گرفتێکی گەورەی بۆ دروست دەکات چونکە ئەو (ڕووناکبیر)ە ئەگەر بیەوێ لەگەڵ میللەتەکەی خۆیدا بێت ئەوا دەبێ بە پێی هاوکێشەکە لەبەرامبەر دەسەڵات بوەستێ. لێرەدا دەبێ شتێک ڕوون بکەمەوە ئەویش ئەوەیە کە (ئۆپۆزسیۆن)یان بەرهەڵستکاری بەمانای دوژمنایەتی نیەو ڕەنگە لێرە وا وەرگیرابێت، بەڵام لە وڵاتانی دیکە بەمانای بەرهەڵستی ئەو سیاسەتەیە کە دەسەڵات پیادەی دەکات و لەهەمانکاتدا بەشێوازێکی ئاشتیانەو دیموکراتیک و پەرلەمانتاریانە هەوڵ دەدەی دەسەڵات بگریتە دەست بۆ ئەوەی بەرنامەکانی خۆت پیادە بکەیت.

ئینجا ئەگەر ڕووناکبیرێک بچێتە ڕیزی دەسەڵاتی سیاسیەوە ئەوا بەکردەوە لەبەرامبەر میللەتەکەی خۆی دەوەستێ چونکە من پێم وایە دەسەڵات و میللەت یەکبگرێتەوەو بە دەگمەن و تەنانەت لە دیموکراتیکترین ڕژێمیش دا دەسەڵات و میللەت دووشتی بەرامبەر بەیەکدی وەستاون.

ئەی ئەگەر ڕووناکبیرێکی کوردی بەرامبەر بە دەسەڵاتە سیاسیەکەی خۆی وەستا- بەناوی ئەوەوە کە بەرگری لە میللەتەکەی خۆی دەکات-ئایا ئەو کاتەی ڕووناکبیر ژیانی کەوتە مەترسیەوە میللەتەکەی داکۆکی لێدەکەن یان نا؟ جیاوازییە کە لێرەوە دەست پێدەکات، ڕووناکبیر ویژدانێکی زیندووی هەیە و لەکاتێکدا کە پێی وایە لەبەرامبەر میللەتەکەی بەرپرسیارەو ناچارە ئۆپۆزیسیۆن یان بەرهەڵستکار بێت، مۆری دژایەتی دەسەڵاتی سیاسی لێدەدرێت و بەم پێیە ڕەنگ بێ خوێنیشی بڕژێنرێت و خوێنەکەی حەڵاڵ بکرێ، بەڵام ئایا ئەو میللەتەی کە ڕووناکبیر داکۆکی لێدەکات و خۆیی بە پارێزەرو پشتیوانی دەزانێ، داکۆکی لێدەکەن؟ لە وەڵامدا دەبێ بڵێین میللەتەکە داکۆکی لێناکەن لەبەر هەندێ هۆکار کە لەوانە دەتوانین باسی پلەی خوێندەواری، پلەی ئاگایی و ئاشنایەتی لەگەڵ پرەنسیپە دیموکراتیەکان بکەین کەوا لە میللەت دەکەن کە نەتوانێ داکۆکی لە ڕووناکبیر بکات، یانیش ڕەنگبێ میللەت لەبەر بێ دەسەڵاتی خۆی بێت کە نەتوانێ داکۆکی لە ڕووناکبیرەکەی خۆی بکات.

بەڵام دیسانیش دەبێ ئەوە دووپات بکەمەوە کە ئەمە بە هیچ جۆرێک نابێ بە پاساوی ئەوەی کە ڕووناکبیر خۆی لەو ئەرکەی کەهەیەتی بدزێتەوە.

دەگمەمە ئەو سەرئەنجامەی کە ڕووناکبیر دەبێ (Dessident) بەرهەڵستکاربێت لەناو وڵاتەکەی خۆیدا یەکێک لەو هەڵومەرجە هەرە ناخۆشانەی کە ڕووناکبیری کورد

لەم ساڵانەی دواییدا تووشی بووە ئەوەیە کە پەیوەندی بە شەڕی کورد کوژییەوە هەیە. ئەو هاوکێشە سیاسیەی کە دروست بووە بەشێوەیەک بووە کە دوولایەنی سیاسی دژ بەیەک بووەستن و ئەمەیش هەندێ مەرجی هێناوەتە پێشەوە کە گیروگرفتێکی زۆر گەورەی لەمەڕ دەربڕینی هەڵوێستی رووناکبیرانەدا دروست کردووە یان بەواتایەکی دی رووناکبیر نازانێ چۆن هەڵوێست وەرگرێ یان بێ هەڵوێست بێت.

من خۆم گەیشتوومەتە ئەو قەناعەتەی کە هەندێ جار بێ هەڵوێستی لەبەرامبەر ئەم مەسەلەیەدا باشترین هەڵوێستە. بێ هەڵوێستی نەک بەو مانایەی کە تۆ هیچ رایەکت لەسەر مەسەلەکان نەبێ و تا سەر ئێسقان دژی شەڕی براکوژی نەبیت، بەڵکو دەبێ تا سەر ئێسقان و تا دوا دڵۆپەی خوێن دژی شەڕی کورد کوژی و شەڕی براکوژی بیت، بەڵام بێ هەڵوێستی بەو مانایەی کە بەهیچ جۆرێک خۆی بۆ هیچ لایەک ساغ نەکاتەوە. چونکە خۆساغ کردنەوەی رووناکبیری کورد بۆ هەر لایەنێک و تەنانەت ئەوەش کە خۆی بەهەق بزانێت دیسان هەر هەڵەیە و تاکە هەڵوێستی راست ئەوەیە کە دژی شەڕی براکوژی و ئەو کەسە بێت کە شەڕی براکوژی دەکات جا هەرکەسێک بێت.

هەندێ جار رەنگبێ رووناکبیری کورد ئەوەشی پێ نەکرێ و نەتوانێ ئەوەش بە ئاشکرا بڵێت بۆیە بێدەنگیە کە هەڵدەبژێرێت.

من پێم وایە ئەمەش هەر هەڵوێستە چونکە پێم وانیە هەموو جارێ بێ دەنگی یەکسان بێت بەبێ هەڵوێستی و من ئەم هاوکێشەیە بە راست نازانم.

وەک گوتم شەڕی براکوژی دۆخێکی ناخۆشی هێنایەکایەوەو ئەمە لەو زاراوانەدا دەردەکەوێ کە لەماوەی هەشت ساڵی رابردوودا بەکارهێنراون. زاراوەی (خائین)و (نیشتمان فرۆش) زۆر بە ئاشکرا لە ئەدەبیاتی هێزە سیاسیەکاندا دەبیندرێت. پێت دەڵێ فلانکەس خائینەو فلانکەسیش نیشتمان پەروەرە، ئەم زاراوەیە پتر بەسەر رووناکبیری کورددا شکاوەتەوە.

دوو سێ مەنتیق (لۆژیک) هەیە لەو بەینەدا کە یەکێکیان ئەوەیە ئەوەی تەئیدی ئێمە دەکات و پشتگیریمان لێ دەکات، نیشتمان پەروەرو ئەوەی کە پشتگیری لەلایەنەکەی دیکە دەکات خائین و نیشتمان فرۆشە و ئەمە یەکێک لەو لۆژیکانەیە کە بەکارهێندراوە، بەڵام ئەم لۆژیکە هەنگاوێکی دیکەش براوەتە پێش بەوەی کە: تۆ لەگەڵ ئێمەی کەواتا ئەوە بەمانای ئەوەیەکە تۆ پیاوێکی باش و نیشتمان پەروەری بە پێچەوانەوە ئەگەر لەگەڵ ئێمەدا نەبیت و تەنانەت بەبێ ئەوەی تەئیدی لایەنەکەی دیکەت کردبێ، دژی ئێمەی و بەم پێیە تۆ نیشتمان پەروەرنیت و خائینی، ئەمەش هەنگاوێکی تازەیە لە پێناسەی نیشتمان پەروەری و نیشتمان فرۆشیدا و زۆر بە ئاشکرا دەبیندرێت.

کەواتا مەبەستم ئەوەیە کە هیچ ئەلتەرناتیڤێکیان بۆ رووناکبیری کورد نەهێشتۆتەوە. ئەگەر تۆ ئیدانەناکەی کەواتا خۆت موودانی، ئەگەر تۆ لەعنەت لەشەڕ ناکەی کەواتا خۆت مەلعونی و مەسەلەکە ئاوا کەوتۆتەوە.

بەداخەوە دەبێ ئەوەش بڵێم کە ئەم هەلومەرجە کاریگەرییەکی زۆر خەراپی لە

ڕووناکبیری کورد کردووه بەوەی کەبەشێکی کەمی ڕووناکبیری کورد کەوتۆتە ئەوەی کە هەڵوێست وەرگرێ بە پشتگیریکردنی لایەنێک لەدژی لایەنەکەی دیکە. من پێم وایە چۆن ئەوە زۆرە سیاسەتە ئەو کەسانەش زۆرە ڕووناکبیرە. لەم ساڵانەشدا ئەوەمان بینی کە ئەم جۆرە ڕووناکبیرانە بوونەتە داردەست، میکرۆفۆن، مقەست، بووق و پۆلیس و هەموو ڕۆڵێکیان بینیوە کە ئەمانەش بە تەواوەتی دژی ئەرکی ڕووناکبیرین.

**لە کۆتاییدا من وەک ئەنجام گیرییەک پێم وایە سێ مەرج بۆ ڕووناکبیر زۆر گرنگن کە ڕووناکبیرانی کوردیش لێیان بەدەرنین و ئەوانیش دەگرێتەوە، سێ مەرجەکەش ئەوانەن:**

**یەکەم: ڕووناکبیر دەبێ کراوەبێت- کراوە بەو مانایەی کەنابێ ترسی لە هیچ ئایدیۆلۆژیایەک هەبێ و ئامادەبێت هەموو ئایدیۆلۆژیاو فکرێک بخوێنێتەوەو حەز بکات هەموو فکرو ئایدیۆلۆژیاکان بناسێ بێ ئەوەی خۆی لە جوغزێکدا حەشار بداو بڵێ ئەمە ڕاستەو ئەوەی لە دەرەوەی ئەمە بێت هەڵەیە- کراوەیی بۆ ڕووناکبیر مەرجێکی هەرە سەرەکیە.**

**دووەم: سەربەخۆیی یان سەربەخۆیی فکری بەو مانایەی کە ڕووناکبیر نابێ بکەوێتە ژێر کاریگەری فکرێکی دیاریکراوەوە پێویستە و دەبێ سەربەخۆیی خۆی بێ گوێدانە ئەنجامەکانی بپارێزێت،**

**بەو واتایەی کە ئەگەر لە ئەنجامی بیرکردنەوەی خۆی گەیشتە هەڵوێستێک و ئەوکات هەڵیبژێرێت ئەوا شتێکی باشە، بەڵام نەک لەبەر هێزو ترسی سیاسەت و ئایدیۆلۆژیایەکی سەردەست هەڵوێست یان ئایدیۆلۆژیایەک هەڵبژێرێت. بڕیا ـ بەدەست خۆوە بوون بۆ ڕووناکبیر زۆر گرنگە.**

**سێیەم: (Critical) ڕەخنەگرانەبێ. دەبێ هەمیشە ڕووناکبیر ڕەخنەگرانە هەڵسوکەوت بکات واتا هەر کاتێ ڕووناکبیر لەوەکەوت کە ڕەخنەگربێت پێم وایە ئەودەم مەرجی ڕووناکبیریشی دەکەوێ.**

*** ئەم بابەتە لە کۆڕێک بە هەمان ناونیشان لە ڕۆژی ١٩٩٩/٢/٢١، لە هۆڵی هوتێل هەورامان لە هەولێر پێشکەش کراوە.**

# ڕۆشنبیری کورد ، لە ڕابردووی خۆی دابڕاوە و لە ئایندەش نیگەرانە

*[ ئەم گفتوگۆیە لە ساڵی ١٩٩٩ ، بە شێوەی ڕاستەوخۆ، لە تەلەفزیۆنی گەلان، بڵاوکرایەوە.]*

**سەرۆ قادر: تێکرای خوێندەوارانی کورد لە سەرانسەری کوردستاندا، بەڕێزەوە لەبەرامبەر ناوی مەسعود محەمەد و شکور مستەفادا دەوەستن، چونکە پێگەیشتن و کامڵ بوونی ڕۆشنبیری ئێمە لەم سەردەمەدا بەشێکی زۆری بۆ کەسانی وەکو ئەوان و بەتایبەتی بۆ هەردووکیان دەگەڕێتەوە. لەم دانیشتنەدا، من هەوڵ دەدەم تەنیا پرسیارەکان بخەمە بەردەمی بەڕێزیان و مناقەشەکە بۆ ئەوان دەهێڵمەوە.**

**سەرەتا لەگەڵ مامۆستا(مەسعود محەمەد) دەست پێدەکەین.مامۆستا، ڕۆشنبیری کوردی ئەوەی کە ئەمڕۆ هەیە، وەکو باسی لێدەکرێ، زۆرجاران لەرووی مێژووییەوەجۆرێک لەدابڕان هەیە لەنێوان وەچەی ئێستاو ئەوەی ڕۆشنبیری بەر لەخۆیان.هەروەها لەنێوان مێژووی ڕۆشنبیری ئێمە. بەلامەوەگرنگ بوو کە گوێمان لە رای جەنابت بێ سەبارەت بەوەی کە ڕۆشنبیر بە کێ تێدەگەی و پێتوایە دابڕانێک لە مێژووی ڕۆشنبیری ئێمەدا هەیە؟**

**مەسعود محەمەد:** پرسیارەکەت سادەیە، بەڵام وەڵامەکەی ئاسان نیە. میللەتان لە ڕۆژێک و دووڕۆژدا ناتوانن هەست بەبوونی خۆیان بکەن. وەکو رووبارێک لەسەر شاخێکەوە سەرچاوە دەگرن تادەگەنە دەریا،بەم پێیە وەک پرۆسەیەکی بەردەوام وان.

پێشتر زەمانێک بوو،خوێندنەکە یەکجارسنوردار بوو. پێش٥٠ تا ٢٠٠ ساڵ بەر لەئێستا خویندەواری بریتی بوو لەو کۆمەڵە مەلاو فەقێیانەی کە دەرس و عەقائیدی ئیسلامی و فەلسەفەی یۆنان و عیلمی کەلام و ئەوشتانەی کەلە مزگەوت مەرغوب بوون،دەخوێند. وردە وردە زەمانە گۆڕا، تا ئەو سەردەمەی کە ئینگلیز، عێراقی داگیرکرد و مەکتەب کرایەوە. مەودایەک پەیدابوو، جۆرەرفەرهەنگێکی خستە ناو

بازارِ و جادەو کۆڵانان کە لەگەڵ هی مەلایەکاندا، جیاواز بوو. پێشتر بە زەحمەت خەڵک دەدۆزرایەوە کە دەفتەرێک بۆ بازرگانێک بنوسێتەوە. لەڕاستیدا ئێمە بایی ئەوەی کە هەین زۆریش نیە، کە دەڵێم هەین هی ئەوە نیە گەشە گەشەم پێبکات، ئێمە( ۲۵۰۰) ساڵە لە مەغدوریەتدا دەژین و (۲۵۰۰) ساڵە لەدەرەوەی مێژوو دەژین، (۲۵۰۰) ساڵە لێمان کەم دەکرێتەوەو دەدزرێ و دەکوژرێ .رێگە نیە، بازارِ نیە، چ نەبووە، ئێمە لە سەردەمێکدا پەیدابووین، بەڵام ئێستا لەناوچەیەک دەژین کەمەترسیدارترین ناوچەی سیاسی و ئابوری و ستراتیجی ئەو دنیایەیە. شەڕی کائیناتی لەسەر دەڕواو کوردیش لە چەقی ئەوگۆڕەپانەدایە. نەیارێک نەیاوەرێک نە رابردوویەکی گەشمان هەیەو نە سەروەتێکیشمان لە باپیرانمانەوە بۆبەجێماوە،کەسیش تا سەر لەگەڵمان نەبووە .لەگەڵ ئەوەی کە من زۆر نارِازیم ،بەڵام دیسانەوە سەدجاریش دەڵێم دەبێ شکور ببین بۆ ئەو کەسانەی کەبە هەموو هەڵەکانیانیشەوە تەحەمولی ئەو بارودۆخە دەکەن.رای من جیاوازی لەگەڵ رای خەڵکدا هەیە، بەڵام ئینسانێکی واقیعیم، من کە دەبینم کارمەندێکی دەوڵەت نیوەی ئەرکی خۆی بەجێ دێنێ، لێی مەمنونم، چونکە فێر نەکراوە ئەرکی خۆی بەجێ بگەیەنێ. من وڵاتی دیکەم دیتووە،راسپاردەی گشتی وەکو واجب بوونی نوێژ و شتی وا لە کاتی خۆیدا ئەنجام دەدەن. ئێمە فێر نەبووینە ئەرکی خۆمان بەتەواوەتی جێبەجێ بکەین. بە شێوەیەکی پێچەوانە لەئەرک و راسپاردە گشتییەکان گەیشتووین، وەزیفە هەر نان بخۆو ئاوای ئەودیوی بکە نییە. من مەمنونی ئەم خەڵکەم کە ئەو کلتورەی ئێستا هەیە لەسەرشانی خۆی هەڵگرتووە لەگەڵ هەموو عەیب و عاری، لەگەڵ هەموو ئەو دوژمنانەیەتی و دژایەتیانەی کە هەیەتی.دیسانەوە کوردێک کە (۲۵۰۰) ساڵە لە بزاڤی مێژوو دابڕاوە، دەبێ لێی مەمنون بی کە ئاوا هەڵسوکەوت بکات.

**سەرۆقادر: واتە گلەییت لە پلەی فەرهەنگی یان لە جۆری فەرهەنگی میللەت نییە؟**

**مەسعود محەمەد:** میللەتی کورد بەشێکی لە ئەوروپایە وبەکاری فەرهەنگیەوە خەریکە کە رەنگە ئێمە هەر بە رۆشنبیریش نەزانن. بەداخەوە سەد جار بە داخەوە، ئەوبارودۆخەی کە ئێمە لێرەو لە سلێمانی و بەگشتی لە کوردستاندا تێیدا دەژین. خەڵکەکە لە بارودۆخێکی شێواودایە کە ئەمەش هەر بەتەنها گوناهی خۆی نییە. دنیای دەوروبەری کورد هەمووی کاریگەری بەسەر کوردەوە هەیە، کوردەکەش بە زەحمەت دەتوانێ خۆی بناسێتەوە. نازانێ چ چار لەو دونیایە بکات،واتا برا و برا بەزەحمەت یەکتریان خۆش دەوێ ، ئەمەش هەر هەمووی لە دەرەوەی کوردستان بەرهەم دەهێندرێت. کەواتا نازانم چۆن گلەیی لەو کابرایەبکەم کە بە هەڵەدا دەڕوات.

**سەرۆقادر: لەو واقیعەی کە جەنابت باسی دەکەی، بەومێژووەی کەوا ئامازەت پێدا، فەرهەنگی کورد بە حدودە بەرتەسکەکەی کە بە توێژی رۆشنبیران ناوی ببەین، ئەمرۆ رۆشنبیری کوردی لای تۆ چۆنەو چ روخسارێکی هەیەو دەبێ چۆن بێ؟**

**مەسعود محەمەد:** هەرچەند وەکو دەڵێن دەفتەرم بۆ رۆشنبیران نەگرتووە، بەڵام تێیاندا هەیە رۆشنبیری تەواون ئەگەر چی ژمارەیان زۆرنیە، مرۆڤی بە ناموس و بەویژدانن، هەلپەرست نین و تایبەتمەندی خۆیان هەیە. بەرەو ژێرتر هەیە جێی پەسند وستایش نیە، بەڵام کە رۆشنبیریەکە لەگەڵ ئەو مێژووە دژوارە (۲۵۰۰)

ساڵیه و ئەو هەموو گرفت وکۆسپ و شتانەی لەبەردەم میللەتی کورد دابوونە بەراورد دەکەی، دەبینی هێندەش مافی گلەیی کردنت لە رۆشنبیری کورد نامێنێ -کە زۆر بەداخەوە هیچ پلەیەکی نادرێتێ.

**سەرۆقادر:ماموستاشکور مستەفا، ئەگەر دابرانێکی مێژوویی لە نێوان ئەمڕۆی رۆشنبیرانی کوردی و دوێنێ و هی ئێمە بە مانەهومی مێژوو هەبێ،لێکدانەوەوتێروانینی جەنابت بۆ رۆشنبیری کورد لەم بوارەدا چۆنە؟**

**شکورمستەفا:** لەگەڵ رایەکەی مامۆستا دام سەبارەت بەوەی کە رۆشنبیری کورد لە چوارچێوەی مزگەوت و فەقێ و مەلا و خانەقا و ئەوانەدا باوبووە، بەڵام رەنگە من هەوڵی ئەوە بدەم کەوا لەم مەسەلەیەدا تۆزێک گەشبینتر بم .

ئێمە چەند ئاڵایەکی گەش و گرینگمان هەن لە مەیدانی فەرهەنگی کورددا ،بۆ نموونە کاتێ (تەیموری لەنگ)لە سەرەتای سەدەی شازدە بە دوای (مەلا محەمەدی ئەخلاتی) دا، دەنێرێ کە بچێ بە یارمەتی (نەسەری دلێمی تورکی)ەوە لەمەراغە (رەسەدخانە) دابمەزرێنێت،(مەلای ئەخلاتی) یارمەتیەکی زۆر گەورەی (نەسری دلێمی تورکی) دەدات. هەروەها بۆ نموونە (ئەبو سعودی عەمادی) کە گەورەترین شەریعەتمەدار یان یاساناسی سەردەمی (سوڵتان سلێمانی قانونی) بوو هەروەکو (هەرەزام) دەڵی: ئەوە ئەوپیاوە کوردە بوو کە سەرلەبەری یاساو قانونەکانی دەوڵەتی عوسمانی بۆ (سوڵتان سلێمانی قانونی) دادەنا. بەڵام ئەو هەموو کارە گەورەیە بەنێوی (سوڵتان سلێمانی قانونی)ەوە تۆمار کراوە. هەروا بە نموونە لەمەیدانی وڵات بەرێوەبردن و میرنشینیدا، (ئەولیا چەلەبی) باسی (میر ئاودەلخانی سیسێ) دەکات. ئەو کتێبە دەگمەنانەی کە لە کتێبخانەکەی ئەودا هەبووە ،رەنگە لە کتێبخانەی (سوڵتانی عوسمانی)دا نەبووبێت.هەروەها کەدێتە سەر باسی وەزعی خوێندەواری لە (ئیمارەتی بەتلیس) دا، باسی چەندین فێرگەو مەدرەسەو ئەو شتانە دەکات. باسی سیستەمی ئابوری و سەرچاوەی دارایی ئەو ئیمارەتە دەکات. بەکورتی هەروەکو (تابێرنێ)ی گەریدەی فەرەنسی دەگێرێتەوە کە هەر لەو سەردەمەدا گەشتێکی بۆ کوردستان کردووەو لە مەجلیسی (ئاودەل خان)دا بووەو شتی دیوە، دەڵێ دابونەریت و هەڵسو کەوتی (ئاودەلخان )گەلێ لە هەڵسوکەوتی سوڵتانی عوسمانی جوانتر و رێکوپێکتر بوو. هەروەها دێت باسی شیعر و شاعیریەت و هونەردەکات ، ئەوەش ئاشکرایەکە ئێمە سەرەتایەکی کۆنمان هەیە. لەمەڵبەندی کوردستانی باکور،فەقێ تەیران، عەلی حەریری، مەلای جەزیری و ئەحمەدی خانیمان هەیە. لە کوردستانی باشوور نالی و سالم و مەحوی و حاجی قادری کۆیی و وەفاییمان هەیە کە ئەمانە هەموو هەریەکەو بۆ خۆیان لەمەیدانی فەرهەنگیدا کوردیدا ئاڵایەکن کە شیعر و شاعیرییەتیان ئەگەر لە شاعیرە گەورەکانی فارس تێنەپەڕاندبێ، ئەوا رەنگە شان بەشانی ئەوانیان راگرتبێ. من بیستوومەتەوە کە شاعیری زۆر گەورەی فارس کە شیعری مەولەویان بۆ خوێندونەتەوە لایان عەجایب بووە کەوا پیاوێکی وا لە شوێنێکی وا بەرتەسکدا بتوانێ ئەم قسە جوانانە بکات و ئەو هەموو خەیاڵناسکە دەربڕێت.

لە مەیدانی فکردا (مەسعود محەمەد) فەرمووی رەنگە زۆر شتمان هەبێ، بەڵام رەنگە نەمانتوانیبێ ئێمە ئەوانە هەموو بەسەر بکەینەوە و بزانین جێ پەنجەی کورد لە فەرهەنگی رۆژهەڵاتدا چۆنە،یاخود کورد شێوەو مۆرکی خۆی لە هەموو لقەکانی

رفـەرهەنگیـدا چۆن دەبینێتـەوە. ئێمـە مـەلای شـەهرەزووریمان هـەبووە، مـەلای بەیتـوشیـمـان هـەبووە، مـەلای ئادەممـان هـەبووە، مـەلای خـەتێمـان هـەبووە، مـەلای گەورەمان هەبووە، مـەلافەنـدی هـەولێرمـان هـەبووە. ئەوانە لەبەرتەوازوعی خۆیان یان هـەر لەبەر کورد بوونیان ،رەنگە لەپەنـاو پەستیودا کـەس بە تەنگیانەوە نەبووە. کورد وەکو پێشینەیەک رۆشنبیریی هـەبوو، ئەو فەرهەنگەش یان لەبەر سێبەر وفەرهەنگی فـارس یان تورکـدا بووە، لەگـەڵ ئەوەشـدا کـە ئەوانە(رۆشنبیـرە کـوردەکـان) لەژێر سێبەری ئەواندا گـەورە بوون، بەڵام کەسایەتی خۆیان هـەبووە.جا ئێمـە نەمانتوانیوە تۆز و خـۆڵی زەمـانەیان لێ بتـەکێنین، ئەوەش بە مـانـای(نـەبوون) نیـە و بگرە هـەبووە، بەڵام رەنگە لەوەیدا کە نەمـانتوانیوە جارێکـی دیکە بیانخوێنینەوە، کەمـتەر خـەمیـمان کردبێ ،هـەولمـان نەداوە بزانین ئەوانە چییان گوتووە.دەمێنێتەوە مـەسـەلەی *دابـڕان*، کورد بۆخۆی لەنێوخۆیدا لێکدابڕاوە، چ جای ئـەوە کە بەدرێژایی مـێژوو ویستبمـان وەکـوهێـزێکـی مـرۆیـی وئابوری ببـین. هـەر لە سـەرەتاوە، تەنانـەت هـەرلەسـەرەتای فتوحاتی ئیسلامەوە کورد لە زەمـانـی(یەزگردی ساسانـی)وە پلە پێنج و شەش بووە. کـاتێکیش کە ئیسلام پەیدا دەبـێ و عـەرەبەکـان(یەزگرد) تەنگاو دەکـەن، کورد شـەڕی بۆ (یەزگـرد) نـەکـرد. هـەر لەبەر ئـەوەش بووکـە دەڵێن کـورد زوو بەپیـر ئیـسـلامـەوە چوو.ئەو کـــوردە لە ناچاری ویســـتـــویەتی بەهـەر جـــۆرێک بێ لە نیـــزامی ساسانی،رزگاری بێ. ورد وردە قۆناغێک هاتە پێش، بەتایبەتی لەسـەردەمی (بەنی ئومـەیە)کە مـەسـەلەی نەتەوایەتی بە شێوەیەکی فراوان سـەری هـەڵدا .پێموایە کورد لە تورکـی سـەحـراگـەری یان تورکسـتـان پێشکەوتووتر بوون، کـەچی تورک توانی بۆخـــۆی ئیـــمـــپـــڕاتۆریـــەت دروست بکات،هـەروەها فـــارس بەنـاوی ئیسلامەوەئیمپڕاتۆریەتی دروست کردوعەرەبەکانیش پێی بوون بە ئیمپڕاتۆریەت، بەڵام راسـتـە کـورد زۆر سـودی لە ئیـسـلام دیت، بەداخـەوە لە سـەرێکی دیکەوە نەیتوانی بۆخۆی بەناوی ئیسلامەوە دەوڵەتێک بۆخۆی دروست بکات.

کـاتیـخـۆی لە سـامـەرا ،تورکـەکـان ئەوەنـدە زۆر بوون، قـامـوسـێکی تورکـی بە عـەرەبییـان دانا تاعـەرەبەکان لێوەی فێری تورکی بن. هـۆی ئەمـەش دەگـەڕێتەوە بۆ زۆر بـوونـی خـــەڵکی تـورک لـەم نـاوچـەیە. لـەوێدا نـەخــــشــــەیەک هـەیە(لەنـاو قامـووسـەکـە)نەخشـەکـە کوردسـتـانی تێـدایە، نوسیـویەتی(بلاد الاکراد) و لـەگـەڵ میسردا هـاوسنورە، واتا شـام و فەلەستین و لبنان و ئەوانە هـەمووی لەنێـو سنووری (بلاد الاکراد) دانە.

**سـەرۆقـادر: ئەو کـەلەپورو فـەرهەنگەی کـە جـەنابت باسی دەکـەی، ئەو مـیـراتە رۆشنبیـریەی هـەمـانە، کەمـتـر کـاریگەریـیەتی بەسـەر رۆشنبیری ئەمـڕۆی کوردەوە هەیە بەڕای تۆ ئەمـەیان دەگەڕێتەوە بۆ ئەو کـەڵە رۆشنبیرانەی کە ئێستا باست کردن ،لەنێو تورک و فـارس و عەرەبدا کاریان کردووەو بوونەتە بەشێک لە فەرهەنگی ئەوان، بۆیە نەگوازرانەوە بۆ ناو رۆشنبیریی ئێمە،تۆڵێی کەم و کورییەکە لە ئێمەو لە رۆشنبیری ئێستا بێت کە دوێنێی خـۆمـانیـان پێنەخوێندراوەتەوە یان بە یەکێک لە هۆیەکان کە لەوانەیە لای ئێوە بێت ،رۆشنبیری کورد ناگەڕێتەوە سەر کاری خۆی؟**

**شکور مستـەفـا:** خـۆی دابڕانێک هـەبووە، بەڵام دابـڕانەکە لە کوێوە بوو.بۆ نموونـەی ئەم دابڕانـە دەتوانم بڵـێم لەبیـرمـە کـە لـەسـالانـی(١٩٣٢-١٩٣٤) وئەوەدەوروبەرە کـە مەکتەبی تـازە لە کەرکوک و سلێمـانی پەیدا ببوو، خـەڵک پێیان عـەیب بوو منـاڵیان ٣٨

بنێرنە مەکتەب. بەڵام دوایی بوو بە باو.ئەمە وای کرد دوو جۆرە کەسایەتی ڕۆشنبیر پەیدا بین؛ ئەفەندی ونائەفەندی.ئەفەندییەکان دەرچوانی قوتابخانە تازەکان بوون و نا ئەفەندییەکانیش هەمان شێخ و مەلاو فەقێیەکان ،واتائەو خوێندەوارانەی کەوا درێژەپێدەری فەرهەنگی فارسی و تورکی و عەرەبیەکەی جاران بوون.شتێک دروست بوو کەوا ئەفەندی بەلای مەلاو شێخەوە فەرمەسۆنە و ئەفەندیش مەلاوشێخی بەکۆنەپەرست و جاهیل دەزانی.مەکتەبەکە جۆرە گومانێکی لای خەڵکەکەدرووست کرد سەبارەت بەوەی کە کورد چییە، مەلا چیە، فەقێ چیە؟

خەڵکەکە بەرەوجۆرە ژیانێکی خوێندەواری تازە دەرۆیشتن ومناڵانی کورد بە عەرەبی دەیانخوێند. تا چلەکانیش لە کەرکوک تورکمانەکان بە تورکی دەرسیان بە خەڵک دەگوتەوە. لە سلێمانی پێموایە کوردیان دەوتەوە، بەڵام لە پاشان ئەم مەکتەبانە لە بیری خەڵکیان بردەوە کە ئەوانە کوردن، واتا نەیدەتوانی بڵێ منیش زمانم هەیە ،منیش میللەتم. لە بیرمە لە کەرکوک گاڵتەیان بەکورد دەکرد، شەرمم دەکرد بە کوردی قسە بکەم.لە (١٩٣٧) هاتومەتە ئەو هەولێرە خزمی لێبووە، لەگەڵ مناڵەکانی دەچوومە دەرەوە ،بە کوردی قسەم لەگەڵ دەکردن، دەیانگوت عەیبە بە کوردی قسە مەکە بە تورکی قسە بکە.

**سەرۆقادر: هەر لەو قۆناغەی کە مامۆستا شکور باسی پێگەیشتن و تەکریمی ڕۆشنبیری ئەمڕۆی کوردی کرد واتا لەسەرەتای ئەم سەدەیەوەگرە کەمێک سەرووتریش. جەنابت لە نوسینەکانتدا زۆر مناقەشەی ڕۆشنبیران و خاوەن فکرانی کورد وعێراقی و دەوروبەریشت کردووە، کەوا پتر بە لاسایی کردنەوەوە خەریکن یان فکرێکیان بەبێ بیرلێکردنەوە، یان هەرسکردنی ئەو فکرە وەرگرتووە. پێتوایە چەند لاساییکردنەوە لە بیرکردنەوەی کوردی، لە فیکری کورددا هەبووە، لە ڕووی فەلسەفی و پێوانی کۆمەڵایەتی؟**

**مەسعود محەمەد:**بەدواداچوونێکم لەسەر قسەکەی مامۆستا شکورهەیە، سەبارەت بەوەی کە فەرمووی؛ زۆربەی فەقێ و مەلا هەمووی خاوەنی زانستی عەرەبی بوون، زانستی شەریعەش تایبەت بوویە عەرەب،بەڵام سەبارەت بە زانستی دیکە ئەوەی وەرگێڕبوو لەزانستی یۆنان شتێکی دیکە بوو.ئەمەیان میراتێکی ڕۆشنبیری بوو بۆ هەموو دنیاو تەنانەت ئەوروپیەکان دەچوون لە ئیسپانیاوە لە عەرەبەکانیان وەردەگرت.

ئێمە خاوەنی شتێک نەبوین هی خۆمان بێت. وانەی کتێبمان و شەریعەت و ئەستێرەناسی ،هەمووی هەر بەعەرەبی گوتراوە.ئەو مەلایانەو لەهی بەر لەوانیشەوە، بگرە تا سەردەمی عەباسی جگە لە قسەی ڕووت هیچی دیکەیان نەکردووە، داریان لەسەر بەرد دانەناوەوئەوەی کە هەیە هەمووی هەر قسە و زمان گێڕانە.

**سەرۆقادر: واتاهیچ کارێکی فکرییان نەکردووە؟**

**مەسعود محەمەد:** خۆ فکر نابێتە بیناو بژێوو دۆزینەوە.تا دنیا دنیایە شیعر بڵێ هەر شیعرەو نابێ بە هیچی دیکە وهیچ کەسیش تێرناکات . ئەوەندی زانیبم لەو زەمانانەی کە بەمن گەیشتووە لەناو کورددا لەماوەی (١٥٠) ساڵدا ،ئەوەندەی کە لە باوکمم بیستووە تاکە داهێنەرێک کە هەبووبێ (مەستی ئەفەندی) بووە کە خەڵکی سلێمانی و باوکی (تۆفیق وەهبی) بووە.

ئەو کابرایەداهێنەر بووە،ئەگینا لەهەمـوو کوردان بە هەر سێ جـیلیـەوە کـە من تا رادەیەک ئاگاداریم وشایەدیشم باوکمـە لەنێوهەموو کوردا، لەماوەی (١٥٠) سـاڵدا تەنـهـایەک داهـێنەرهەبـووە. ئاسی و دەسـتـار و شـتی دیکە هی هەزار سـاڵ و دوو هەزار ساڵ بەر لەئێستایە، شتێک نیە ئەمڕۆ دروست کرابێ. ئەو زانستەی کە لێرە بڵاوبووەوەو مەرغوب بووە، هەمووی بریتیـە لە تەلاقدان و چاککردنەوەی ، قسـەی ناو کـتـێـبـان و شـیـعـر. ئەوە نانێکی دروست نەکـردووە وبەپێی دابەشکردنەکـەی کۆن،زانستەکە هەمووی(رەفیعە)بووە .

مەنتیق و شیـعـرو ئەو شـتـانە بە زانسـتی مزگـەوتان دادەنرێ ،بەڵام ئەو زانسـتـەی کەنانی پێ پەیدا دەکرێ ئەوە(وەزیعە) بووە.

**سـەرۆقـادر: ئـەم فـەرهـەنـگ و کـەلـەپورەی کـە جـەنابت باسی دەکـەی ، هـی بەر لە سـەدەی بیسـتـەمـە، لـەناو خـوێندەوارو ڕۆشـنبیرانی کورد زاڵ بووە، ئەوەی ئێـستـا باست کرد. پێتوایە ئەوە تەقلیدێکی بەجێـهێـشت بەتایبـەتی دوای ئەوەی لەسـەدەی بیستـەمدا ڕۆشنبیرانی هاوچەرخ، ئێوەو خوارئێوەش کە فکریان هێنایە ناو کۆمەڵی کوردەواری ، دەستیان کرد بە بیرکردنەوە، چەند توانیان بەشێوەیەکی قووڵ و ڕەسـەن بیریکەنەوە. مەبەستم ئەوەیە کە لاساییکردنەوە نەبوویێت.**

**مـەسـعـود مـحـەمـەد:**نێوانی نوێخوازو مـەلایەکان ،تا ئێسـتـاش خۆش نیە کە یەک لەیەکێ وەربگرێ. ئێـسـتـاش یەکتـریان خۆش ناوێت لەبـەرئەوەی مـامۆسـتـای نوێ و قوتابی نوێی ، کابرایەک کە دەچێ (طبیعە) دەخوێنێ و دەبێتە دکتۆر، یان کابرایەک لە کۆمـپـیـوتەر دەخـوێنێ هـیـچ حـەزی لەزانسـتی ئایینی ئیسـلامی نییـە، ڕەنگە هـەر پێشی خۆش نەبێ و بەلایەوە نەچێ. جا نازانم مەبەستت چیە لەوە؟

**سـەرۆقـادر: مـەبـەسـتم ئەوەبوو کە بەرێزت لەبەشی هەرەزۆری نوسینەکانی خۆتدا ، ئەوەی پەیوەنـدی بە فـەلسـەفـەو تێڕوانینی کـۆمـەڵایەتی و چەمکی ئازادی و ڕزگـاری نەتەوەییەوە هـەبێ، مناقەشەی ئەوەت کردووە کە ئەو نوسـەرانە یان ئەو ڕۆشنبیرانەی کورد، پتر فکریان وەک خـۆی لەدەرەوەڕا وەرگرتووە. ڕاستەوخۆ ئەو مەلایانەی کە تۆ باسـیـان دەکـەی شـتـیـان گـوتۆتـەوە بۆ ئەوەی کـەوا شـتـێک بـخـەنە سـەرئەوانەی پێشـوویانەوە. ئەو فـکرەی کـە ئـەمـڕۆ هـەمـانە، ئـەمـەیان تا چـەنـد بیرکـردنەوەیەکی سەربەخۆیەوتا چەندیش لاسایی کردنەوەی تێدایە؟**

مەسعود محەمەد: من شـەخسی خۆم لاسایی کـەسم نەکردۆتەوە. لەباوکمـەوەشتێک بەمن گـەیشتـووەکەئەویش خـۆڕاگری وراست گـۆییـە. ئەگینا باوکم سـەرپشکی کردم لەوەی کە خـۆم چیم بوێ وا بکەم.چەندی گـوتیـان با ببێـتـە مـەلاو نازانم چی ،گـوتی کـوڕی مـن کـوڕی چەرخـێکی جـیـا لە چەرخی منە .ئەوەدەچێت بۆخـۆی لە حـقـوق دەخـوێنێ.ئەگـەر مـەبەست شـتی تازە بێت ئەواباوکم رسـالەیەکی لە(علمی الکلام الجـدید)دا نووسی واتێـدەگـەم ئێـسـتـا لە (جـامـعـەی ئەزهەر)بووە بە سـەرچاوە . مـەبەستم ئەوەیە ئەگەر شتێک بە من گەیشتبێ لە باوکمەوە بووە، هیچی دیکەم پێ نەگەییوە،سـەبارەت بەوەی کە علمی کەلامی بەمن گـوتبێ یاخـود کتێبی مزگـەوتانم لەلای خـوێندبێ، بەهـیـچ شـێـوەیەک شـتی وانـەبووە منی سـەرپشـک کـرد و ئازادی تەواویشی پێ بەخشیم.

**سەرۆقادر: ئەو رۆشنبیرانەی کە جەنابت باسـتکردن بەتایبەتی پێش سەدەی بیستەم و کاتی خۆی لەناو ئیمپراتۆری عوسمـانی یان لەناو ئیمپراتۆری سەفەوی رۆڵێکی زۆریان بینیوە ، پێت وایە ئەمانە بوونەتە بەشێک لەفەرهەنگی ئەوان؟**

**شکور مـسـتـەفـا:** ئێمـە نەمانتوانیـوە بە تەواوەتی ئەو کـەلەپورەی کە پێیـدەڵێن فەرهـەنگی ئیسـلامی کوردی رۆژهەلاتی، بپشکنین. نەک هـەر ئەوە ئێسـتاش میللەتی کورد ئەوەی کە پێیدەڵێ (زار گۆتی) یان ( فۆلکلۆری شەفەوی)،خۆی کۆینەکردۆتەوە، ئێـمـە بـەدوای خۆمـاندا نەگـەڕاوین و خۆمـان نەخـوێندۆتەوە. رەنـگە ئێسـتـا تۆ لەو کوردستـانەگەورەو گرانە بگەڕێی هـەر بۆپێکەوەنانی فەرهـەنگێکی یەکگرتووی هـەموو شـێوازەکان، رەنگە زمـانی کوردی – ناڵێم زمـانی عەرەبی زۆر دەوڵەمـەند نیـە– بەلام رەنگە لە زمانی عەرەبی دەوڵەمەندتر بێت. ئێمە نەک هـەر نەگەڕاوین بزانین چیمان کـردووە لە مـەیدانی فـەرهـەنگێکی نوسـراوەی سـەرکاغـەز، بگرە نـەگـەڕاوین بزانین ئەوەی لەسـەرزاری خـەڵکەکـە چی هەیە. دەبـێ ئەوەش بزانین هـەمـوو رۆشـنبـیـرێک مـەحکومـە بە هـەلومـەرجی مێژوویی خۆی.قـەت مومکین نیەتۆ بێی داوای ئەوە بکەی مـەلای جـەزیری بـێ باسی کۆمـپـیـوتەرت بـۆ بکات، گوایـەدەڵێن ئەحـمـەدی خـانی لە مـارکس مـارکسی تر بووەوگوایە باسـی مـارکسیـەتی کـردووە،یان ئەوەتا چۆن دەبـێ چاوەڕێی ئەوە بکەیت فەقێ تەیران بێت باسی چونەسەر مانگت بۆ بکا.

هـەر رۆشنبیرە ،بە زروفی خۆی و بەهـەلومـەرج وبارودۆخی مێژوویی خۆی مەحکومە. کوردلەوشـارسـتـانییـەتە گـەورەیەی کـە پێی دەڵێن *شـارسـتـانییـەتـی رۆژهـەلات یان ئیسـلام یان ئەوەتا شارستانییەتی ولاتی* (***بین النهرین***)*، بەشداره،یان ئەوەتا خـۆی پێی وایە بەشـداره، بەلام رۆڵەکەی چەندە. ئێمـە نەمـانتـوانیـوە ئەمـە دیاری بکەین و هەروەهـا بە تەواوەتـی بزانین چیـە*. ئینجـا مـایەوە مـەسـەلەی دابڕان. هـەیە هـەر بە تەواوەتی دابڕاوە، بۆ نمونە یەکێکی وەکو (عەبدوڵلا گۆران) بۆ خۆی هـەر وەکو مەلاو فـەقێ و ئەوانە خـوێندویـەتی، بەلام لەبـارودۆخـێکدا وردە وردە تورکـیـشی زانیـوە. (تۆفیق فیکرەت) و (سـەلاحـەدین عـەلی) و (شـەهابەدین) و ئەو شـاعیـرە تازانەی کە لەسەردەمی سامانی هونەر ورێکخستن و .....هتد لە دەوڵەتی عوسمانیدا پەیدا بوون ،کـاریگەریـان کـردۆتەسـەر یەکێکی وەکو (شـێخ سـەلام) و (نوری شـێخ سـاڵح) و (مـامـۆسـتـا عـەبدوڵلا گـۆران). ئەوانـە بۆ خـۆیان وردە وردە پێـشکەوتون، بەلام دانەبڕاون . (عـەبدوڵلا گۆران) کە شیعری گوتوە شیعرەکانی رەسەنایەتی کوردی و شـتی تازەشی تێـدایە، لە وەزن وسـەروادا، وازی لە عـروز هـێناوەو هـەندێ کـێش و قافیەی کوردەوارانە، کەپێی دەڵێن هیجائیە و بە پەنجە دەیژمێردرێن،خستۆتە ناو.

(عەبدوڵلا گۆران) نـەهاتووە ئەو وشە و زاراوە سەیرو سەمەرانەی کە نالی و سالم و مـەحـوی و ئەوانە بەکـاریان هێنـاوە، بەکـاربێنێت کە زۆر مـەرغـوب بووەو عـەرەبی و فـارسی تێـدایە. (عـەبدوڵلا گـۆران) هـاتووە وشـەی نـاسک و جـوانی زمـانی خـەڵکی بەکارهێناوە و گوێشی نەداوەتە ئەوەی کە ئەوە زمانی لادێیانە .واتا لەم روانگەیەوە سـەیری زمـانی کوردی نەکـردووە. ئەدەب و شیـعری چاک ئـەوەیە نوخبـە بێت، ئەوەش بۆخـۆی رایەکـە. هـی واش هـەبووە دانەبڕاوە، ئەمـانـەش کـەمن. ئیـواش هـەیە دابڕانەکەی بە شێوەیەکە کە نەزمانی خۆی لە بیرماوەو نە مێژووی خۆی بەتەواوەتی دەزانێ ونە دانیش بەوەدادەنێ کە کورد بۆخۆی هیچی هەبووە.

**مەسعود محەمەد:** سەبارەت بەوەی کەفەرهەنگی ئیسلامی لەناو کورددا بڵاوبووەوە راستــە، تەنانەت من رایەکم هەیە و پێــمــوایە،ئەوهەزاران فـەقێ و مـەلایـەی کـە بە درێژایی و پانایی کـوردسـتـاندا دەهاتن و دەچون، تاقـە کـوڵەگـەی بوونی نـەتەوەیی بوون کـە خـەڵکەکـەیان بەیەکـدی دەناسـاند، ئەگینا(وان) نـەیدەزانی (سنە) چیـە، (کرمانشان) نەیدەزانی (دیار بەکر) چیەو کەس ئاگای لە کەس نەدەبوو. بەبێ ئەوەی فـەقـێ و مـەلا بیـریان لەمـە کـردبێـتـەوە بەیوەنـدی نێـوان نـەتەوەیان پاراسـتـووە. راستە،وانەکانیان بە عەرەبی بووە، بەڵام بە کوردی قسەیان کردووە. ئەمە فەرهەنگە بەڵام دەبێ بزانین، لە ئەوروپا چەندسەدە پێشتر باروتیان دروست کرد. لە ئەوروپا (قـەڵای فـیودال)ێک لەگەڵ دیوەخـانی ئاغایەکانی وڵاتی خـۆمـان،یان هـی سـەرۆک هۆزێک بەراورد بکە؛ قەڵای فیودالێکی ئەڵمانی پێش (٦٠٠) و (٧٠٠) ساڵ نمونەی هونەری سـەردەمی خۆیەتی. ئینجا خاوەنی قەڵاکە خۆی و باب و باپیری بە پارە تابلۆی هونەرییـان بە نیگار کێشـەکانی سەردەمی خـۆیان درووستکردووە کە رەنگە هەر تابلۆیەک لەو تابلۆیانە ئێـسـتـا لە قـیـمـەت نەیەت. لە وڵاتی ئێـمـە مـەگـەر لە دیوەخـانی (بابەکری سـەلیم ئاغا)، منداڵ بە خـەڵوز خـیت خـیتـۆکەی لەسـەر دیواری کردبێ ،ئەگینا چیدیکە نەبووە، قەڵای چی و فیودالی چی.

ئێستالەرۆژهەڵاتی ناوەڕاست مەسەلەی ئاو هەیە ، خۆ لە (٩٠٪)ی ئاوەکە لە خاکی کوردستان هەڵدەقوڵێ کەچی کورد هیچ دەسەڵاتی قسەی نیە. مانای ئەوەنیە ئاوەکە هـی من نیە، لای من هەڵدەقوڵێ، بەڵام خەڵکی دیکە تەراتێنی تێدا دەکا. ئێمە کە ئەو بێ باکـیـە دەکـەین لەگـەڵ خـۆمـان هەمـووی سـەهـوە، ئەو دوو حـزبە {پ.د.ک و ی.ن.ک}ئەگەر لەگەڵ یەکدی رێک نەبن گوناهێکی گەورە دەکەن.

**سـەرۆقـادر: زۆرجـار لە جـەنـابـتـمـان گـوێـلـێـدەبێ باس دەکـەی نەبونی کـیـانێک کـاریگەریـەکی زۆری هەبووە لەسـەر کـامڵ نـەبونی فـەرهەنگی و فکر لەناو مـیـللەتی کورددا . زۆر جاریش نمونە بە ئازەربایجان دێنیەوە. دەکرێ ئەم فکرەمـان جـارێکی دیکە بۆ روون بکەیتەوە؟**

**شکور مـسـتـەفـا:** دروست بوونـی دەوڵەت سـەرەتای دروست بوون یـان تەکـامـولی لە (٩٠٪)ی رەنگ و رووی مـیللەتـەکـەیە.سـەبارەت بە فکری دروست کـردنی دەوڵەتێکی ناوەندیش، ئێـمـە وەکـو فکر لە سـەرەتای سـەدەی (١٧)دا (ئەحـمـەدی خـانی) هـاوار دەکات :دەوڵەتێکی مەرکـەزی کوردی هـەبێت، داوا لە هەموو ئەمیـرەکان دەکات و هـاوار دەکـات. وەکو فکر، لای کـەسـایەتـیـیـەکـان و لای خـەڵکیش هەبووە. رەنگەئەوەی لای خـەڵکیش هـەر لەلای کـەسـایەتـیـیـەکـانەوە، واتا لە تـاکـەکـانەوە دەست پێـدەکـات: پێغەمـبـەرێک هەیە، لینینێک هەیە، ناپلیـۆنێک هەیە کە فکرە گـەورەکان لای ئەوانەوە دەست پێـدەکـات. ئینجـا ئاگـایی نـەتەوەیی کـە بۆ خـۆی سـەرەتای دروست بـوونی دەوڵەتێکە. لێرەدا جیاوازییەک هەیە، مادامـەکی بیری نەتەوەیی لە سەردەمی ئەحمەدی خانیەوە هەبێ ئەی بۆ ئەو دەوڵەتە ناوەندییە دروست نەبووە؟

وەکو فکر ئەحـمـەدی خـانی هـەسـتی بەوە کـردووە کە دەبێ دەوڵـەتێکی ناوەندی هـەبێ، بەڵام گـرنگ ئـەوەیە تاچـەند ئەو فکرە لەناو مـێـشکی خـەڵکدا رەنگی داوەتـەوە و ئەو خـەڵکە چەند دوای ئەو فکرە کـەوتوون.راسـتـیـیـەک هەیە ، خـەڵکێک لە جیـاتی ئەوەی دوای ئەو فـیکرە بکەون دوای ئاغـاو مـیـرەکـانی خـۆیان کەوتوون.بۆ دروست نەبوونی دەوڵەتێکی ناوەندی زۆر هۆ هـەیەکە یەکێک لەو هۆیانە ئەوەیە هـێشتا کورد لە ئاستی ٤٢

پێویستدا نیەو ئابووری و کۆمەڵێکی گەشەنەسەندووی نیە. هۆکار زۆرە کە تۆنەتوانی ئەو فکرە بکەیتە شتێکی پراکتیکی ، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا کە حکومەتێکی ناوەندی دروستیش نەبووە ،رەنگورووی نەتەوەی کورد وردە وردە بۆخۆی دروست بووە. ئەوەتا شیعری کوردی چاک پەیدا بووەو شانازی بە کوردایەتی و زمانی کوردیەوە کردووە، بەڵام ئەو وشیارییە کوردیەی کەپەیدابووە نەگەیشتۆتە ئەو ئاستەی کە ببێتە حکومەتێک.

بۆ نمونە؛خەڵکی ئازەربایجان لەبنەڕەتدا تورک نین، میللەتێکن پێیان دەڵێن ئەغوان یان ئەلبان وکاتی خۆشی ناوەندی زەردەشتیەتیش بووە، بەڵام ئەوانە پاشان بەرتەخت و تاجی دەوڵەتی عوسمانی و سەفەوی وردە وردە تواونەتەوە و بەتورکی قسەیان کردووە و تەنانەت سوڵتان سەلیمی عوسمانی کاغەز بە فارسی بۆ شا ئیسماعیلی سەفەوی دەنێرێ ئەویش بە تورکی وەڵامی دەداتەوە بۆ ئەوەی پێی بڵێ تۆ تورک نیت فارسی. ئەویش دەیگوت نەخێر مادام بە تورکی بۆم دەنووسی نەخێر هەر تورکی.. سەیر لەوەدایە ئازەربایجانی لە پێش جەنگی جیهانی یەکەمدا وەکوتورک هەر بە هیچ شێوەیەک وشیاری نەتەوەییان تێدا بەدینەکراوە. بۆنمونە ئێمەی کورد پێش ٦٠-٧٠ ساڵ وشیاری نەتەوەییمان چۆن بووە، ئەوانیش ئاوها بوونە. بەڵام شەڕی جیهانی یەکەم دێ و وردەوردە شتێک دەکەوێتە مێشکیانەوە کە گوایە تورکن و دوایی سۆڤیەت دێ زیاتر مەسەلەکەقووڵ دەکاتەوە، کار گەیشتە رادەیەک ئەو ئازربایجانیانە لەکاتێکدا، ئێمە پێمان دەگوتن عەجەم ـــ ئەوی بەتورکی قسەی دەکرد پێی دەگوترا عەجەم ـــ ئێستا ئەوەندەیان ئاسەوار دۆزیوەتەوەکەمێژوویان دەبەنەوە سەر ٦-٧ هەزار ساڵ لەمەوپێش.ئەدەبیاتیان هەیە، شیعریان هەیە..مەبەستم ئەوەیە مەرج نیە ئێمەهەمووئەو شتانەی کە باسیان لێوە دەکەین هی١٠٠٪خۆمان بێ با تۆزێکیشی پێوەنێین. میللەتەکانی دیکەش هەروا دروست بوونە. من ١٠شتم هەیە بە ١٥شت باسی دەکەم چی دەبێ ئەگەر بڵێم ئەوەش هی کوردە. هەموو دنیا خۆی خۆی دروست کردووە ،قەیدی چ دەکا ئەگەرمن لە پاڵ ١٠ شتی راستدا دوو درۆش بکەم، چونکەهەر بەدرۆیە کە دەڵێن کورد نیەو دەڵێن هەمووی تورکن.

**مەسعود محەمەد**:{**بە توانجەوە**} قەیدی چیە ئەگەر لە پێناو راستیدا ١٠درۆیانیش بکەی ،هەقی ئەوەت هەیە.

**سەرۆ قادر: مامۆستا لەسەرەتای ئەم سەدەیەوە، بەتایبەتی کە بزووتنەوەی سیاسی لە کوردستان زۆرپەرەی سەندووە، زۆربەی بڵاوکراوەو کتێب وناوەندە فەرهەنگیەکان وبەشی هەرەزۆری ئەوەی کە هەیە دیارە لەناو بزووتنەوەی سیاسی پەرەی سەندووە چونکە بەو مەفهومەی یان بەو شێوەی کە مامۆستا شوکریش باسی کرد، ئێمە کیانێکمان نەبووە، حکومەتێکمان نەبووە تاوەکو پەرە بەکاری فەرهەنگی بدا. لەوەوە جۆرە پەیوەندییەک لە نێوان رۆشنبیران و بزووتنەوەی سیاسی دروست بوو. پێتوایە ئەم پەیوەندییە چەندئاسایی بووەوچەندیش وەکو ئەمڕۆ بزووتنەوەی سیاسی کە لە وانەیە تارادەیەک رۆشنبیرانی کوردستانی پشتگوێ خستبێ ، پشت گوێی خستوون ؟**

**مەسعود محەمەد**: بە قەناعەتی من ئەودەمەی کە لە بیستەکان رۆشنبیر بە مەفهومی نوێ پەیدا بوو واتا ئەو رۆشنبیرانە لە ئاستی بزووتنەوەی سیاسی ئەوساـــ سەردەمی شێخ مەحمود ـــ، دەڕۆیشتن. واتا ئەوان لەرووی فیکرییەوە لە کردەوەی شێخ مەحموود ،کەمتر نەبوون .ئەمە بووە هۆی

ئەوەی حوکمداریەک لە سولەیمانی پەیدابێ ، دوایی ئەو حوکمدارییە بەسەر چوو و پێ بەپێ حکومەتی عێراق دەسەلاتی پەیدابووە، قوتابخانە کرانەوە، ڕێگاو بان پەیدا بوون، ڕۆژنامەنووسی و گەلێک شتی دیکە پەیدا بوون. ئەوە گەیشتە رادەیەک کە حزبی کوردی دەستیان بە کار کرد.هەرچەندە لە سەرەتادا نەختێ شل و شۆق بوون، بەلام دوایی جێپێی خۆیان قایم کرد. لەپاش (١٤)ی تەمموز، حزبایەتی لە عێراق ، بەتایبەتی لە ناوکوردستانی عێراقدا گەشەی سەند. یەکێک لەو حزبانە پارتی دەموکراتی کوردستان بوو ،کە هەر کوردی بوو، واتا نەتەوەیی بوو، لەگەڵ ئەوەی کە گەلێک لە سەرکردەکانی حەزیان لە مارکسیەت بوو .

بەشی زۆری کوردەکەش کە لە حزبی شیوعی عێراقی دا بوو، ئەویش هەربووبوە شیوعی،واتا کوردەکە ببووە دوو بەش؛بەشێکی بووبە نەتەوەیی ،بەشەکەی دیکەشی بووە شیوعی. شوعیەکە لەگەڵ شیوعیەتی جیهانیدا بوو.لە گەڵ ئەوەشدا، ئەویش لەگەڵ کوردایەتیەکەدا کاری دەکرد. من ناڵێم ئەو حزبە بە تەواوی لەگەڵ پێداویستی ئەو واقیعەی تێیدا دەژیا، هەوڵیدەدا ،ئەوە ناڵێم، چونکە دەزانم بەپێی قەناعەتی خۆم ، دەتوانم بڵێم هەموو ئۆپۆزیسیۆنی پێش(١٤) تەمموز، لەو ڕێبازەیدا کە بەتەمای پیادە کردنی بوو، بە هەڵەداچوو بوون.چونکە هیچی پیادە نەکرا، هیچی سەرنەکەوت ، بە گەشەنەسەندوویی مایەوەو پاشەکشەی کرد . کاتێک(عەبدولکەریم قاسم) هات وردە وردە ئەو شتانە بەسەر چوو . دوای حیزبی بەعس هات کەسی نەهێشت و عێراقەکەی کردە ئەم عێراقەی کە ئێستا دەبینی.

**سەلاح بەدرەدین[بە تەلەفۆن] : هیوادارم شتێک دیاری بکرێت ئەویش پرسی فەرهەنگییە، چونکە ڕۆشنبیری پرسێکی نەتەوەییە نەپرسێکی سیاسی و نە حکومیشە لەبەرئەوە من پێم سەیر بوو هەردوو مامۆستای گەورە دیارە هەر لەنێوان هەولێر و سولەیمانی دێن و دەچن .پێویستە گوزەپانەکە تۆزێک فراوانتر بکەن.واتا بەو شێوەیەی کە فەرهەنگ مەسەلەیەکی نەتەوەییە، پێویستە ڕوبانەک دیاری بکرێ لەسەر هەموو پارچەکانی کوردستان، واتا مەسەلەی فەرهەنگی ئەمڕۆ چییە؟ لە چ بوارو لە چ قۆناغێک دایە؟ پرسیارێکی دیکەی من ئەوەیە بەڕای ئەم دوو مامۆستا گەورەیە ئایا ئەمڕۆ فەرهەنگی کورد هەیە یان نا؟ئەگەر هەبێ ئەوا لە قۆناغی ئەمڕۆی کوردایەتیدا ڕۆڵیان چییە؟**

**پرسیارێکی دیکەم ئەوەیە کەوادیارە بەنسبەت بیروباوەڕ یان فیکری نەتەوەیی ئێمە هەمووومان دەزانین ئەمڕۆ لە تەفگەریی سیاسی کوردیدا ئاستەنگیەک هەیە، ئایا ڕۆڵی ڕۆشنبیری کورد چییە؟**

**سەرۆ قادر: مامۆستا مەسعود، کاک سەلاح بەدرەدین پێی وایە کە تێڕوانینی جەنابت و مامۆستا شوکر پتر پەیوەندی بە کوردستانی عێراق و بە مێژووی فەرهەنگیەوە هەبووە لە کوردستانی عێراق، مامۆستا سەلاح بەدرەدین گلەیی ئەوەتان لێ دەکاو دەڵێ تێڕوانین و بیروڕاکانتان هەموو کوردستانی نەگرتەوە، مەبەستی کوردەکانی سوریا و تورکیا و کوردەکانی ئێران و...هتد یە.**

**مەسعود محەمەد:** قسەکان ئەوەی دەخواست ئێمە نەهاتینە سەر ئێران و سەر کوردی تورکیا و مەسەلەی ناکۆکی نێوان ئەودیو و ئەودیو، لەنێوان ئێرەو لە نێوان ئۆجەلان و ئەوشتانە...

**سەرۆ قادر:** هەروەها مامۆستا سەلاح بەدرەدین پێی وایە لەو لێکۆڵینەوە مێژووییەی کە لەسەر مێژووی فەرهەنگ ومێژووی رۆشنبیری کوردی بە تێکڕا کرا، ئێوە تەنیا لەچوار چێوەی کوردستانی عێراقدا مانەوە.

**مەسعود محەمەد:** لە راستیشدا هەر وابوو.

**سەرۆ قادر: مامۆستا شوکر جەنابت دەڵێی چی؟**

**شکورمستەفا:** قسەکەی راستەو زۆر مەمنونی کاک سەلاح بەدرەدینم کە ئەوەی وەبیرهێنایەوە. فەرهەنگی کوردستانی عێراق،بەشێکە لە فەرهەنگی تێکرای کوردستان ، بەڵام ئەو کەوشەن و سنورە درۆزنە زاڵمانەی کە لەنێوان پارچەکانی هەموو کوردستاندا دروستکراوە، وایلێکردووین جاروبارە گوێمان لە دەنگی یەکدی نەبێ. من زۆرم پێخۆشبوو لە قامیشلیەوە گوێم لە دەنگی کاک (سەلاح بەدرەدین) بوایەکەبە تەلەفۆن قسەی لەگەڵ کردباین، بەداخەوە...

**سەرۆ قادر:واتاپارچە پارچە بوون وایکردووە کە ئێمە ئاگامان لە حاڵی یەکدی نەبێت؟**

**شکورمستەفا:** بەڵی ئەوەهۆکارێکی گەورەیە، بەڵام پێم وایە هەموو کوردێکی خوێندەوار و رۆشنبیر لە هەر جێگایەک بێ ئەمرۆ کار بە رادەیەک گەیشتووە پێم وایە هەموو هەست بەلێدانی دڵی یەکدی دەکەین، هەست بەوەدەکەین کە خەڵکی یەک کوردستانین، کوردستانێک هەیە تەنیا ماوەتەوە ئەوەسنوورەجوگرافیەی کە هەیە .

**سەرۆ قادر: دەگەڕێمەوە بۆپرسیارەکانی مامۆستا(سەلاح). مامۆستاپرسیاری دووەمی مامۆستا سەلاح بەدرەدین ئەوەبوو کە لەڕوانگەی جەنابتەوە رۆشنبیر لە مرۆی کوردستاندا کێیەو چ ئەرکێکی بە ئەستۆوەیە؟**

**مەسعود محەمەد:** پێی ناوێ من بێم پێناسەی رۆشنبیر بکەم، هەموو کەسێک کە شێت نەبێ و دەمارگیر نەبێ و ئەخلاقێکی رێکوپێکی هەبێ و ئینسافێکی هەبێ و...ئەوە رۆشنبیرە.

**سەرۆقادر: ئەرکی چییە؟**

**مەسعود محەمەد:** زۆر بە داخەوە ،ئەرکەکەی بۆخۆی ناتوانێ بیکا بەشتێکی کارا، شتێکی ئیشگوزار ، واقیع بگۆڕێ. ئەو هەر ئەوەندەی پێیدەکرێ بڵێ خراپە مەکەو چاکە بکە. ئەوەی بەچاکی دەزانێ هەر ئەوەندەی پێدەکرێ دەریببڕێ ،پێیناکرێ خەڵکەکە بە کردنی کارێک ناچار بکات. ناتوانێ ملی ئەو خەڵکە بگرێ و بڵێ ئەوە بکەن، ئەوە مەکەن. تەنیا ئەوەندی پێ دەکرێ رای خۆی دەربڕێ. ئەگەر رایەکەی شاردەوە ترسنۆکە، یان یاخود دەتوانین بڵێین بەخیلە. ئەوەی رای خۆی دەردەبڕێ مانای ئەوەیە ئەرکی خۆی جێبەجێ کردووە.چونکە ئەگەر هات و ئەو رۆشنبیرانە بە کۆبوونەوەیی قسەیانکرد دەبنەوە حزب، ئەوەش نابێ.

**سەرۆقادر: بێگومان.**

**مەسعود محەمەد:** واتا ئەگەر نەبنە حزب خراپ دەکەن، مادام لێیان داوا دەکەین یەکدی بگرن.

**سەرۆقادر:واتاحزبمان لێیان دەوێ!**

**مەسعود محەمەد:** وای لێدێ ئەدی، چونکە ئەوە دەردەچێ...

**سەرۆقادر:مامۆستا شوکر ئەگەر ئەو پرسیارە ئاراستەی جەنابت بکەین.**

**شکورمستەفا:** من رەنگە وەکو مامۆستایەک تەعریفی رۆشنبیر بکەم.

فەرهەنگ سێکوچکەیەکە بۆ هەموو میللەتێک لە هەمووقۆناغێکی مێژوودا کە بریتییە لە فەلسەفەو زانست و هونەر. واتا فەرهەنگ لەو سێکوچکەیە ناچێتەدەر.ئەمەیانم وەکو بنەمایێک هێنایەوە . ئەوجا چۆنی پێناسە بکەین، هەر مرۆڤێک بتوانێ پێداویستیەکانی قۆناغە مێژووییەکەی خۆی ،واتا ئەو سەردەمەی کە تێیدا دەژی ،بە زمان یان بە شکڵی هونەرە جوانەکان یان بە هەرشتێک کە گوزارشت لە پێداویستی هەنوکەیی و جەوهەری راستەقینەی قۆناغەکەی خۆی بکات،دەربڕێ .بتوانێ بە شێوەیەکی فەلسەفی، زانستی و هونەرییانە وەڵامی پێشهاتە ئابووری وکۆمەڵایەتی و سیاسیەکان بداتەوە ،ئەوا بەمەدەڵێن فەرهەنگ و بەکەسەکەش دەڵێن رۆشنبیر.

**سەرۆقادر: ئەرکی چیە ؟**

**شکورمستەفا:**بەنسبەت میللەتی کوردەوە، جگە لەمیحوەرێکی بنەڕەتی کە ئەویش رزگاری نەتەوەیی ورزگاربوونی نیشتمانییە، بەلای منەوە هیچ شتێکی دیکەی نیە.

**سەرۆقادر: مامۆستا پێتوایە پێش پەیدابوونی ئایینی ئیسلام کورد هیچ فەرهەنگێکی هەبوبێت؟**

**مەسعود محەمەد:** وەکو میللەتێک ،ئەوفەرگەنگەی کەلەناو میللەتێکی پێش ئیسلامدا هەبووە ،لە ناو کورددا نەبووە. هۆیەکەشی دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کە کورد پێش ئیسلام دەوڵەتی نەبوو، ژێر دەستی ساسانیەکان بوو. ئەڵبەتە میللەتێکی ژێردەستەی میللەتێکی گەورەتر، مومکین نیە بچێتە ریزی لە خۆگەورەترەکە.

بەلای کەمەوە ساسانیەکان (٥٠)ناوەندی شارستانی فەرهەنگی ـــ سەربازییان هەبوو کە کوردەکە زۆر زۆر بەداخەوە، لەوانە زۆر زۆر داتەکابوەوە.ژێر دەستەی دەسەلاتێکی زۆر دڵڕەق بوو. تەنانەت دەسەلاتدارەکانیان شەوی بوکێنی کوردەکانیان بۆخۆیان دانابوو.ئایین و دنیا لەدەست ساسانیەکان بوو. بەلام عەرەبەکان هاتن وتێکیاندا .سەد جار(الحمد لله) کە تێکیاندا .بەم پێیە ساسانیەکان خۆشیان بوونە ژێردەستە و کوردەکە حەسایەوە .

**سەرۆقادر: مامۆستا (شکور)سەبارەت بە هەمان بابەت مامۆستا (مەسعود محەمەد)تاوتوێی ئەو بابەتەی کردکەپێش ئیسلام، کورد نەکیانی هەبووە نەفەرهەنگ، وەک من تێی گەیشتم مەبەستیشی ئەوە بوو کە ئێمەشتێکی بەجێماوی ئەوتۆمان لەو کاتەوە نیە کە بتوانین ئەمرۆ لەسەری بوەستین.**

**شکورمستەفا:**تەنیا ئەوەندە دەڵێم ،لە حەقیقەتدا بۆ تەفسیری مێژووی میللەتێک، ئێمە دوو رێگەمان لە پێشە ؛یان تیۆری مادی مێژوو کەکۆمەڵگا لە قۆناغی جۆراوجۆر گەشە دەستێنێ و لە چیەوە بۆ چی ئەوە ئاشکرایە. رێگایەکی دیکە هەیەئەویش تەفسیری مێژووی میللەتان لەسەر بنەمای پەیدا بوونی ئامێرەکانی بەرهەم هێنان لە عەقڵی چاخی بەردەوە کە دوایی دەگاتەچاخی مس وئاسن

و......هتد،كه كۆمەڵگاكان پێی پێشدەكەون. بە هەردوو ڕێگاكە میللەتێک هەبووە ناوی كورد بووە .جا ناوەكەی كورد بووە یان بە قەردابووە،قاردابووە،گوتێ بووە، لۆلۆبووە یان لۆبی بووە...ئەوەیان گرنگ نییە. تەنانەت قسە لەوەش هەیە كە لە زەمانی (تۆفانی نوح)دا كە كەشتیەكەی (نوح) لەسەر چیای ئارارات ،چیای گۆتی ،چیای گۆتۆ، هەردیارە وڵاتی كورد بووە دەگەنە ئەوێ كەشتیەكە دەنیشێتەوە ،وڵاتێكی لێ بووە،مەلیێكی لێ بووە .تەوراتیش باسی دەكا كە گوایە پاشاكەیان ناوی كوردۆین بووە و بە زمانێكیش قسەیان دەكرد نە فارسی بوو نە عەرەبی. پێشینە زۆرن بۆ ئەوەی كە بڵێین كورد هەبووە و دوایین شت ئەوەیە: ئایاكورد مێدیەكانن، مادەكانن یان پێش ئەوەی مادەكان بێن كورد هەبوون .لە(زامبوا) كە لە شارەزوورەوە دەست پێدەكا گەرمیان و كەركوك و... یا مەنتیقەی زاگرۆس، زاگرۆس یەعنی پشت گۆرانەكان، وەكو زاكابكاس یەعنی پشت قابكاس(گۆ)یەعنی گۆران .كورد پێیان دەڵێن گۆران تەعبیرەكە لەوەوە هاتووە، ئەو میللەتانە ناویان هەن.(مینورسكی) رەئی وایە پێش ئەوەی مادەكان بێن ،دوو میللەت هەبوون لە كوردستاندا بەتایبەتی كوردستانی باكور. ئەو دوو میللەتە زمانیان زۆر لە یەكدییەوە نزیک بووە هەروەک ئەمڕۆ چۆن(بادینان) و (سۆران) زمانەكەمان كرمانجیە. دەڵێ ئەو دوو میللەتە كورد بوون زمانەكانیان لەیەكەوە نزیک بوون. ئەوە قسەكەی وادەگەیەنێ پێش ئەوەی مادەكان بێن، وجودیان هەبووە. رەنگە كورد لە مادیش كەوتبێتەوە وكوردیش بووبن بەماد. ماوەی ئەو(١٨٠) ساڵە كە حوكمیان كردووە تێكەڵیەک بووبێ. بەڵام دەمەوێ یەک شت بڵێم، قوربان ئێمە توانیومانە بەدوای میللەتەكەماندا بگەڕێین و ئاساری میللەتەكەمان كەهی (٢-٣) هەزار ساڵ لەمەوپێشن لەشاری (كەركوک) ،(سولەیمانی)،(كۆیە) ،(هەولێر)بدۆزینەوە، بەڵام نەمانوێراوە باسی ئەوە بكەین كە ئەوە هی كوردە. هەر یەک لە وڵاتە داگیركەرەكان ،كردوویانن بە موڵكی خۆیان.

**سەرۆقادر: ئەگەر بەشی خۆمانی خۆمانی لێ جیاكەینەوەكاریكی سەختە.**

**شكورمستەفا:** كۆسپ و لەمپەر یەكجار زۆرە. فەرموو دەرفەتێكم بۆ دروست كە بە هەموو كوردستانی گەورە،بە دوای شوێنەوار دا بگەڕێین. ئەوە چەند ملیاری دەوێ ،چەندكاری دەوێ ،چەند پسپۆڕی دەوێ! ئەوە چۆن ئەو كارە بكەین تابیسەلمێنین كەوا كورد پێش دە هەزار ساڵ بوونی هەبووە. تۆدەبێ بە دەلیلی مادی بیسەلمێنی خۆ بەوە نابێ، كابرابێ كتێبێكی نووسیوە رەنگە خۆ كارێكی چاكە ،بڵێ لە ساڵی ئەوەندە هەزار یا دەهەزار ساڵ لەمەوبەر لە فلان ناوچە ئاوا ژنیان دێناو ئاوایان دەكرد و.. ئەوەش بۆخۆی دەلیلێكە، بەڵام جارێ ئەو دەلیلە چەند راستە؟

مێژوو و كاری مێژوویی كۆمەڵێ یاسا ورێسای هەیە. من پرسیارێكی دیكە دەكەم ئەی (یۆنان) لە زەمانی(سوقرات) و ئەوانە پێش هەموو دنیا نەكەوتبوون! ئەدی بۆ ئەمڕۆ هیچ نین! (یونان) لەچاو فەرەنسا و ئیتاڵیاو وڵاتە پیشەسازییە گەورەكان هەر وجودی نیە . كەوابووبۆ گەیشتن بە راستییەكان زۆرمان پێدەوێ .پێویستیمان بەسەروەت وكیانی سیاسی و دەوڵەتە. پێموایە مەسەلە مەسەلەی ئیمكانیاتەو ئەوەیە ئێمە دەكرێ بێین بگەڕێین خۆمان ساغ كەینەوە. خۆ بەقسە نابێ، وەڵڵامن زۆرم پێ خۆشە،بەڵام عەجەبا ئەمە بەقسە دەكرێ؟

**مەسعود محەمەد:** بەقسە ئاسانە.

**شکورمستەفا:** بەڵێ شت بەقسەئاسانە.

**سەرۆقادر: مامۆستا (مەسعود محەمەد)خەڵکێک قسە یان نووسینەکانت وا تەفسیر دەکا کە گوایە ئەو کەسانەی کە تۆ بۆیان دەنووسی لەوانەیە زیاتر کاربەدەستان و دەست رۆیشتوان بن.تا چەند جەنابت لەگەڵ ئەوە دای؟ئایالەکاری رۆشنبیریدارووی قسەت لەخەڵکی عامەیە! یان خەڵکی تایبەتی ونوخبەیە؟**

**مەسعود محەمەد:** نوخبەو موخبە لە گۆڕێ نیە،من لە پێناو قەناعەتی خۆم دەستم لە هەموو دنیا بەرداوە.سەرانی چەندین دەوڵەتی ئەم رۆژهەلاتی ناوەڕاستەو لەوانە جەمال عەبدولناسر و شای ئێران بانگهێشتیان کردوومەو نەچووم،سەرەڕای ئەوەی کە نانیشم نەبووە.

ئەوەی دەیڵێم بۆئەو حەقیقەتە موتڵەقەی لای خۆمەوبۆهیچ کەسێکی دیاریکراو نیە. بۆ حەقیقەتە بۆ ئەو کەسانەی کە تێدەگەن ،کە تێناگەن بڵێم چی! کە گوێنادەنێ بڵێم چی. من پێش خەڵکەکە زانیم ستالین تاوانبارە، کە دەیان پەرست بڵێم چی. هەزار جنێوم بۆ هاتووە.

**سەرۆقادر: مامۆستا شکورئەگەر هەمان پرسیار لە جەنابت بکەین،جەنابت لە نووسین ولە کاری رۆشنبیری دا پتر چاوت لێیە کار لە کام بەشی کۆمەڵی کوردی بکەی؟ رووی قسەت لە کێیە؟**

**شکورمستەفا:** حەز دەکەم هەموو کەس لێم تێبگا.مەسەلە مەسەلەی هونەرە لە نووسیندا. تۆ ئەگەر هونەرمەندی چاک بی ،هەموو کەسێ تێت دەگا. ئەگەر خوێندەواری چاک بی، دەڵێ نازانم ئەگەر تەشی رێس تەشی رێس بێ بەکلکی کەریش دەیرێسێ! قوربان مەسەلە تەشی رێسیە. تۆ ئەگەر تەشی رێسی چاک بی، پێم وایە هەموو کەسێ تێت دەگا.

**سەرۆقادر:، چ شتێک ماوە کە بوارمان نەدابێ یان پێتان وایە دەبی بگوترێ؟**

**مەسعود محەمەد:** قسە گەلەک زۆرن رەنگە لەو دانیشتنە ناو ناوە رایێکمان دەربڕیبێ و پێمان وایە ئەو رەئیە لەو دەمەی مەعقول بووە ،بەلام دوایی چووینەتە سەر رایەکی دیکە رەنگەلەم دانیشتنەماندا تووشی شتی واش بووبین .

**سەرۆقادر: مامۆستا شکور، ئەگەر جەنابت شتێکت هەبێ.**

**شکورمستەفا:** من هەر ئەوەندە دەڵێم ؛ئەو قسانەی ئێمەی ان غەیری ئێمە، بە هەموو ئیحترامێکمەوە، بۆ تەواوی خوتەباو مەلاو مامۆستایانی ئیسلام کە هەزارو چوارسەدو قسور ساڵە خوتبە دەخوێننەوە بۆ موسڵمانان ، ئینشاالله ئەو خوتبانە کاریان تێدەکا بۆ ئەوانەی نوێژیان لە پشتەوە دەکەن وگوێ لە خوتبەکانیان دەگرن، بەلام وادەردەکەوێ هێشتا هەر خەڵک پیاوخراپی دەکا،لەگەڵ ئەوەی هەموو جومعانیش دەچێتە نوێژەی جومعەو گوێ لە خوتبەش دەگرێ و...

ئینشاالله خەڵک تۆزێ زیاترگوێ لە قسەکانی ئێمە دەگرێ و واش نەزانن ئێمەش هەموو شتێکین ئیمەش وەک مامۆستا مەسعود گوتی وەکو ئەو خەڵکەین. من خۆم مامۆستام و حەز دەکەم رۆژ تا ئێوارە وەختم هەبوایە بچوبام دەرسم بە منالی کوردگوتبایەوە.

**سەرۆقادر:** وێرای سوپاس بۆ هەردوو بەڕێزان مامۆستا (مەسعود محەمەد نووسەرو خاوەن فکری ناسراو و ئەدیب و خاوەن فکری ناسراوی میللەتەکەمان مامۆستا(شکور مستەفا) ، مەبەست لەو دانیشتنە ئەوە بوو کە جارێکی دیکەلە ڕێی دوو لە مامۆستا گەورەکانی ناوفەرهەنگی کوردی باسێک لە هەندێ لە پرسەگرنگەکانی رۆشنبیری کوردی بکەین کە ئەمڕۆ لە قۆناغی بەرەو دروستکردنی کیان و بەرەو دروستکردنی ماڵی کوردی بە شێوەیەکی سەربەخۆو بە شێوەیەکی ئەوتۆ کە کورد خۆی ژیانی خۆی بەڕێوەبەرێ لە هەموو رووییەکەوە، لە رووی ئیداری، ئابوری وفەرهەنگی کەلە بوارە هەرە گرنگەکانی ژیانی هەر میللەتێکن. مەبەستمان بوو هەندێک لەو پرسانە باس بکەین وئەم باسانە باسی موتڵەق نین ،تەنها بیروڕای دووله رۆشنبیرانی گەورەی وڵاتەکەمانن و ئەمە دەردەخات کە رۆشنبیرانی ئەم وڵاتە چەند کاریگەرییەتیان بەسەر بەردەوام بوونی ژیان بەشێوەیەکی ئاسایی و هەوڵدان بۆ گەیشتنی میللەتەکەمان بەشەمەندەفەری پێشکەوتن لەمڕۆی دنیادا هەیە.

**مەسعود محەمەد:** هەرچی گوتراو هەرچی دەگوترێ هەمووی ناکاتۆزقاڵێک لەو حەقیقەتەی کە کورد دەبێ بەر لە هەموو شتێک کیانێک بۆ خۆی دروست بکا،چونکە بەبێ کیان هیچ ناکرێ.

## شكور مستەفا:

# سنورێک لە نێوان ئازادی و بەرەڵاییدا هەیە

*** مامۆستا ،چەند رۆژێکی دیکە [نیسانی ١٩٩٨] جەژنی (١٠٠) ساڵەی رۆژنامەنووسی کوردی لە کوردستان دست پێدەکات ، جەنابت یەکێ لەنوسەرو رۆژنامەنووسە بەناو بانگەکانی ئەم وڵاتەی، رۆڵی بنیاتنەری رۆژنامەنووسی کوردی و رۆڵی خانەوادەی بەدرخانیەکان لە مێژووی فەرهەنگی کورددا چۆن هەڵدەسەنگێنی؟**

** من خۆم زۆر بەکاری رۆژنامەنووسییەوە خەریک نەکردووە، بەڵام پارساڵ کتێبێکم دەست کەوت بە ناوی **بەدرخانیە زیرەک وتاریەکان و چەند بەڵگەیەکی کۆبوونەوەکانی یەکەم کۆمەڵەی خانەوادەگی و خێزانیی بەدرخانیەکان لە ئەستەمبول**، ئەو کتێبە بەنرخە هی کاک (محەمەد سەیفون)ە کە بە نازناوی (مارلیسانی) زۆر دەنوسێ، بۆ خۆی کوردی زازایە، بە کرمانجی سەرو دەنوسێ.

لەم کتێبەدا نزیکەی (٤٤) بەدرخانی هاتوونە نێو چالاکی و کاری رۆژنامەگەرییەوە، ئەوانە لەهەموو مەیدانەکانی کارگێری دەوڵەتی عوسمانی، لە ئەدەبیات، لە رۆژنامەنووسی و سیاسەت و زۆر شتی دیکەدا رۆڵی گەورەیان گێڕاوە. ئەوەی کە دەتوانم لە سەرووی هەموویاندا نێوی بێنم (مەدحەت بەدرخان)ە کە سەرپەرشتی رۆژنامەی کوردستانی کردووە، پتر لە قاهیرە ئەو رۆژنامەیەی دەرهێناوەو ماوەیەکیش لە سویسرا،دوای ئەو، حەمەد ئەمین بەدرخان، ساڵح بەدرخان و کامیل بەدرخان وکۆمەڵێک ناوی دیکە دێن کە هەرهەموویان لەکاری رۆژنامەنووسیدا زۆر ئاشکران.

ئەو کۆشش و چالاکیە رۆژنامەنووسییە لەسەرەتای (١٩٠٨)ەوە دەستی پێکردووە، هەر ئەو برادەرە (محەمەد سەیفون) کتێبێکی لەبارەی رۆژنامەنووسی کوردیەوە لە چاپ داوە لە ساڵی (١٩٠٨)ەوە تا (١٩٨٤)ە وا بزانم بەرەسم و ناونیشان و سەردێرو بابەت و زۆرشتی دیکەوە ئەو رۆژنامانەی کە لەو ماوەیەدا دەرچوون، هەمووی لە کتێبێکدا بڵاو کردۆتەوە بە تورکی. ئەوە بۆ خۆی نیشانەی ئەوەیە کە کورد لە مێژە خەریکی رۆژنامەنووسیە، بەڵام بەداخەوە زمانی رۆژنامەنووسی لەم ماوەیەدا بەزۆری بەزمانی تورکی بووە، خوێندەواری کورد ئەو وەختە هەر بەتورکی خوێندوویانە. لە پاشان وردە وردە بەکرمانجی سەروو بە سۆرانی خۆشمان شت لە کوردستاندا بڵاوکراوەتەوە. جا لەو کتێبەدا

کە تەرجەمەم کردووە نمونەی زۆری تێدایە و دەبینین لە رۆژنامەی کوردیدا زۆرشت سەبارەت بە دەوڵەت، مافی مرۆڤ، ئەدەبیات ، زمان، هونەرو ژیان و گوزەرانی خەڵکی کوردستانەوە، بلاو کراوەتەوە .

*** ئەم خانەوادەیە لەسەرەتادا سەرکردایەتی بەکردەوەی بەشێک لە شۆڕشی کوردیان دەکردو دوای لەژێر بارودۆخێکی دیاریکراودا گواستیانەوە بۆ بواری رۆژنامەنووسی و فەرهەنگی، واتا خانەوادەی بەدرخانیەکان راستە هەتاسەر لەناو بزوتنەوەی سیاسی ئەوکاتەدا نەمان، بەلام لەناو بزوتنەوەی رۆشنبیری کوردستاندا تا دواکەسی خێزانیان بۆ کورد و رۆشنبیری کوردی رۆلی پێشەنگیان بینی. تۆ لەم رووەوە چۆن رۆلی ئەو خێزانە هەڵدسەنگێنی، نەک وەکو خێزان، بەڵکو وەکو ئەم کۆمەڵە کەسەی کە بەتێکرا لە بواری سیاسیەتەوە گواستیانەوە بۆ سەرکردایەتی رۆشنبیری کوردی، بەلام لە مەدارێکی دیاریکراودا؟**

** ئەوە بۆ خۆی شتێکی زۆر سروشتیە، چونکە ئەگەر سەیر بکەین دەبینین لە هەزارو هەشت سەدو چل و ئەوانەوە بەدرخان دەوڵەتێکی دروست کردووە. ئەو دەوڵەتەش قەڵەمڕەوی گەیشتۆتە نزیک رەواندز . دەوڵەتەکەی پاشای کۆرە لەلای دیکەڕا تا ورمێ چووە و تا رۆژئاوای دیاربەکر فرەوان بووە. ئەم دەوڵەتە، لەباری سیاسیەوە بۆ خۆی لەو سەردەمەدا شتێکی گەورەیە بۆ میللەتی کورد.ئاشکرایە کە بەدرخانیەکان جگە لە مەیدانی رۆژنامەگنووسی لەبواری دیکەشدا کاریان کردووەو سەر کەوتووش بوونە. بۆ نمونە سێ چوارێکیان لەمیسرگیرساونەتەوە، ئەحمەد بەدرخان یەکێک بووە لەوانەی کە چەندین فیلمی سینەمایی دەرهێناوە، لەیلا بەدرخان نمونەی هونەرکاری هونەرمەندێکی کوردە کە توانیویەتی ببێتە سەرۆکی بالییەی ئەڵمانیا.

*** مامۆستا هەر لەبواری رۆژنامەنووسی کوردیدا، ئەمڕۆ تەکنیک و ئەو جۆرە پێوەندییە گشتیانەی کە بەسەر دنیادا زاڵن وئەوەی کە پێی دەگوترێت جیهانگەرایی بوارێکی یەکجار زۆر فراوانی بۆکاری رۆژنامەوانی خوڵقاندووە . جاران تابەر لە (١٠) ساڵ پتر لەبواری ئەدەب و فەرهەنگ و هەندێ جار بواری دیکەی زانستی زاڵ بوون، بەلام دنیای ئێستا پتر هانی رۆژنامەنووس دەدات و رۆژنامەنووسی بۆتە مۆدی ئەمڕۆ و پتر لە هەموو شتێکی دیکە کاریگەرییەتی بەسەر پێشکەوتنی کۆمەڵایەتی و ئابورییەوە هەیە. پێتوایە لە کوردستاندا رۆژنامەنووسی بە مانای هاوچەرخی ئەمڕۆ، هەیێ وئایا تۆ لە کوردستاندا هەست بەبوونی رۆژنامەنووس دەکەی؟**

** بۆ خۆی رۆژنامەگنووسی بەمانا سیاسیەکەی دەسەلاتی چوارەمە .لە رووی سیاسیەوە رۆڵێکی گەورەدەبینێ. ئەگەر ئامانجی رۆژنامەنووسیش گەیاندنی حەقیقەت بێ بەهەموو ئینسانێک لە ئاستێکی ئاسان و سانا و بێ گرێ و گۆڵدا، بێگومان ئەوکاتە رۆژنامەنووسی رۆڵی خۆی دەبینێ.بەلام سەبارەت بەوەی کە ئایا لە کوردستاندا رۆژنامەنووسی گەیشتۆتە ئەو ئاستەی کە لێی چاوەڕێ دەکرێ، ئەوا من پێموایە رۆژنامەنووسی یان هەر شتێکی دیکەی شارستانیانەی ئەم سەردەمە لە کوردستاندا لەبنەڕەتدا بەباری سیاسی میللەتەکەمان، ژیان و گوزەرانی خەڵکی کوردستان و سەرکردایەتی میللەتی کوردەوە بەستراوەتەوە.

*** ئەگەر بکرابایە بە قوولی باست لەو مەدارە فرەوانەی کە لە کوردستاندا رۆژنامەنووسی بەژیانی خەلک وئاستی فەرهەنگ و رۆلی سەرکرادایەتیەوە بەستۆتەوە،بکردبایە.**

** من ئەوانە هەمووی بۆ خۆی وەکو تابلۆیەک دەبینم کە ئەم تابلۆیە هەمووی پێوەندیان بەیەکەوە هەیە ، هەریەکەیەیان کارگەرییەتی بەسەر ئەوەی دیکەیانەوە هەیە . بەتایبەت سەرکردەی سیاسی کە دەبێ لەم قۆناغەی ئێستادا زۆر زیرەک و چاپوک و بەکار بێت . ئەو سەرکردایەتیە ئەگەر توانی خۆی بگەیەنێتە هەموو مالێک هەموو کەسێک ولە نزیکەوە هەولی ئاگاداربوون لە گیروگرفتی خەلکی دا .ئەوا ئەوەدەم پێموایە ئەم سەرکردایەتیە زۆر چاک دەچێتە نێو دلی میللەتەوە و رادەی جەماوەرییەتی زیاد دەکات.

***لە دواکەوتویی رۆژنامەنووسی کوردی لە کوردستاندا تا چەند سەرکردایەتی سیاسی لە کوردستان بە بەرپرسیار دەزانی؟**

**: رەنگە زۆری بخەمە ئەستۆی سەرکردایەتی

*** بۆ؟**

**رەنگە سەرکردایەتی لە زۆر رووەوە، پێویستیەکانی کاری رۆژنامەنووسی دابین بکات، بەلام ئایا سەرکردایەتی بۆ خۆی دوای رەنگدانەوەی کارەکانی دەکەوێ. دوای ئەوە ئایا بەرنامەی سیاسی سەرکردایەتی لەشتە زۆر گرنگەکاندا رەنگدەداتەوەو ئایاهیچ حەق و حیسابێک هەیە؟ دەبێ سەرکردایەتی سیاسی پرۆگرامێکی هەبێ بۆ ئەوەی لە خەلک بگەیەنێت کە کوردایەتی ئەم قۆناغە چۆنە،و پێویستە خەلک چۆن کوردایەتی بکات.

***واتا پێت وایەدەسەلاتی سیاسی، لەپێدانی ئازادی و بوونی ئازادی کە بەشێکی زۆر گەورەیە لەکاری رۆژنامەنووسیدا، کەم و کوری هەیە یان کەمی داوە یان هەر نەیداوە؟**

** من پێموایە ئازادییەکی زۆری داوە، بەلام دەبێ لێپرسینەوەی هەبێ،چونکە ئازادی ئەوە نیە من وتۆ بە ئارەزوی خۆمان چیمان ویست بیلێین و چیمان ویست بیکەین. ئازادی واتا ئەنجامدانی ئەو کارانەی کە پێویستە ئەنجام بدرێن.

***بەس ئەمرۆ لەدنیادا دەلێن رۆژنامەنووسی بە هەموو بوارەکانی ـــ راگەیاندن ـــ جاری وا هەیە دەسەلاتی سیاسی ناچار دەکات لەسەر رێبازێک بروات، یان جاری وا هەیە راگەیاندن وادەکات هەندێ لە دەولەتەکان هەلوێستی نوێ لە مەر شتێک وەربگرن و زۆر جاریش هەلوێستی مرۆیی.هەروەها رایەک هەیە کە راگەیاندنی ئەمرۆی دنیا بەشێوەی گشتی لە ورووژاندنی بابەتەکاندا بە سەهو ناچێ.کەواتا لەمرۆی دنیادا هیچ سنورێک بۆ ئازادی رۆژنامەنووسی رەوا نیە، بە پێچەوانەی ئەو قسەی کەواراگەیاندن تەعبیر لە رای دەولەتێک بکات.**

** ئازادی شتێکە کە لەهەموو قۆناغێک و بوارێکدا پێویستە، بەلام لەگەل ئەوەشدا دەبێ پەرژینێکی هەبێت. دەبێ کەسێک هەبێ کە بزانێ ئەو ئازادییە چۆن بەکار دێت .هەروەهادەبێ خەلک فێربکرێ چۆن ئازادی بەکار بێنێ، چونکە هێشتا ئێمە فێر نەبوینە ئازادی بەکار بێنین و لەزۆر بواردا گرفتمان هەیە.



*** بەشی دووەمی پرسیارەکەم ئەوە بوو ، ئایا لە کوردستاندا هەست بەبوونی**

**رۆژنامەنووس ــ بە مەفهومی رۆژنامەنووس ــ دەکەی؟**

**✱** ئەگەر مەسەلەکە لەچاو رۆژنامەنووسی ئەورووپاو غەیری خۆماندا لێک بدەینەوە ،بارودۆخی رۆژنامەنووسی وبوونی رۆژنامەنووس لە کوردستاندا، وەکو تروسکەی ئاگری جگەرەیەک لە تاریکە شەوێکدا دەبینم.

**✱ تۆ باست لەوە کرد، کە لەسەرەتای دەستپێکردنی کاری رۆژنامەنووسیدا، بەدرخانیەکان گرفتی زمانیان هەبووە و لەبەر نەبوونی زمانی کوردی پەنایان بردۆتە بەر تورکی. بە درێژایی ئەم (١٠٠) ساڵە گرفتی زمان لە کۆڵ رۆژنامەنووس و کاری رۆژنامەنووسی لە کوردستان، نەبۆتەوە و کارێکی زۆری کردۆتە سەر ئەم رەوشە.جەنابت هەوڵتداوە کەوا شتەکان بە لەهجەیەک بنووسی زۆربەی خەڵکی لێی تێبگەن. لەهەمان کاتدا شان بە شانی ئێوە کەسانێکی وەکو هەژاری موکریانی،کارێکی زۆرگەورەیان لەزمانی رۆژنامەنووسیدا کردەوە وشانازییەکی گەورە بۆ هەژاری موکریانی بەجێ ما کەوا لەدوای خۆی جگە لە بەرهەمەکانی، فەرهەنگێکی کوردی زۆر گەورەشی بەجێ هێشتووە. زمان لە رۆژنامەنووسی ئەمرۆی کوردیدا چەند گرفت یان کەرستەیەکی لەبارە، ئایا رۆژنامەنووس و رۆشنبیر ئازار نادات؟**

**✱** زمان نەک هەر زمانی رۆژنامەنووسییە، بگرە زمان، زمانی ژیانە، زمانی جوتیار، زمانی کرێکار، زمانی ئەفەندی و زمانی هەمووەرۆڤێکەو هەر کەسە بەشی خۆی لێوەرگرتووە. بەڵام ئەگەر بتەوێ زۆری تەسک کەیەوە، ئەوا رەنگە لە رۆژنامەنووسیدا برێ زاراوەو شتیوا بەکار بێت کە لە مەیدانێکی دیکەدا بەکار نەیەت. بە گشتی من پێمواية زمانی کوردی چ بەشێوەی کرمانجی سەرو، و چ بەشێوەی کرمانجی خواروو، لەم (٥٠) ساڵەی دواییدا شان بەشانی یەکدی زۆر پێشکەوتوونە.

باسی هەژاری خوالێخۆشبووت کرد ، بەراستی هەژار رۆڵێکی زۆر گەورەی لە پالاوتنی زمانی کوردیدا هەبووە. بەتایبەتی شێوەزاری موکریانی کە شاعیرە کلاسیکیە گەورەکانمان لەبابەتی نالی و سالم و ئەوانە هەموو بەو شێوە موکریانە شیعریان گوتوە. هەژاری موکریانیش هەر پەیرەوی ئەم رێگەیەی کردووە. من بۆ خۆم ئەم زمانەم زۆرپێخوشە و هەر بەو بارەشدا شتم نووسیوە.بە گشتی لە کوردستانی عێراقدا زمانی کوردی لەزۆر بوارەمرۆییەکاندا، لە فیزیاو کیمیاو ئەوەی پێی دەڵێن بوارە زانستیەکان، هێشتا ماویەتی .ئەمەش هەر ئێمەی نەگرتۆتەوە، تورک و فارس و عەرەبیش هێشتا لە زۆر شتدا لۆقە دەکەن و لەدوای ئەورووپاوەن . دیارە ئەوەش خەتای ئێمە نیە و مێژوو وای لێکردوین کە دوا بکەوین ونەتوانین لەو مەیدانانەدا، وەکو ئەوان پێش بکەوین. من زۆر خۆشبەختم کە بتوانم لەزۆرشتدا بەکوردی بیر و راکانی خۆم دەربرم .

**✱ مامۆستا دوای راپەرین، قۆناغێکی نوێ لەژیانی میللەتی کورد لەهەموو بوارەکاندا دەستی پێکردوە .لەبواریفەرهەنگ و رۆژنامەنووسیشدا قۆناغێک بوو کە دەبوایە پتر لەهەموو بوارەکانی دیکە ئەو نوێیایەتیەی پێوە دیار بێ، چونکە بەدرێژایی کاری رۆژنامەنووسی لە کوردستاندا ،نەبوونی ئازادی ئاستەنگێکی یەکجار زۆر گەورە بووە لەبەرامبەر داهێناندا . کەچی بەپێچەوانەوە دوای راپەرین لەکوردستاندا ،داهێنان کەم بوەوە و چالاکی سەرهەڵدانی رۆشنبیری، بەمەفهومی ئەوەی کەوا دەبوایە پەل بۆ بەشێک**

**لەو ئێش و ئازارە مێژووییانەش باوێ کە نەیتوانیوە لە سەردەمی دیکتاتۆریدا چارەسەریان بکات. بەڵام بەپێچەوانەوە لەو شەش ساڵەی یەکەمی دوای ڕاپەڕین ،جۆرێ لە کوژانەوە و پاشەکشێ ڕوویداوە و هەندێ کەس پێیان وایە کە ڕۆشنبیرانی کورد نەیانتوانی لەگەڵ ئازادیدا بڕۆن. جەنابت ئەم دیاردەیە چۆن هەڵدەسەنگێنی؟**

* هەست دەکەم ئەوە شتێکی سروشتیە ،کاتێک سیاسەت هەموو دنیا دادەگرێ دەبێتە شتێک کە وەکو نان و ئاوی لێدێت، لەهەموو مەیدانێکدا خۆی دەسەپێنێ. ئەو دەم بوارەکانی دیکە دەکشێنەوە، کابرا حزبیەو دەیەوێ باسی حزب بکات، ئەوەی دیکەیان دەیەوێ باسی ڕێکخستن بکات ئەوانەش وەنەبێت لوغەتێکی تایبەتیان هەبێت،چونکە سیاسەتیش لوغەتی خۆی هەیە. سیاسیەت لوغەتێکی خێرا و کەم تەمەنی هەیەولە دوای خۆی هیچ بەجێ نایەڵێ ،واتا شتێکی وەکو شیعر، یان چیرۆکێک، یان داستانێک، دروست ناکات، شتێکە دەگوترێ و ڕۆژانە خەڵک دەیبیستن و دوایی لەبیریان دەچێتەوە.کاتێ سیاسەت دەبێ بەئاغا، ڕۆشنبیر دەنگی کپ دەبێت. ئەوەش وەنەبێ تەنها لە مێژووی ئێمەدا ڕوویدابێ . زۆرینەی نەتەوەکان ئەو حاڵەتەیان دیووە .بۆ نمونە،کاتێ(ئەمەوی)یەکان هاتنە سەرکار، قۆناغی فراوانخوازی و دنیا گیری عەرەبەکان نەوەستا . بەم پێیەش هەموو شتێ مەفهومی سیاسی وەرگرت. تەنانەت شیعریش لەم بازنەیەدا بوو. بە پێچەوانەوە کاتێک کە عەباسیەکان دێن سیاسەت ،تۆزێک کپ دەبێت، تەمەشا دەکەی لەسەردەمی مەئموندا فەرهەنگ و شارستانییەت گەیشتۆتە چڵەپۆپە.ئەمەش ئەوە دەردەخات کە لەم سەردەمانەدا ڕۆشنبیری پتر هەناسە دەدات. لەسەردەمی عەباسیەکاندا دەوڵەت فراوانی بەخۆیەوە دیت وسەقامگیر بوو. بەم پێیە دەردەکەوێ کە سەقامگیری ڕۆڵێکی بەرچاوی لە پێشکەوتندا هەیە و بە پێچەوانەوە باری فەرهەنگی لە ناسەقامگیریدا لە پلەی دووەم و سێیەمدایە.

*** زۆر لەوانەی کە ئێستا خۆیان بە مێژووی فەرهەنگ و ڕۆژنامەنووسی کوردیەوە خەریک دەکەن،پێیانوایە بە گشتی، بەخشینی ڕۆشنبیرانی کورد زۆر کەمەو کەمتر ڕۆشنبیری کورد لەگرفت و بوونی خۆی ورد دەبێتەوەوکەمتر بە ناخی خۆیدا دەچێتە خوارەوە. هەر بۆیەش لە ڕۆشنبیرانی دراوسێی ئێمەدا کەسانی وەک ئیسماعیل بێشکچی و زۆری دیکە هەن کەوا هەندێ کەس پێیانوایە لە خاوەن بیرو ڕۆشنبیرانی کورد پتر هەوڵیان داوە لە کۆمەڵی کوردەواری بگەن ورێوشوێنی بۆ دابنێن. ئەم دیاردەیە جۆرێکە لە لەخۆبێگانە بوون و سپاردنی مەسەلە ڕۆشنبیریەکان بە ڕۆشنبیرانی بیانی. بە ڕای جەنابت ئەم دیاردەیەی ناو ڕۆشنبیری کورد لە چیەوە دێ؟**

* جارێ ئێمە پێش ئەوەی قوتابخانەی عەرەبیمان بۆبکەنەوە و بە عەرەبی بخوێنین ، لە سەردەمی عوسمانیدا کە لە کوردستانی عێراق و تورکیا ولە هەموو کوردستاندا قوتابخانەی ڕەسمی نەبووە و نە بە تورکی و نە بە عەرەبی و نە بە فارسی نەمان خوێندوە. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا حوجرەی مەلاو فەقێیایەتی هەبووە، حوجرەی مەلا و فەقێ ، مەلای چاکی بۆ ئەو قۆناغە سیاسیەی کەکورد تێدا ژیاوە پەروەردە کردووە.بەڵام بۆچی ئەوانە مەلای چاک بوونە و لەبەرچی نێویان هەیە؟ لە پێش هەموو شتێکدا ئەم مەلایانە دوو شت فێربوونە: سەرەتا لە کەلەپوری میللەتەکەی خۆیان گەیشتوون وزانیویانە کورد فۆلکلۆری هەیە، فۆلکلۆریش زۆر شتە و بەم پێیە بە تەواوەتی چونەتە نێو میللەتەکەیانەوە، واتا

ئاگایان له میللەتەکەی خۆیان بووە ،تێگەیشتوون ئەوجا زۆر لە ئەدەبی فارسی نزیک کەوتونەتەوە.

*** پێت وایە ئەمانە توانیبیان کاریگەری لە فەرهەنگی کورد بکەن؟**

** مەبەستم ئەوە بووکە لەگەڵ ئەو هەموو مەلا چاکەی کەوا لە سەدەی هەڤدەهەم لە کوردستاندا هەبووە، ئێمە تەنیا ئەحمەدی خانی و مەلای جەزیری ونالی و سالم ومەحوی مان بۆ ماوەتەوە. ئەوانە هەموویان توانیویانە بچنە ناو میللەتەکەیانەوە ، ئەوجا لەسەر بنەمای تێگەیشتنیان لە کەلتوری میللەتەکەی خۆیان شتێکی تازە فێر بن.فێر بوونی فارسی وتێگەیشتن لە رۆشنبیری فارسی مەرجێکی سەرەکی بووە، چونکە نەک هەر کورد، بگرە تورکیش هەر فارسی فێربووە. کورد کەمتر شیعری بە عەرەبی هەیە، بەڵام شاعیرانمان بە فارسی شیعریان هەیە. بۆ نمونە نالی و شێخ رەزا شیعریان بە فارسی هەیە، بەڵام نەمبیستووە شاعیرێکمان شیعری بە عەرەبی هەبووبێ ،ئەگەر بووبێش شتێکی وانیە.هەست دەکەم ئەحمەدی خانی و نالی و سالم و مەحوی و ئەوانە ،بە تەواوەتی فەرهەنگی سەردەمی خۆیان هەڵمژیوە، بەڵام لەسەر پنجی کەلتورەکەی خۆیان نواندوویانە.

*** مەبەستی ئێمە ئەوەیە کە بۆ رۆشنبیرانی ئێمە نەیانتوانیوە جگە لە پێگەیشتن ،لە بواری گرفتی فەرهەنگدا ، دەنگ ئاراستەی رۆشنبیری گەلانی دەوروبەریش بکەن. واتا تۆ دەبینی یەکێکی وەکو ئیسماعیل بێشکچی لەناو رۆشنبیری تورکەوە دێ کار لەسەر رۆشنبیری کوردیش دەکات. ئەوە دەگەیەنێ کەرۆشنبیری کورد نەیتوانیوە چارسەری گرفتەکانی فەرهەنگی کوردی بکات بە شێوەیەکی فرەوان وبە جۆرێک کە بتوانێ ئەو چارسەرکردنە بکا بە دەنگێک و بۆ دەرەوەشی بنێرێ و ئاراستەی گەلانی دیکەیشی بکات. چونکە رۆشنبیرو خاوەن بیرەکانی گەلانی دیکە لە رێگەیفەرهەنگ و کاری فیکرییەوە هاتوونەتە ناو گەلەکەی ئێمە؟**

** پێموایە دەبێ ئێمە دوو شتمان لە بەر چاو بێت؛ یەکەمیان رۆشنبیر دەبێ.وریا بێت ،ئەو وریاییەش بە مەفهومێکی زانستی ،واتا لەو قۆناغە تێبگات کە تێیدا دەژییەت.هەروەها لە هەموو قۆناغێکیشدا هەندێ شت هەیە دەبێ ئەم رۆشنبیرە بیزانێ؛ بۆ نمونە دەبینین یەکێکی وەکو ئەحمەدی خانی گرنگترین کاری قۆناغەکەی ژیانی خۆی پێئەوە بووە کەوا هاوار بکا بۆ میللەتی کوردو ئەو هەموو میرو بەگ و ئەوانە کۆبنەوە تا دەوڵەتێکی مەرکەزی کوردی دروست بکرێت ، هاوار بۆ یەکگرتووی نەتەوەیی کورد دەکات ، بەمەش مەفهومی نەتەوەیی کوردی بە مانای خۆی هێناوەتە گۆرێ.

مانای ئەوەیە ئەم پیاوە توانیویەتی لەو قۆناغەدا رۆڵی خۆی ببینێ.دووەمیش، ئێمە خوێندەوارانمان لە کۆنەوە، فکریان بۆ ئەوە نەچووە خوێندەواری و رۆشنبیری بە مەسەلە کۆمەڵایەتی و سیاسی وئابوورییەکانەوە ببەستنەوە. ئەمڕۆ کاتی ئەوەیە کە رۆشنبیر لە نیگای کۆمەڵەوە سەیری هەموو شتێک بکات. کە شیعر دەنوسێ بزانێ بەشی کۆمەڵگای چەند تێدایە، کە شانۆیەک پێشکەش دەکا بزانی بەشی کۆمەڵی چەند تێدایە ،مشکلەی کۆمەڵی چەند تێدایە.

*** بەشێکی زۆر لە بەرهەمانەی کە جەنابت وەرتگێراونەتە سەر زمانی کوردی، دەبینین گرنگییەکی زۆر بە یەشار کەمال دراوە.هەموو نووسینەکانی یەشار کەمال و ئەوانەی**

**جەنابت گرینگیت پێداون بە زمانێکی دیکەی جیا لە کوردی، موعالجەی فەرهەنگی کۆمەڵی کوردەوارینە. ئایا جەنابت لەم روانگەیەوە بایەخت بە یەشار کەمال داوە یان هۆکارێکی دیکە هەیە کە خوێنەری کورد نایزانێ. یەشار کەمال چ شتێکە کە تۆ زۆربەی ژیانی خۆت بۆی تەرخان کردووە؟**

** من لە پەنجاکانەوە کەوتومەتە سەر ئەوە کەوا نووسینی ئەدەبیات، دەبێ شتێک بێ کە خەڵک حەزی لێی بێت. ئەوی بە عەرەبی و بە تورکیش دەمخوێندنەوە پتر لەو بابەتە بوون. ئیتر بەرێکەوت کەمن رۆمانەکانی یاشار کەمالم خوێندەوە ، باسکردنیی لە میللەتی کورد پتر رایکێشام. خۆم و کەسوکارم و گوند ومرۆڤەکانی کوردستانم لەو نووسینانەدا دەدیتەوە. بەلامەوە ئەو دنیایەی کە کاک کەمال باسی دەکا دنیای منە، دنیای خەڵکی بەد بەختە، دنیای خەڵکانێکە وەکو خۆی دەڵێ ئاسمانی مسەو دەوری ئاسنە، ئەرزە هەرچەند دەکا هیچی بۆ شین نابێ ،ئاسمانە هیچی لێ پەیدا نابێت. واتا ئەوەی دەمخوێندەوە باسی لە میللەتی کورد دەکرد، نەک تەنها میللەتی کورد، بگرە باسی لە سەرجەم گەلە زوڵم لێکراوەکانی دنیا دەکرد.

بۆیە سەرنجیان راکێشام و بوونە جێی بایەخم.

*** یەشار کەمال لای خوێنەری وڵاتی ئێمە، لە کوردستانی عێراق و لەوانەیە لە کوردستانی ئێرانیش کە بەم لەهجەیە، بە ئەلف و بێی عەرەبی دەخوێننەوە ، پتر لە رێی شکور مستەفاوە ناسرا. واتا خەڵک وادەزانی زمانی شکور مستەفا زمانی یەشار کەمالیشە. مەبەستم ئەوەیە زمانی یەشار کەمال زمانی تورکیە لە کاتێکدا کەش و هەوای نووسینەکان وکەسایەتیەکانی کوردین. خەڵکی کوردستان لە رێی شکور مستەفاوە یەشار کەمال دەناسێ .کاتێ زمانی یەشار کەمال کوردی نەبێ، دەبێ واسیتەیەک هەبێت تا میللەتی خۆشی بتوانێ بیناسێ؟**

** بە داخەوە من تا ئێستا یەشار کەمالم نەدیوە . تەنها بە وێنەدیتوومە. وەکو برادەرانیش بۆیان گێڕاومەتەوە کە دەیناسن پیاوێکی قسە خۆش و زۆر سادەو کرمانجە.

*** هۆی چیە کە بەرێزتان هەموو تەمەن و بەرهەمەکانی خۆت بۆ وەرگێڕانی کاری ئەدەبی و رۆشنبیریی یەشار کەمال تەرخان کردووە ،کەچی هەوڵت نەداوەبیبینی؟ هەوڵت نەدا یان نەتتوانی یان نەتویست ببینی؟**

** مەبەستم نەبووە بیبینم. هەرچەندە دووسێ جاریش چومەتە تورکیاو دەمزانی لە کوێیە، هەروەها لە دەرەوەی تورکیاش دەمزانی لە سویدە، زۆر کەسیش لەوێوە کاغەزیان بۆ دەنوسیم دەیانگوت ئەوە فلان کەس لێرەیە. هیچ رۆژێک بە خەیاڵم دانەهات کتێبێک لەو کتێبە وەرگێردراوانەی خۆی بۆ بنێرم. بۆ خۆشم نازانم لەبەرچی .تاقەتم نەبوو لە راستیدا. من پتر مەبەستم کتێب و قسە خۆشەکانیەتی.

*** زۆر کاری رۆشنبیری جەنابت بریتی بووە لە وەرگێڕانی بەرهەمی نووسەری گەورە. پێتوایە لە بواری وەرگێڕاندا ،لەناو رۆشنبیری کوردا بۆشاییەک هەبووە لەبەر ئەوە هەموو کاتی خۆت بۆوەرگێڕان تەرخان کردووە. ئێستا پێتوایە کارێکی باشت کردووە؟**



**حەز وئارەزوو فاکتەرێکی گرنگی کارو کردەوەکانی مرۆڤن. رەنگە ئەو کارانەی

لەوقۆناغەدا کردوومن حەزم لێیان بووبێ،

**ئێستا دوای ئەو قۆناغە دووروودرێژە،چۆن ئەو حەزەت هەڵدەسەنگێنی؟**

** ئەو وەختــە رەنگە پتـر خـۆم بە ئەدەبیـات و ئەوانەوە خـەریک دەکـرد، بەڵام ئەوە ماوەیەکـە دیسـان ملم لە مێـژوو، لە شـتی دیکە ناوە .شـتی دیکەش هەبوو بکرێ بە کوردی، بەڵام بە داخەوە مەسەلەی ئازادی و توانای بلاوکردنەوەو شتیوا گرفـتی دروست دەکرد.هەرچەندە هەرچیـەکم کـردبێ بەبێ گـرفت بۆیان بلاو کـردومـەتەوە، یاخـود بۆ خـۆم رێگایەکم بۆ دۆزیوەتەوە.

*** ئێستـالە کـوردستـاندا، جۆرێک لە وەسـتـان و پاشەکشێ لە کاری وەرگـێـڕاندا هەیە . وەرگـێـڕان زۆر کـەم بۆتەوە. ئەگـەر ئەمـە بـە لایەک لەقـەیرانی رۆشنبـیـری کـوردی دابنێی ،چارەسەرەکەی لەچیدا دەبینی؟**

** هەر کارێکی هونەری یان رۆشنبیریی، ئەگەر لە تاقیکردنەوەدا سەرکەوتو بێت ،ئەوا پێموایە ئەم کارە نامرێ و درێژەی دەبێ. بەڵام ئەگەر شتێکی کاتی بێت و لەپڕ پەیدا بێ و هەناسـەی کـورت بێ ، رەگی تەواوی دانەکـوتابێ ،ئەوە زوو دەبڕێتـەوەو دەمرێ. ئەوەش بە مانای ئەوەیە کە خەڵکەکە خۆیان ماندوو نەکردووە ، چونکە کاری چاک ماندووبوونی دەوێ، ماندووبوونیش پێوەری کاری چاکە.

*** رۆشنبیرانی کورد ،لەبەر خەریکبوونیان بە خوێندنەوەی بەرهەمی رۆشنبیری، فـیکری و فـەلسـەفـیی بیـانی، پتر بە لاسایی کردنەوە خـەریک بوون ، ئەوەش وای لێکردنەوە کە بیرنەکەنەوە.تەنانەت لە بواری وەرگێڕانیشـدا خەڵـک بیر ناکاتەوە خۆی مـاندوو ناکـات. لەم رووەوە ئایا لەناو رۆشنبیری کـوردیدا پەتای رۆشنبـیـری سـەربەخـۆی کـورد هەیە، یان رۆشنبـیـریەکـەی ئێـمـە تێکەڵەیەکـە لەلاسـایی و دەسـتـدرێژکـردنی رۆشنبـیـری گـەلانی دەوروبەر؟**

** باسی فـیکرت کـرد، فـیکر مـاڵی کـەس نیـە ئەفکاری گـەورە لە تاریخـدا مـۆرک و نیشانەی نەتەوەییـان پێوە دیار نیە. بۆنمـونە سوقـڕات و ئەفلاتون لە مەیدانی فەلسەفەدا، فکرەکانیـان مـوڵـکی هەمـوو مرۆڤـایەتیە.رەنگە ئێـمـەش زۆر مـرۆڤی گـەورەمـان هەبووبێ، بەڵام بە داخـەوە لەبەر ئەوەی بە زمـانی خـۆیان نەیانـووسـیـوە کـارەکـانیـان چۆتە حیسـابی خـەڵکی دیکەوە.ئەگینا ئێمـەش مەلای زۆر گەورەمان هەیە بە عەرەبی شتیـان نووسیـوە و لەمەیدانی فیقهی ئیسلامی و کەلامدا کاری زۆر گەورەیان کردووە.

بۆ نمونە (بەیتـوشی)یەکـمـان هەیەکە لە (نحو)ی عـەرەبیـدا شتـێکی نـووسـیـوە کە هیچ عەرەبێـک نەیتوانیوە لەو ئاستە و بەوفراوانیە لێی بدوێت .ئێمە هەمـوو شتێکمان هەیە، بەڵام لەبەر ئەوەی کیـانێکی سیـاسی و حکومـەتمان نەبووە ،نەمـانتـوانیـوە وەکـو خـەڵکی شانازییان پێوە بکەین.

*** ئەگەر مەسەلەی نەبوونی دەوڵەت وەلاوە بنێین، پێتوایە بیرمەندی گەورە وفەرهەنگێکی گەورەمان هەیە کە دەرنەکەوتووە؟**

** بەڵێ، هەمانە و دەرنەکەوتووە.

*** ئەمرۆ ژیان لەبەردەم مرۆڤی کورد زۆر قورسەوناستەنگ گەلێک زۆرە،مەبەست لە ناستەنگ، هەر ئاستەنگی داگیرکەرو بیانی نیە، بەڵکو باسی ناوخۆ دەکەم، باسی دنیای دەروونی فەرهەنگی کۆمەڵی کوردەواری دەکەم. ئەو کۆمەڵگەیەی کە هەمانە ناچارمان دەکا وابیر بکەینەوە کە فەرهەنگێکی گەورەمان نیە . بە دەست ئەم کەمو کورتیەشەوە دەناڵێنین، تۆ پێتوایە کە هەمانە، دەکرێ پەنجە بۆ ئەو شتە درێژ بکەی؟**

** پێموایە هەموو میللەتێک و کۆمەڵگایەکی مرۆیی لە هەر قۆناغێکی مێژووی خۆیدا بیرمەند وپیاوی خۆی هەیە، بەڵام رەنگە میللەتێک و کۆمەڵگایەکی دیکە لە رووی ژیاری و فیکرییەوە لە ئەوەی دیکە پێشکەوتووتر بێ ، ئەمەش بە هۆی پێشکەوتنی زەمەنییەوەیە کەوادەکات هەمووومان شانبەشانی یەکدی هەنگاو نەنێین . ئینجا ئەوە بە مانای ئەوە نیەکە ئێمە بیر و بیرمەندمان نیە، هەموو شتێکمان هەیە، تەنها یەک شتمان نیە، ئەگەر سەقامگیرییەکی سیاسیمان هەبێ خەڵکەکە فێری ئەوە دەبێ کە پتر لەوەی شەڕ دەکات، بیر بکاتەوە.

*** نەسلی ئێوە، نەسلی رۆشنبیران و نووسەران ، ئەوانەی کە ئێستا لەناو میللەتەکەی ئێمە بە پەنجە دەیانژمێرین، جۆرێ لە خۆشلکردنەوەیان پێوە دیارە. واتا زۆربەیان لەناو مەیدانی پڕلە تەنگژەو قەیرانی رۆشنبیری کوردیدا، بوونێکی کارایان نیە ، ئەمەش لەکاتێکدایە کە جێگرەوەشیان بۆ دروست نەبووە. ئەم دیاردەیەی نەبوونی جێگر و دوورکەوتنەوەی رۆشنبیرانی نەسلی ئێوە ،لەچیدا دەبینی، پێتوایە ئەمە چارەسەرێکی هەبێ؟**

** پێش ئەوەی ئاماژە بە چارەسەر بکەین ،دەبێ هۆکارەکان دیاری بکەین. وابزانم زۆر ئاشکران،ئەگەر ئێمە لەم قۆناغە مێژووییەدا بتوانین توانا و لێهاتوویی خەڵک کۆبکەینەوە ، زۆر شتی لێ پەیدا دەبێت. رەنگە ئەم خۆشاردنەوەیەش نەمێنێت. بۆیە پێویستە بزانین نووسەری چاک و قسەزانی چاک کامەیە، مۆسیقاژەنی چاک کامەیە. بۆ نمونە(مام هێدی) یەک هەیە شاعیرە ئەوە هەر شتێکە لە نمونەی هەزار، ئەوە بۆ لەو مەیدانە بوونی نیە؟ واتا تۆ دەبێ خەڵک ببژێری، ئەمەلایەکی، لایەکی دیکە هەندێ لە گەنجەکان دەستیان داوەتە زۆر بابەتی وا کە رەنگە سەدان ساڵ بەر لە ئێستا لە ئەورووپا هەبووبێ کەچی ئەوانە تازە بە تازە دێن باسی ئەم شتانە دەکەن. .

*** وادەزانی هاتنی رەوتی فکری جیاجیا ــ ئەڵبەتە من ناڵێم چارەسەری بۆ کێشە رۆشنبیرییەکانمان دەدۆزنەوە، رەوتێکن دێن و دەڕۆن وئەوانەی کە رەسەنایەتییان نەبێ زوو ون دەبن ــ دیاردەیەکی خراپە یان چاکە، ئەگەر پێت خەراپ بێت ئەوا فەرهەنگ بەچی فراوان و گەورە دەبێت؟**

** ئازادی شتێکی پێویستە، بەڵام ئانارشیزم نیشانەی نەخۆشیە. لە پاڵ ئازادیدا ئانارشییەتیش هەیە. پێموایە دەبێ جیاوازییەک لە نێوان ئازادی و ئانارشییەتدا،هەبێت. پێویستە بەرەورووی ئەو کەسانە ببینەوە کە راستییەکان وەکو خۆیان ناگەیەننە خەڵک، چونکە ئەرکی ئازادی گەیاندنی راستییە.

*** لەگەڵ ئەو کەسە چیدەکەی کە ئازادی وەکو پێویست بەکار ناهێنێ؟**



** ئەوەی کەوا لە بەرێوەبەرایەتییەکدا زیاد لە حەددی خۆی دەڕواو ئامانجی تەنها

دەوڵەمەند بوونە و ئەم کارەشی لە گەڵ سروشتی کارەکەیدا ناگونجێ ،چی لەگەڵ دەکرێ؟ لە دەوڵەتێکی پێشکەوتوو و زیرەک و سەرکردایەتییەکی سیاسی کە دڵی بە میللەتەکەی خۆی ومێژووەکەی دەسوتێت چی لێدەکا، دەبێ ئەویش وای لێ بکرێ.

*** مامۆستا ئەگەرلە هەموو بوارێکدا لێپێچەوانەوە هەبێت ،لێپێچانەوە لە بواری رۆشنبیریدا دەبێ هەر بە ئازادی و بەرەنگار بوونەوەی فیکری بێت. لەم بوارەدا لێپێچانەوە چۆن چۆنییە؟**

** خۆ من ناڵێم بیهێنی دارکاری بکەی. دەڵێم دەبێ لە خەڵک بگەیەنی ؛بابە ئەوە ئانارشییەتە و ئازادی وا نابێت و ئازادیش ئەوە نیە.

*** جا رایەکی دیکە لەسەر ئەم بۆچوونەی جەنابت هەیە کە دەڵێ لە کوردستاندا نسلێک پەیدابووە ، زۆر دەنووسێ وکەم دەخوێنێتەوە. تۆ پێتوایە ئەمە یەکێک لە فاکتەرەکانی ئانارشیەت بێت کە ئەویش لەوەوە دێت کەلە مەسەلە رۆشنبیریەکە باش ورد نابێتەوە ؟**

** ئا من پێموایە ئەوانە پتر حەز دەکەن دەرکەون وخەڵک باسیان بکات. ئێمە بۆ خۆشمان هەر وابووین، بەڵام گرنگ ئەوەیە کە سنوورێک لە نێوان ئازادی و ئانارشییەتدا دابندرێت.

*** بەڵای تۆوە، سنووری ئازادی لەبیرکردنەوە و ژیانی تایبەتی هەر مرۆڤێکدا، چەندە؟**

** ئازادی بە مەفهومەکەی من ئەوەیە کە تۆ مەحکومی بە قەوانینێکی جەبری ئەو جیهانەوە کە تێیدا دەژی. بۆ نمونە رۆژێک لە رۆژان کابرایەک نەیدەتوانی بفڕێ، چونکە دەبێ لە (یاسای کێش) دوور بێ، بەڵام کە توانیی ئەو یاسایە بدۆزێتەوە ئەوا ئەو کاتە بیر لەوە دەکاتەوە ئەگەر هاتوو توانیی شتێک دروست بکات بفڕێ و نەکەوێتە خوارەوە، ئەوا مانای وایە ئەو ئازادیەی دروست کرد. واتا خۆی لە یاسا سەپاوەکە رزگار کرد،لێرەدا ئەمە ئازادییە.

*** باشە رەنگبێ لەسەر دۆزینەوەی ئەم یاسایەی کە ئێستا باستکرد، کۆمەڵی بیرو را هەبێت، کەواتا دەبێ بوار بۆ گفتوگۆ بهێڵدرێتەوە.**

** هیچ مانیع نیە و دەبێ بوار بۆ گفتوگۆ هەبێ، بەڵام گرنگ ئەوەیە نەیکەین بەشەڕ و یەکتری تاوانبار نەکەین. نەڵێین ئەو جاسوسە و ئەوە پیاوی ئەوو ئەوە. کەواتا کاتێ ئەمە سوودی دەبێت کە تۆ لە مەیدانی خۆتدا ئازادی بەکار بێنی، بەڵام گرنگ ئەوەیە بۆ دۆزینەوەی راستییەکان بەکاری بێنی.

*** ئەو شێوەیەی کە تۆ بۆ گفتوگۆی فیکری و رۆشنبیری دادەنێی، لە ئازادی لیبرالی فیکری نزیکە،لە مەسائیلی فکریدا بڕوات بە لیبرالیەت هەیە یان نا ؟**

** لیبرالیەت لە قۆناغ و سیاسەتی خۆیدا، خۆی دەسەپێنێ وئەمەش بەدەست من و تۆ نیە. یان گەڕانەوە بۆ دواوە و دابڕان، ئەمانە بۆ خۆیان دروست بوونە و نە لە دەسەڵاتی من و نە لە دەسەڵاتی تۆش دانیە، بەڵام رادیکالیەت هەیە ،دیکتاتۆریەتیش کە خۆی دەسەپێنێ. ئەم دیکتاتۆرییەتە بۆچیە؟ ئایا هیچ سوودی هەیە؟ جاری واهەیە

:یکتاتۆرییەتیش وەکو پێویستییەکی لێدێت ،بەو مانایەی کە زۆر جار پێویست دەکا کۆمەڵگا لە بەرەڵایی و دەستدرێژی و پیاوی خەراپ دوور بخرێتەوە و رێگە نەدرێت کە ر ستی مرداربێتەوە. کەواتا لێرەدا دیکتاتۆرییەت شەرعیەتێکی مێژوویی پەیدا دەکات، ،ڵام نەک بۆ هەتا هەتایە، چونکە دیکتاتۆرییەتی هەتا هەتایی،هیچ ئامانجێکی نابێ.

*** رایەک هەیە کەوا شکور مستەفا لە بواری بیرکردنەوەدا پتر بەلای فەلسەفەی مارکیسەوەیە. ئەوەی ئەمڕۆ لە سەردەمی بەجیهانیبووندا هەیە، ئەوەیە کە دنیا بوبێتە گوندێکی بچوک و لە گوندێکی بچوکیشدا گفتوگۆ و هاوارکردن بەسەریەکتریدا کارێکی ئاسانە. جاریوا هەیە ئەم گفتوگۆ و هاوارکردنە چارسەری زۆر خێرا بۆ کێشەی گەلانیش دێنێتە ئاراوە. نمونەش میللەتەکەی ئێمەو دۆستەکانمانین کە ئەگەر راگەیاندنی جیهانی کارەساتەکەمانی بە دنیا نەگەیاندبایە لەوانە بوو ئێستا ئەو هاریکاری و چەترەمان بۆ هەڵنەدرابا کە هەمانە.**

** من نەک هەر قەرزارباری مارکسییەت، بگرە قەرزارباری زۆر شتم. قەرزباری هەموو شتێکم کە لێی فێربوومە. رۆژگارێک تەسەوفیشم دەخوێندەوە. زۆرم پێخۆش بوو، تەنانەت کاریشی تێکردم. من کوردم و حەز دەکەم وەکو ئەو میللەتانە ببم بە شتێک، لە مارکسیەت و تەسەوف و مەلا وشێخ وئاغاو ...هتد، هەرکام بتوانن وابکەن کە رزگار ببم ئەوا لێیان مەمنون دەبم.

## د. فازڵ جاف:

# ڕۆشنبیری کورد، هەست بە عوقدە ناکات

* لەم دانیشتنەدا هەوڵ دەدەین کەوا لەگەڵ دکتۆر (فازڵ جاف)دا، باسێک لە واقیعی ڕۆشنبیر لە ناو جالیەی کورد لە ئەوروپا و پەیوەندییان بەناوخۆی وڵاتەوە بکەین. هەروەها ئەو بیروڕایە جیاجیایانەی لە ناوەوە و لەدەرەوە لەنێوان ڕۆشنبیراندا هەیە. ئەو پەیوەندییەی کە لە نێوان دەسەڵاتی سیاسی لە کوردستان لەگەڵ ڕۆشنبیرانی کورد لە ئەوروپاو لە ناوەوەدا هەیە، لەگەڵ هەموو ئەو کەمو کورییەکانەی کە دەسەڵاتی سیاسی لە چۆنیەتی ڕەفتار لەگەڵ ڕۆشنبیران و هونەرمەندانی وڵاتەکەماندا هەیەتی بخەینەڕوو.
هەروەها باسێکیش لە چۆنیەتی مامەڵەی دەسەڵاتی سیاسی لەگەڵ شارەزایانی کورد لە دەرەوەی وڵات کە ئەمڕۆ لە ئاوەدانکردنەوەدا پێویستیەکی یەکجار زۆرمان پێیان هەیەدەکەین. پێشئەوەی بچینە ناو باسەکە بە پێویستی دەزانم بڵێم دکتۆر (فازڵ جاف) یەکێکە لەو شارەزا و پێگەیشتووە فیکری و هونەرییانەی وڵاتەکەمان کە کۆمەڵی بڕوانامەی گەورەی هەیە وەکو بەکالۆریۆسی نواندن لە ئەکادیمیای هونەرە جوانەکانی بەغدا، دیپلۆمی هەیە لە زانستی شانۆ لە زانکۆی ستۆکهۆڵم و ماجستێری دەرهێنانی لە زانکۆی لەندەن وەرگرتووە ، دواجار دکتۆرای وەرگرتووە لە شانۆ لەزانکۆی (لینیگراد)ی ڕوسیا .
دکتۆر دەمەوێ لەوەوە دەست پێ بکەین کە بەڕێزت یەکێ لەو ڕۆشنبیرانەی کە لە ساڵی (١٩٨٢) وە لە دەرەوەی وڵات دەژی و بەشێکی زۆری ئەم ناوەندانەشت بینیوە وتێیاندا ژیاوی کە ڕۆشنبیرانی کورد لە ئەوروپا تێیاندا دەژین . لەگەڵ ناوەندە ڕۆشنبیرییەکان و کارە هونەرییەکان شارەزاییەکی باشت هەیە، بەوەی کە لەگەڵیان بەشداربووی یان ئەوەتا لە نزیکەوە زانیوتە بیروڕایان چیە. بیروڕایەکی کەمێک سەخت و دەتوانم بڵێم دور لە واقیع لەنێو ڕۆشنبیرانی کورد لە دەرەوە هەیە بەرامبەر بە خودی واقیعی ناو کوردستان ئەویش ئەوەیەکە بەشێوەیەکی زۆر توند و نزیک لە ڕوخێنەر، باس لە واقیعی سیاسی کوردستان دەکەن ، هەربەم شێوەیەش باس لە ئیدارە و حکومەت دەکەن .هەروەهابە شێوەیەک باس لە کۆمەڵی کوردەواری دەکەن وەکو ئەوەی کە بڵێی ئەم کۆمەڵە وئەم واقیعە سیاسیە ڕێگە بە ڕۆشنبیرانە نەدا تێیدا بژین. هۆی چیە کەوا ڕۆشنبیرانی دەرەوە تووشی ئەم جۆرە بیرکردنەوە

بوونە.

** هۆیەکی سەرەکی ئەم دیاردەیە دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کە لە سالانی هەشتاکان و چەند سالێکی سەرەتای نەوەتەکاندا، کوردستان لە ڕووی سیاسیەوە ئالۆز بوو، بەپێچەوانەی ئێستا کە بارودۆخی کوردستان لە بەرەو پێشچوون دایە. لایەنێکی دیکەش بێئاگایی کۆمەلێکی زۆر لە ڕۆشنبیرانی کوردە لە دەرەوەی ولات سەبارەت بە پێشکەوتنی باری سیاسی و کۆمەلایەتی کوردستان، بەتایبەت لەم دوو سێ سالەی دواییەدا کە پتر ڕۆشنبیری کورد بەشێوەیەکی گشتی پێوەی خەریکە. ئەوەی کە ئێستا لە کوردستان هەیە هەندێ جار ڕۆشنبیری کورد پێینازانن ،ئەمەش هەموو کەسێک ناگرێتەوە، بەلام بەشێوەیەکی گشتی دیاردەیەکی باوە . هۆی ئەمەش وەکو گوتم دەگەڕێتەوە بۆ ئەو لاوازییەی کە ڕۆشنبیری کورد لە ڕووی پەیوەندییەوە لەگەل باری کوردستاندا تووشی هاتووە.

*** بەدرێژایی سالانی خەباتی شاخ و دوای ڕاپەڕین کە کورد توانی بچێتە نێو قۆناغی ڕزگارییەوە، لە کوردستانی عێراقدا بە جۆرێک پەیوەندی لە نێوان بزووتنەوەی ڕزگاریخوازی کورد و ڕۆشنبیراندا هەبووە. ئەم پەیوەندییەش یان لە ڕێگەی هاتووچۆ و هاتنەوەی ڕۆشنبیران بێ یان ئەوەتا لە ڕێگەی هاتنی خەلکی ئێرە بێ بۆ دەرەوە. هەرچەندە کە پتر ئەم پەیوەندییە لەڕێگای حزبەکانەوە بووە. بەرای پێتوایە تا چەند لەو بەینەدا کەم و کوڕیەکە بۆ حزبە سیاسیەکان دەگەڕێتەوە لەوەی کە نەیانتوانیوە چاوەڕوانیەکانی ڕۆشنبیری کورد بێننەدی؟**

** بێگومان تا ئاستێک کەم وکوڕی هەیە ، بەرای من ئەوەش دەگەڕێتەوە بۆ سیاسیەکان یان بۆ دەسەلات. بۆ نموونە تا ئێستا نێوەندی ڕۆشنبیریی سەر بەکوردستان لە ئەوروپادا نییە بۆ ئەوەی چاپەمەنیەکانی کوردستان بگاتە دەستمان .ئەمرۆ لێرە لە کوردستان گەلێ ڕۆژنامەو گۆڤار کتێبی نایاب دەردەچێ کە لە ئەوروپا دەست بە دەست دەبن. بۆ نموونە گۆڤارێکی وەکو رامان ئەگەر ڕێبوارێک نەیگەیەنێتە دەستمان، ئەوا هەر نایبینین. ئەگەر بکرێت لەو ڕووەوە دەسەلاتی سیاسی لە کوردستان بیر لە دروستکردنی چەند نێوەندێکی باش بکاتەوە، لە ئەوروپا بۆ ئەوەی ئەو چاپەمەنی و پێشکەوتنانەی کە لە باری کەلتووری لە کوردستاندا هەیە بە ئاسانی بگات بە دەستمان. ئەمە لایەنێکە لەم کەموکورتییە کە دەگەڕێتەوە بۆ دەسەلاتی سیاسی لە کوردستان نەک بۆ ڕۆشنبیری کورد کە لە ڕۆژئاوایە.

*** باشە تۆ پێتوانییە کە کەمێک لە کەموکورتییەکە بکەوێتە سەر خودی ڕۆشنبیرانیش لە دەرەوەچونکە کاتێ ڕۆشنبیرانی ولاتی ئێمە ــ بە هەموو بەشەکانیانەوە ــ ولات بەجێ دێلن و ڕوو لە دەرەوە دەکەن کە ئەویش پتر لە ژێر ناوی خوێندن یان نارازی بوونیانە لەباری سیاسی و کۆمەلایەتیەبەلام سەرای ئەوەی کە ولاتی خۆی و کەموکوڕیەکانی دەناسێ ، بەشێوەیەکی زۆر سەخت دادەبەزێتە سەر واقیعی ولات و کۆمەلگاکەی. پێمەوایە کەمێک لە واقیعەکە دورکەوتونەتەوە.**

** بێگومان ڕەنگبێ کوردستان ئەو بەهەشتە نەبێت کە لەگەڵ سوید، یان نەرویج بەراورد بکرێت ،تا ئەم جۆرە رایانەی لە بەرامبەردا بدرێت. من بەشبەحاڵی خۆم کە هاتمەوە واقیعێکم بینی کە زۆر لە سەرووی ئەو گومانانەدا بوو کە پێشتر دەمکردن. ئێستا لە کوردستاندا جۆرە رێنسانسێک لە باری کەلتوری، چاپەمەنی، رادەربڕین و نووسین و پشتگیری کردن لە نووسەر، هەیە. رەنگە ئەم حەقیقەتە بەنیسبەت کۆمەڵێکی زۆر لە رۆشنبیرانی کوردەوە شاراوەبێت یان ئەوەتا بەچاو نەیاندیبێت .بۆیە بە رای من چاکتروایە ئەم رۆشنبیرانە بێن و لەنزیکەوە ئەم واقیعە بە چاوی خۆیان ببینن. ئەودەم رەنگە پتر بگەنە ئەو بڕوایە، بەڵام ئەوەی من مەبەستم بوو دروستکردنی نێوەندێکی کەلتوریە.

لە هەموو وڵاتانی ئەوروپا جۆرە پەیوەندییەک لەگەڵ وڵاتانی دیکەدا هەیە کە پێی دەڵێن ئاڵوگۆڕی رۆشنبیری ،ئەگەر ئێمە بتوانین لە ئەوروپاوە ئەو جۆرە ئاڵوگۆڕە رۆشنبیریە لەگەڵ دەسەڵاتی سیاسی لە کوردستاندا ئەنجام بدەین و تەنانەت لە روی رێکخراوانی وڵاتانی دیکەشەوە بتوانین پردێکی پتەوتر لەگەڵ کوردستان درووست بکەین ، ئەوا دەتوانین باری جوانی رۆشنبیری وڵاتەکەمان و باری روناکی کەلتوری کوردی بگەیەنینە رۆژئاواییەکان.

*** من ویستم بێینەوە سەر ئەو باسە، بە دڵنیاییەوە ئەوە یەکێکە لەو گرفتانەی کە دەبێ چارەسەر بکرێت. بۆیە من پێموایە دەبێ بگەڕێینەوە سەر واقیعی گەماڕۆدان ئەو ئابلۆقەیەی کە لەسەر کوردستان هەیە. بەڵام پێشی هەندێ دەبێ باس بکەین کە ئێستا ژمارەیەکی یەکجار زۆر لە رۆشنبیرانی خاوەن بڕوانامە و بەتوانای ئێمەو لە دەرەوەی وڵات دەژێن کە بەشێکی زۆر لەوانە بەشێوەیەکی زۆر ئینفیعالی و بەسەبکی ئەوروپاییەکان دەتەقنەوە. تەقینەوەیەک کە لە وانەیە پەیوەندی هەبووبێ بە پەیوەندی ئەو رۆشنبیرە بەو حزبەی لەگەڵیدا بووە و لیی نارازی بووە، لەسەر ئەوەی کە لیی تێنەگەیشتووە ، لەگەڵ بیروڕاکانی نەهاتۆتەوە، یان لە ئەنجامی واقیعی کۆمەڵایەتی ئێمە، لەوانەیە بەرخوردی کردبێ لەگەڵ بیروڕایەکی دیاریکراوی ناو کۆمەڵ کە هەڕەشەی لێ کردبێ .**

**پێت وایە ئەم هەڵچونە دوای ئەوماوە درێژە چەند واتای ماوە ، چونکە ژمارەیەک لە رۆشنبیرانی ناسراوی ئەم وڵاتە کاتێ کە دەچنە دەرەوە، بەراست و بە چەپ دادەبەزنە سەر کوردستان پێموایەدەبێ ئێستاپێداچوونەوەیەک بۆ ئەو بیروڕایانە بکرێت. ئایا لەوەشدا دیسان رۆشنبیری کورد هەندێکی دیکە گلەیی ناکەوێتە سەر؟**

** رۆشنبیری کورد لە دەرەوەی وڵات، ئەو گلەییەی دەکەوێتە سەر شان، بەتایبەت لە دوای راپەڕینەوە دەسەڵاتی کورد دامەزراندوە و پتر بەرەو فرەوانی رۆیشتووە. بەڕای من دەبێ روناکبیری کورد ئەمڕۆ پتر لە جاران بەرامبەر بەو گۆڕانکارییەی کوردستان گەشبین بێت .

وشەی هەڵچون بۆخۆی وشەیەکی باش نیە، چونکە وابزانم دەبێ پێوەری راستەقینەی مرۆڤی کورد بەگشتی و روناکبیری کورد بەتایبەتی ،پێوەرێکی زانستیانەبێ ، ئەگەر بەو پێوەرەش لە بارودۆخی کوردستان بڕوانین ئەوا دەبینین لە هەموو روویەکی، کۆمەڵایەتی ، کەلتوری و سیاسی بارودۆخی کوردستان بەرەو باشی رۆیشتووە . دەبێ بەشێوەیەک لە شێوەکان روناکبیری کوردلە ئەوروپا ئەو

زمانە هاوبەشە بدۆزێتەوە. من قسەیەکی **(ئیدراود سەعید)**م بیر کەوتەوە کە دەڵێ: **«ئەمڕۆ ڕۆژی ئەوەیە کە ڕۆشنبیر لە دامەزراوی سیاسی دوور نەکەوێتەوە، چونکە ئەگەر ڕۆشنبیر لە دامەزراوی سیاسی دورکەوتەوە ئەوا کاری پێ ناکرێ».** ئەو جۆرە ڕەفتارە کە لە سەدەی نۆزدەهەمدا هەبوو جاران دەیخوارد، بەڵام ئێستا دامەزراوە فەرهەنگی و سیاسیەکان هەمووی تێکەڵن .من وایبۆ دەچم کە ڕۆشنبیرانی کورد لە ئەوروپا بتوانن ئەمڕۆ ئەم زمانە هاوبەشە لەگەڵ باری ڕۆشنبیری لە کوردستاندا ،بدۆزنەوە .

*** هەندێ جار دەبینین ژمارەیەک لە ڕۆشنبیرانی ناسراوی کوردلە دەرەوە بە هەواڵێک کە بەهیچ شێوەیەک بیریان لە سەرچاوەکەی نەکردۆتەوە ،لەوەی کە ئاخۆ ئەم هەواڵە چەند ڕاستە لەسەر تەلەفزیۆنێکی بیانی یان لە ڕۆژنامەیەکدا دەخوێننەوە، هەڵدەچن و بەڕووی کوردستاندا دەتەقنەوە.هەروەها میللەتەکەمان چاوەڕێی لە ڕۆشنبیری کورد ناکات کەوا بەم سادەییەو بەم ئاسانیە ڕەش و سپی تێکەڵ بکات . ڕۆشنبیری کورد لە ئەوروپا شانازی بەوە دەکات کە لە هیچ حزبێک نزیک نەکەوێتەوە، گوێ لە قسەی هیچ حزبێک نەگرێ و سوورە لەسەر ئەوەی کە بۆ کۆبونەوەی هیچ حزبێک نەچێ و ڕۆژنامەی هیچ حزبێک نەخوێنێتەوە. ئەی باشە لەچ ڕێگەیەکەوە دەکرێ ئاگایان لە کوردستان دەبێ . جالیەی کورد لە ئەوروپا لە ئەنجامی برسیەتی و قات و قوڕی نەچووە بەڵکو لە ئەنجامی بارودۆخێکی سیاسی ناڵەبار دەرچووە، بەم پێیە ئەوان درێژەپێدەری حزبەکانن. کارێکی ئاساییە کە ئەم کێشە سیاسیەی کە لە کوردستان هەیە لە ناو جالیەی کورد لە ئەوروپا ڕەنگبداتەوە.**

**ئیستا ڕۆشنبیری کورد لە ئەوروپا دوورە پەرێزە. ئەم قسەیەی (ئەدوارد سەعید)ی زۆر بە سەردا تەتبیق دەبێ کە بەڕاستی نابێ خۆی دوور بگرێ. من لە نزیکەوە ئاگادارم کە ڕۆشنبیری کورد لە ئەروپا نایەوێ گوێ لە قسەی سیاسیەکان بگرێ ، ئەگەر ڕۆشنبیری کورد بیەوێ گفتوگۆ لەسەر ئەو ڕەخنانەی کە لە دەرەوەی وڵات بەرامبەر ناوەوە هەیەتی بکات وکەموکوڕیەکان بخاتە ڕوو، چۆن لایەنی گفتوگۆی بۆ دەدۆزێتەوە؟**

** پێموایە چەند ڕۆشنبیرێک هەن، ڕەنگە ئاشکرابن و بەناوبانگ بن لە هەڵچون و لە دابەزین.و لە ڕەخنە گرتندا توند و تیژبن، بەڵام لە ڕاستیدا ئەوانیش لە ناوەوە هەر سەربە لایەنێکن یان بۆ لایەنێک شەڕ دەکەن . بەگشتی ڕۆشنبیری کورد ، بەتایبەتی لە هەشتاکان کۆمەڵێک هەبوون — ئەوەندەی من ئاگام لێبووبێ — لە نزیکەوە لەگەڵ هەڵوێستی نەتەوەیی گەلی کورد ڕای دەردەبڕی و بۆ چونی خۆیان هەبوو. لە پاشان ئەو گۆڕانەی کە ئەمڕۆ بەسەر ڕۆشنبیری کوردا هاتووە، لە ئەوروپا دوو بۆچونی زەقی بەخۆیەوە بینوە؛ بەشێ لەوانە، ئەوانەن کە بە جارێ پەیوەندی سیاسی لەگەڵ مەسەلەی کوردستاندا ڕەفزدەکەنەوە .ئیتر هۆیەکەی هەرچی بێ ،بەشێک لەوانە بێئاگان یان دەیانەوێ بەدەستی ئەنقەست پەیوەندیان بە کوردستانەوە نەبێ. هەندێ لایەنی دیکە هەن بێگومان چەند کەسێک کە لەڕووی بۆچوونی سیاسیەوە یان بڵێین لە ڕووی تێڕوانینی خۆیانەوە، دەیانەوێ ڕەخنە بگرن. ڕۆشنبیری کورد لە هەموو حاڵەتێکدا بۆی هەیە ڕەخنە بگرێ، بنووسێ و ڕای خۆی

ـەربڕێ، بەڵام گرنگ ئەوەیە دەبێ پەیوەندی بە کوردستانەوە هەبێ، پێوەندیەکەشی ـەبێ بنیاتنەرانە بێت نەک روخێنەر. هەمیشە کە دیدارمان هەبێ قسە دەکەم و دەڵێم ـەبێ وەکو **(برێخت)** دەڵێ؛**(دەبێ لە پێناوی ئەوە دابێ کە جۆگەلە ئاوەکە بەرەو ـەرمختەکە بەرین)** ئەگەر دارەکە کوردستان بێ و رەخنەش جۆگەلە ئاوەکە بێ ،ئەوا ـەبێ ئەو جۆگەلە ئاوە هەمیشە بۆ ئەو دارە بڕوات. سەبارەت بە مەسەلەی ئینتیماو غەیرە ئینتیما بۆ حزبێک و بۆ سیاسەتێک ئەوە لایەنێکی ئیجابی نیە لە ڕۆشنبیرێکدا کە بڵێ من پەیوەندیم بە باری سیاسی ئەمڕۆوە نیە. دەبێ روناکبیری کورد سەربەست بێ لەوەی ئەگەر ئینتیماشی هەبێ بۆ حزبێک، بەڵام نەبێ بە بوق بۆ حزبەکەی. ڕۆشنبیرانی وەکو (مایر هۆڵد)و ( مایکۆفسکی) لە حزبی کۆمۆنیستدا بوون، بەڵام رەخنەیان لە خزبەکەی خۆیان دەگرت.

*** مەسەلەی پەیوەندی ڕۆشنبیرانی کورد لە دەرەوە بەناوەوە ، شتێکی جوانە. ئەگەر ڕۆشبیری کورد بیەوێ بەرهەنگار بێتەوە دەبێ یەکێک لە هەوڵەکانی ئەوەبێت کەپەیوەندی لەگەڵ وڵاتەکەیدا نەبڕێت. دەبوایە هەوڵ بدەن بۆ نەهێشتنی ئەو ناستەنگانەی کە لە بەردەم گەڕانەوە و لانیکەم گەڕانەوەی کاتی دان. هەروها هەوڵ بۆ هەبوون و درووستکردنی ئەو پەیوەندیە بدەن کە بەداخەوە لەو رووەشەوە ڕۆشنبیری کورد لە دەرەوە زۆر گلەیی هەڵ دەگرێ. من زۆر ڕۆشنبیری گەورەم بینیوە دەڵێ تا تورکیا یان سوریا هاتووم نەمویستووە بێمەوە کوردستان. هەروەها دەڵێت من (٢٠) ساڵە کوردستانم نەبینیوە لە کاتێکدا ئامادەیە کاتێکی زۆری خۆی لە وڵاتانی دیکەدا بەسەر بەرێت. بۆ نموونە دەچێتە روسیا. لە کاتێکدا هەر ئەوانەی کە دێنەوە کوردستان، بەراوردی روسیا لەگەڵ هەولێر دەکەن دەڵێن و هەولێری (١٩٩٤) کەشەری ناوخۆی تێدابوو لە چاو روسیا بەهەشت بوو. هەندێ شاری وەکو مۆسکۆش بەدەست مافیاو بێسەروبەریەوە دەناڵێن. ماوەیەکی زۆر بەر لە ئێستا لە شانۆنامەیەکی خۆشتدا بەناوی (رووت بوونەوە) زۆر بەتوندی رەخنەت لە واقیعی کوردستان گرتووە. من بیستم لە تەلەفزیۆنی پارتیدا لە سلێمانی پەخش کرابوو، یەکێتی نیشتمانی تەحەمولی نەکردبوو بە تەلەفۆن داوایان کردبوو رابگیرێت. بێگومان ئەوکاتەی ئەم شانۆیەت نووسی ، لە ریزی ڕۆشنبیرانی رەخنەگر بووی . ئێستا هاتوویەتەوە ئەو وڵاتەی کەوا رەخنەت لێیگرتووە .دەکرێ بزانین لەم بارەوە هەست بە چیدەکەی؟**

** نەک هەر تەنها شانۆنامەی (رووت بوونەوە)، هەموو ئەوشانۆنامانەی کەوا لە سوید پێشکەشمان کردن لە ژێر چەتری تیپی شانۆی (ئەرارات)، هەمووی شانۆ نامەی رەخنەگرانەبوون. ئەوشانۆنامانە بەشێوەیەکی ناراستەوخۆ ،باسیان لە سەردەمێکی رەوتی سیاسی مرۆڤی کورد دەکرد.(رەوت بونەوە)و (دوو پێغەمبەر) باس لە کۆمەڵگایەک وسەردەمێک دەکەن بە بێئەوەی تێیاندا کۆمەڵگایەکە دەست نیشان بکرێ، بێ ئەوەی شوێن و جێگا دەست نیشان بکرێ، بەڵام کە بینەری کورد دەهاتە شانۆ وئەم شانۆنامانەی دەدیت ،یەکسەر کوردستانی لە مێشکدا دەچەسپا ، لەرووی سایکۆلۆژیەوە هەستی دەکرد هەموو ئەو رەخنانەی کەوا لە شانۆ گەریەکە هەیە، ئاراستەی رەوتی ژیانی کۆمەلایەتی و سیاسی کورد کراون . ئەو باری رەخنەیە بەڵگە بووە بۆ نزیک بوونەوەی ئێمە لە کوردستان و دوورنەکەوتنەوەمان لە

واقـيـعـی مـرۆڤی کـورد لە هەشـتـاکـان . بۆیە من زۆر جـار دەڵێم دوورکەوتنەوە لە کوردستان مانای ئەوە نیە کە بەتەواوی واز لە کوردستان بهێندرێ. ئێستاش کە من دەگەێمەوە کارێکی هونەری بکەم دەبێ رەخنە لەو لایەنانە بگرم کە بە نیگەتیڤیان دەزانم، دەبێ کاری ئێمە چ لە ناوەوە وچ لە دەرەوە بەم شێوەیە بێ، بەلام وەکو گوتم ئەو رەخنانە نابێ روخـێنەر بن و بگرە دەبێ لە پێناوی چاککردن و بەرەو پێشـەوە بردنی ولات بن .

*** دوای ئەو کارە هونەریانەتان کە وەکو رەخنە لەواقیعەکەی خۆتان پێشکەشتان کرد، ئێستا کە گەڕاویەتەوە کوردستان، پێتوایە تا چەند ئەو نەفەسە تەحەدایانەی تێدابووە کـە دەڵێ رۆشنبـیـرانی کـورد نابێ لە ولاتەکـەیان دورکـەونەوە ، نـابێ پەیوەندییان پێوە ببڕێ . هەروەها کاتێ کە هاتیەوە ئێرە چەند لەم کارە هونەریانەی تۆ لایەنی رەخنەی واقیعیان تێدا بووە؟ دوای ئەوەش ئێستا تۆ لە کوردستانیت، ئەم ولاتە چەند بواری ژیانی تێدا هەیە. دەکرێ شارەزایانی هونەری گەورەی وەکو تۆ بگەڕێتەوە و کاری تێدا بکەن؟**

** ڕاستیەکەی ئەگەر وەک خۆم هەڵی سەنگێنم و بڵێم ئەو رەخنانەی ئێمە چەند بیناتنەرن ، ئەوا کورد گووتەنی (کەس بە دۆی خۆی نالێ ترشە)، بەلام وەک رەوتێک لە هونەردا ،ئەمە مۆرکی تایبەتی خۆی بووە. ئێمە تەنانەت کۆمەڵێک کەسمان لەگەڵ دا بووە، زۆر جـاریش لە ناو کـوردسـتـانـەوە خـەبەریان بۆم نارودووە وگـوتویانە با(فازڵ) کەم باسی سیاسەت بکات.لێرەدا مەبەستم ئەوەیە کە ئێمەش لە سوید خەبەرمان بۆ هاتووە گـوتویانە ئەو کارانە هونەری نین و سیاسین، بەلام پێموایە دەمێنێتەوە سەر ئەوەی کە بەرامبەر چۆن سەیری ئەو کار و ئەو رەفتارانە دەکات . بەگشـتی وایبـۆدەچم کـە تیـپی (ئەرارات) پرسـیـاری دروست کـردووە و بەڵگەی سەرکەوتنیشی لەوەدایە کە هەمیشە بینەرێکی زۆری بۆ خۆی راکێشاوە و خەڵک کارەکانی بینیوە ،ئەمەش هەر خۆی لە خۆیدا بە مانای نزیک بونەوەی ئەم تیپەیە لە مێشک و دەروونی کورد.

*** دیاردەیەک لە دەرەوەی ولات هەیە ، ئەویش ئەوەیەرۆشنبـیـری کـورد گـوێ بۆ یەکدی ناگرن، گفتوگۆیەکی بەر فراوان لەنێوانیاندا نیە ئەو ئاستەی کە گفتوگۆی تێدا دەکەن ـــ نالێم هـەموویان، بـەلام زۆربەی ئەو دانیشـتنانەی کەوا دەیان بینی ـــ دانیشتنی بچوکن ، هەموویان باس لە مەسەلەی شەخسی و شتی بچوک دەکەن کەوا پەیوەندی بەکاری هونەری و رۆشنبیریی سەرەکی ولاتێکەوە نیە.**

** ئەمەیان راستە، بەلام تا ئێستا لە ئەوروپا نێوەندێک یاخود سەنتەرێک نیە کە روناکـبـیری کـورد لێک کـۆ بکاتەوە. من لەو بڕوایەدام ئەگـەر رۆشنبـیـری کـورد بیتوانیبایە سەنتەرێک یان نێوەندێکی کۆبوونەوەی هەبێ، ئەوا دەیتوانی زۆر کاری گرنگ بکات. ئەم کارەش تەنیا بەند نەدەبوو بە کاری سیاسیەوە ، رۆشنبیری کورد لە ئەوروپا تەنانەت دەتوانی کاری کەلتوری رۆژانەش لە سەر پلانی رۆژانە ئەنجام بدات. ئێسـتـا دەبێ رۆشنبـیـری کـورد ئەو نێـوەندەی هەبێ، ئەو زمـانە هاوبەشـە ببـینێـتەوە بۆ کـارکردن چونکە بە تەنیـا نارەزایی دەربڕین دادینادا ،بەم شـێوەیە چارەسەرێک نادۆزینەوە. ئێستا ئەگەر نارەزایەتیش هەبێ ،دەبێ ببێتە بنەمایەک بۆ کارکردن و بۆ بنیاتنان نەک نارەزایی تەنها بۆ نارەزایی بێت.

ڕۆشنبیری کورد لە ئەوروپا کێیە؟ هەر ئەو کەسەیە کە لێرەوە چۆتە ئەوروپا بە ئاسانیش ناتوانێ بگۆڕێ. بەشێکی زۆر لە ڕۆشنبیران ئەو ڕەگ و ڕیشەیان دانەکوتاوە تا بتوانێ لە ڕووی کەلتوری و روناکبیریەوە سود لە شارستانیەتی ئەوان بینێ .دەبێ مرۆڤ ئەوە لە یاد نەکا کە خەڵکێکی زۆر لە ڕۆشنبیرانی ئەوێ، ئێستاش هەر لە هەولێر و لە سێلمانی دەژین.

*** زۆر لە ڕۆشنبیران تاکو ئێستا لە ئەوروپا ڕەگیان دانەکوتاوە. باشە ئەم کۆمەڵە ڕۆشنبیرەی کورد کە لە ئەوروپا هەست بە بوونیان دەکرێ، دەبێ شتێکی نوێیان خستبێتە سەر ئەو ئاستە ڕۆشنبیرییەی کە لە کوردستانەوە پێی هاتوون. هەست بەشتێک دەکەی کە بڵێی ڕۆشنبیری کورد لە ئەوروپا جیاوازی هەیە لەگەڵ ڕۆشنبیری کورد لە ناو کوردستان؟ ڕۆشنبیرانی ئێرە دەبینی گۆڤار دەردەکەن تەلەفزیۆن بەڕێوەدەبەن و لە ژمارەیەکی یەکجار زۆر بنکەی ڕۆشنبیری و ڕاگەیاندن کاردەکەن. بەرای جەنابت جیاوازییەک لە نێوان ئاستی کاری ڕۆشنبیرانی ئێرە و ئەوروپادا هەیە؟**

** یەک شت هەیە زۆر گرنگە؛ ڕۆشنبیری کورد لە ئەوروپا نابێ لە سەریەک پلە تەماشا بکرێن، چونکە بەڕای من تەنانەت لە نێوان ڕۆشنبیرانی کورد لە ئەوروپاشدا جیاوازیەک هەیە. ژمارەیەک ڕۆشنبیر لەسوید یان لە شوێنانی دیکە هەن گەشەیان کردووە و شتێکی بەرچاویان خستۆتە سەر ئەو ڕۆشنبیرییەی کە پێشتر پێیان بووە، بەڵام لە بەرامبەردا کەسانێکی دیکە هەبوونە بە پێچەوانەوە، وەکو خۆیان ماونەتەوە .هۆیەکی سەرەکی ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کە ئەوانە هەوڵی ئەوەیان نەداوە بجولێنەوە وشتێکی نوێ بە دەست بێنن ، خۆیان ماندوو نەکردووە، تەنانەت فێری زمان نەبوونە . لەوانە چەند هەن من دەیاناسم نووسەرن یا شاعیرن نەیانتوانیوە فێری زمانی بن، تا ئێستا دوو فلیمیان نەبینیوە، ناچن بۆ شانۆ، بەشداری چالاکیە جۆر بە جۆرە کەلتوریەکان ناکەن .

من دەمەوێ ئەوە بڵێم کە بەشێک لەو ڕۆشنبیرانە، بەشێکی تر کە ڕەنگە لە داهاتوودا باشتر سەر هەڵبدەن ئەوانەن کە وەکو گەنج ڕۆیشتوون و ئەوانەش ڕەنگە کاریگەرییان لە داهاتوودا پتر بێت. بەگشتی من وایبۆدەچم لە بوارەکانی دیکەی کەلتوری کوردیدا ئیمکان بێ ڕۆشنبیری کورد لە بواری شانۆ ، سینەما و مۆسیقا، یان با بڵێین ئەو لایەنانە ئێمە تا ئێستا لە ئەوروپا سودمان لێ نەبینیوە، کە ئیمکان بوو روناکبیران پتر سودی لێ ببینن ، سوودی پترلێببینین . پێویستە سەبارەت بە بەراوردکردنی بەرهەمی ئەو روناکبیرانەی لە ئەوروپا دەژین لە گەڵ بەرهەمی ناوخۆدا بڵێم: کەگومان لەوەدانیە ئەو روناکبیرانەی لە ئەوروپا دەژین دەبوایە لەرووی جۆری کارەوە بەتایبەت کە لە سەرچاوەیەکی روناکبیری دەوڵەمەندی وەکو ئەوروپا نزیکن ، بە تێکەڵکردنی روناکبیریەکەی خۆیان لە گەڵ سەرچاوە روناکبیریەکەی ئەوروپا بەرهەمی باشترو بە پێزتر لە بەرهەمی ناوەوەی کوردستان پێشکەش بکەن، بەڵام پێموایە کە روناکبیرێکی کورد لە کوردستانەوە دەچێتە ئەوروپا وەکو روح لە کوردستان دەژیێ و وەکو مێشک لەئەوروپا ناژیێ.

*** ژمارەیەکی زۆر لە ڕۆشنبیرانی دەوورویەرمان وەکو فارس ، عەرەب و تورک، بەتایبەتیش فارس وعەرەب دەچنە ئەوروپا، بۆ جالیەی وڵاتەکەی خۆیان سیمینار و کۆڕ دەبەستن و بەرهەمەکانی خۆیان لەوێ بڵاو دەکەنەوە، بەتایبەتی زۆر لە ڕۆشنبیرانی ئەو وڵاتانەی کە باسمان لێ کردن بایەخێکی تایبەت بە جالیەکانی**

**خۆیان لە ئەوروپا دەدەن.وەک هەست دەکەین رۆشنبیری کوردی پەیوەندی بەخودی جالیەی کوردیشەوە نیە، هەرچەندە لەوانەیە ئەم قسەیە موتلەق نەبێت بەلام پەیوندیەکی پتەو لەنێوان رۆشنبیری کوردی ئەوروپا وجالیەی کورددا نیە ، ئەوەش بەپێچەوانەی رۆشنبیرانی ولاتانی دەوروبەرمانە.**

** من باسم کرد .ئەو پەیووەندیە بێگومان لە لایەکەوە دەگەڕێتەوە بۆ رۆشنبیری کورد کە لەرووی رۆشنبیریەوە رەگی دانەکوتاوە و لەو ولاتانەدا شتێکی بەدەست نەهێناوە .ئەمە سەرەڕای ئەوەی کە رۆشنبیری کورد خاوەنی دامەزراوی رۆشنبیریی نەبووە لە ولات بۆ ئەوەی پەیوەندی پێـــوەیەی هەبێت وەکـــو فـــارس و تورک و عەرەب.بەلام ئێستا روناکبیری کورد دەتوانێ بێتەوە و پەیوەندی هەبیت بە دەزگا رۆشنبیریەکانی ناو ولاتەوە، ئەو لایەنە مرۆڤ نابێ لە بیری بکا.
وەکو گوتم ئەگەر بگەڕێنەوە بۆ جۆری چارەسەر کردنی ئەودیاردەیە و تێڕوانین لەو دیاردەیە، خودی رۆشنبیری کوردو ئەوانەی کە لە ئاستی رۆشنبیری بەرزدان وناسراون وەکو خۆیان ماونەتەوە وئەوانە تازە ناتوانن ئەم زمانە هاوبەشە لەگەڵ جالیەی کوردیدا بدۆزننەوە.

*** هەست بەوە دەکەی کە دەسەلاتی سیاسی لە کوردستاندا رۆشنبیری خستبێتە ژێر گوشارەوە . لێرە چەند هەست دەکەی پەیوەندییەک لە نێوان دەسەلاتی سیاسی و رۆشنبیران هەبێ و ئەو پەیوەندییەش، پەیوەندییەکی شارستانیانە بێ؟**

** لەراستیدا وەکو گوتم یان ئەوەتا رەنگبێ لە قسەکانمدا ئەوەم بەشێوەیەکی ناڕاستەوخۆ گوتبێ کەوا لەو ماوە کەمەی کە لە کوردستانم هەست بەوە دەکەم کە کەسایەتی روناکبیری کورد سەربەستانە رەفتار دەکا، بڕواناکەم فشارێکی سیاسی هەبێ وایلێبکات بەشێوەیەک لە شێوەکان رەفتار بکات کە بە پێچەوانەی خواستی خۆی بێت .

## فەلەكەدین كاكەیی:
**[وەزیری رۆشنبیریی١٩٩٨]**

# پێویستە رۆژنامەنووس پەرژینی قەدەغەكان بشكێنێ

*** تۆ هەرەزۆری تەمەنتان لەكاری رۆژنامەنووسی لەناو بزوتنەوەی شۆرشگێری كوردستاندا بەسەر بردووە، ئێستاش لە سەد ساڵەی رۆژنامەنووسی كوردیدا جەنابتان وەزیری رۆشنبیری حكومەتی كوردستانن، ئەگەر ئاورێك لەمێژووی سەد ساڵەی رۆژنامەنووسی كوردی بدەینەوە بەم رێچكەیەی كەوا پێیدا تێپەریون ــ لەرۆژنامەنووسی نهێنیەوە دوایی بۆ رۆژنامەنووسی بەرەنگاری و شاخ و ئێستاش بۆ رۆژنامەنووسی ئازاد ــ بەشێوەیەكی گشتی پێتوایە رۆژنامەنووسی لە كوردستاندا توانیویەتی رۆڵێكی كاریگەر لەپێشكەوتنی كۆمەڵایەتی بگێرێ؟**

** دەتوانین بڵێین هۆشیاری سیاسی ،نەک پێشكەوتنی كۆمەڵایەتی بەمانا گشتیەكەی كە بەكاردێت، بەڵام بێگومان كاری لەپێشكەوتنی كۆمەڵایەتیش كردووە، چونكە هەموو پێشكەوتنێك لە هوشیاری سیاسیدا، هۆشیاری كۆمەڵایەتیشی لەگەڵدایە كە لە ئەنجامدا كار دەكاتە سەر پێشكەوتنی كۆمەڵایەتی.

دەبێ بزانین ئایە رۆژنامەنووسی كورد ئازادی هەبووە، بۆ ئەوەی رۆڵەكە ببینێت؟ رۆژنامەنووسی كوردی بەگشتی زۆر كەم ماوەی هەبووە . لەو ١٠٠ ساڵەدا، بەشی هەرە زۆری قەدەغە بووە. ماوەیەک راونراوە، ماوەیەک هەر نەبووە لەهەندێ پارچەدا، چونكە ئێمە كە باسی رۆژنامەنووسی كوردی دەكەین دەبێ هەموو كوردستانمان لەبەرچاو بێ تەنانەت بەدەرەوەش. ئەمەش كارێكی تەواو دەكاتە سەر چەسپاندنی دەزگای رۆژنامەنووسی لەهەر ولاتێكدا. لەمیسر (ئەگەر هەڵە نەبم) ١١٠ساڵە گۆڤاری **الهلال العربی** دەردەچێ، رۆژنامەی كوردستانیش لەچاپخانەی الهلال چاپ كراوە .**(الهلال)** تا ئێستا هەر ماوە، بەڵام كوردستان نەیتوانی بمێنێت. هۆیەكە سیاسیە، مادیە، نەبوونی ئازادیە ،تا رۆڵ بگێرێ. بەڵام لەو دەرفەتە كەمانەی كە بەدەستی كەوتووە دەڵێم : بەڵێ رۆڵی زۆر گرنگی گێراوە، سەرەتا لە بڵاوكردنەوەی هۆشیاری سیاسی ،هیچ نەبێ لەناو رۆشنبیراندا.

خوێندەواری رۆژنامەش كەم بوونەو هەمیشە ئەوانە بوونە كە خەریكی سیاسەت و كاروباری كۆمەڵایەتی و پەروەردەو نووسین بوون. دەتوانین بڵێین هەندێ رۆژنامە یان گۆڤار وەكو گەلاوێژو هیواو ژین قوتابخانەیەک بوونە بۆ پێگەیاندنی چەندین نووسەرو خوێندەوارو رۆشنبیری كورد. هەندێ رۆژنامە پاڵپشت و هاندەری شۆرش

و راپەڕینەکان بوونە. من دەڵێم ئەگەر بەئینسافەوە پاش ١٠٠ ساڵ تەماشای خەبات و رەنجی رۆژنامەنووسانی پێشەنگی کاری رۆژنامەنووسی و هەروا ئەوانەی ئەمڕۆ بکەین، چ لەهەلومەرجی نهێنی یان ئاشکرا، بەڵێ رۆژنامەنووسی کوردی رۆڵێکی زۆر زۆر باڵای بینیوە لەپێشخستن و بڵاوبوونەوەی هۆشیاری بە مانای وشە. لەهەمان کاتدا لەبەر ئەوەی کورد لەقەوارەی نەتەوەیی خۆی بێبەش بووە، بەکارهێنانی وشەی کوردی بە خۆی مومارەسەیەکی قەوارە نەتەوەییەکە بووە.

*** بەڕای تۆ، رۆژنامەنووسی کوردی پتر بۆ قوڵکردنەوەو فراوانکردنی هۆشیاری نەتەوەیی و هۆشیاری سیاسی بۆ رزگاری نەتەوەیی کاری کردووە؟**

** بەڵێ، بەلای منەوە دەبێ ئەوەمان لەلا روون بێت و عەیبیشی تێدا نیەو شتێکی زۆر سروشتیە مۆرکی نەتەوەیی و مۆرکی سیاسی راستەوخۆ زاڵە بەسەر رۆژنامەگەریدا، چونکە هێشتا دۆزەکە تەواو نەبووەو مەسەلە شۆڕشگێڕیەکە لەپێشە.

*** واتا رۆژنامەنووسی کوردی پتر رۆژنامەنووسی رزگاریخوازیە؟**

** رزگاریخوازی و سیاسیش بووە. هەندێ کەس بەم مانایە لەرۆژنامەکە کەم دەکاتەوە، دەڵێم نەخێر ئاوهای بۆ رەخساوە، رۆژنامەش راگەیاندنە، راگەیاندنیش رەنگدانەوەی سیاسەتە.

راگەیاندنی هەر وڵاتێک هەر حزبێک لەدنیادا واتە؛ رەنگدانەوەی راستەوخۆی سیاسەتی حزبێک یان حکومەتێک و رژێمێک.لە کوردستانیشدا مەسەلەیەکی بنەڕەتیمان هەبووە کە نەتەوەییە و هێشتا چارەسەر نەکراوە، لەبەر ئەوە شتێکی زۆر سروشتیە ئەم چارەسەر نەکردنە لە رۆژنامەنووسیدا رەنگبداتەوە.

*** لەکوردستاندا، ئەگەر رۆژنامەکان دەریش نەچن خەڵک هەست بە بۆشایی ناکەن کە ئەو رۆژە شتێکیان لێ کەم بوەتەوە، هەتا ئەگەر بۆ هەفتەیەک یان مانگێک دەرنەچن . ئەوە لەکاتێکدایە کە ئەمڕۆ لەدنیادا رۆژنامە بووە بە بەشێک لەژیانی رۆژانەی خەڵک بۆ ئەوەی ئاگایان لەدەوروبەر بێت. ئەمە مانای ئەوە نیە کە تاکو ئێستا خەڵکی کوردستان قەدی بەرۆژنامەی هۆشیار کردنەوە گرتووە، هەروا واناگەیێنێ تائێستا رۆژنامەی رۆژانە کە چارەسەری کێشەکانی ئەو رۆژە دەکات بەشێک نیە لەژیانی خەڵکی وڵاتی ئێمە؟**

** یەکەمجار سەد لە سەد ،لەگەڵ برگەی یەکەمی پرسیارەکە نیم، چونکە توێژێک لەرۆشنبیرانی کوردستان بەهۆی ئەوەی هەم رادەی ئاگاداریان زیادەو لەهەمان کاتیشدا شێوەی دیکەی گەیاندنیان بەدەستەوەیە وەک سەتەلایت ،جگە لەوەی رادیۆکان یەکسەر هەموو دەنگوباس دەگەیەنن، هەست ناکەن و بەلایانەوە گرنگ نیە رۆژنامە دەردەچێ یان نا. بەڵام لەهەمانکاتدا توێژێکی دیکە لەکۆمەڵی کوردەواری لایان گرنگە رۆژنامەکان دەربچن ئەگەر هەرچەندە کەمیش بن. هەندێ جێگەی دەرەوەی شار هەن بە پەرۆشەوە چاوەڕوانی هەندێ رۆژنامە یان گۆڤار دەکەن، لەهەندێ جێگە هەندێ رۆژنامەو گۆڤار کۆپی دەکەن و بڵاوی دەکەنەوە. بەڵام دوو لایەنی دیکەی گرنگ هەیە ؛یەکەمیان وەکو لەسەرەتا گوتم پەیدابوون و بڵاوبوونەوەی ئەو تەکنەلۆژیاو گەیاندنەی بەم شێوەیەی کە هەیە وای کردووە زۆرکەس پێویستی بەرۆژنامە نەبێ. دووەمیش لەپڕا وەکو تەقینەوەیەک بوو لەرادەی بڵاو کردنەوەی رۆژنامەی کوردی، ئەوەش کاریگەری هەیە لەوەی کەچەند بڵاو دەبێتەوە.

لەهەمان کاتیشدا زۆربەی رۆژنامەکان پاش چەندین ساڵی داپڵۆسین و

سەرکوتکاری لەپرێکدا کەوتنە ئازادیەوەو ماوەیان نەبوو تواناو بەهرەی خۆیان باشتر پەروەردە بکەن. ئەمەش وادەکات رۆژنامەنوسانمان نەتوانن شتیوا پێشکەش بکەن سەرنجی خوێندەوار رابکێشن.

*** ئەی لەرووی کۆمەڵایەتی و سیاسیەوە لە کوردستاندا ئاستەنگ لەبەردەم رۆژنامەنوساندا نەبۆتە هۆکارێک کە هان نەدرێ بۆ ئەوەی بەم شێوە فرەوانە چارەسەری کێشەکان بکات؟**

** لەلایەکەوە ئازادی هەیەو یاسای چاپەمەنی دەڵێ سانۆر لەسەر رۆژنامەگەری نیە، لەلایەکی دیکە ئاستەنگ زۆرە ،لەوانە باری کۆمەڵایەتی و باری سیاسی. بۆ نموونە دوولایەنی سەرەکی هەیە کەپارتی و یەکێتیە، ئەو کێشە سیاسیە گەورەیە کەوتۆتە نێوانیان و هەندێ جاریش بۆتە شەڕیان. ئەمە وادەکات ئەگەر تۆ ئەم لایەنە یان ئەو لایەنە بیت ، کۆسپت دێتە پێش کە تۆ پتر خەریکی لایەنەکەی دیکە بیت و رەخنە نەگری لەکەموکوڕی لایەنەکەی خۆت ،لەرووی سیاسیەوە. تەرەفی سێیەم هەن رۆژنامەنووسن و نەلەمەلان و نەلەولان ،دیسان نایانەوێ بنووسن بۆ ئەوەی نەبنە لایەنێک لەو ململانێیەی هەیە، یان بکەونە بەر فشاری ئەملا یان ئەولا. کەواتا حاڵەتە سیاسیەکە ئاستەنگە.

هەروەها لایەنی کۆمەڵایەتی، مەسەلەی دەسەڵات و مەسەلەی ئایین ــ کە ئەوەی پەیوەندی بەئاینەوە هەیە ناتوانی باسی بکەیت ـــ و مەسەلەی جنس لە ئاستەنگەکانی کاری رۆژنامەنووسی ئازادن، رەنگە لەسەدەکانی ١٦-١٧-١٨ رۆمان نووسەکان زۆر بەئاشکراتر لە سەر جنس و مەسایلی جنسی نووسیبیان، بەڵام ئێستا ناتوانن بەو ئاشکراییە بنوسن. ئەمانەش ئاستەنگن بەتایبەتی بۆ نووسەری لاو. لەبەر ئەوەی لایەنە نەتەوەییەکە زاڵە بەسەر رۆژنامەنووسیدا، مەسەلەی کورد پەیوەندی هەیە بەوڵاتەکانەوە، بە نەتەوەکانی دەوروبەری و دەڵێن ئەمە نەنووسی ئەو میللەتە، ئەو وڵاتە، لێت تورە دەبێ. ئەوەش ئاستەنگە. لایەنێکی دیکە هەیە، ئایندەش تارادەیەک ئاڵۆزی و تەمومژی پێوە دیارە. ئەو ئایندەیە لەکوێ دەبڕێتەوە، چۆن روون دەبێتەوە، چارەنووس لەکوێ دەبڕێتەوە چی دەبێ و چی نابێ. ئەم مەترسیە رەنگە لەدڵی هەموو کەسێکدا هەبێ.

*** ئێستا سەدەیەکمان لەکاری رۆژنامەنووسی تەواو کردووە. ئەمڕۆش لەدنیادا رۆژنامەنووسی زاڵە بەسەر کاری رۆشنبیری و بەسەر بەشێکی زۆر لەژیانی رۆژانەی خەڵکدا. ئەم ئاستەنگانەی کەتۆ باسیان دەکەیت، وەک ئەوەیە لەیاری کێبەرکێی ئەسپ سواریدا ئەو هەموو ئاستەنگە لەبەردەم سوار چاکەکەدا دابنرێ لەیەکێکیان هەر دەکەوێ. ئەم حاڵەتە سیاسیەی کە باست کرد ،لەنێوان حزبە سیاسیەکاندا هەیە، ئەوە جۆرێک لەسانسۆری شاراوەی دروست کردووە ،وێڕای هۆکاری کۆمەڵایەتی و ئاینی و وڵاتانی دەوروبەر. پێتوایە رۆژنامەنووسی تازەپێگەیشتووی کورد ،کەمتەرخەمە لەوەی ناتوانێ چارەسەرێکی هونەریی باشتر بکا؟**

** رۆژنامەنووس وەکو ئاو وایە ،کە لە ئەنجامدا ئەگەر بیەوێ بگاتە دەریا، رێگەی خۆی دەکاتەوە . رۆژنامەنووسی کوردیش هەر وایە. بزوتنەوەیەکە پەیوەندی بەبزووتنەوەی سیاسی و کۆمەڵایەتی وڵاتەکەوە هەیە. بەڵام رۆژنامە ناتوانێ شتێ بکا کەوا دەسەڵاتی سیاسی حزبێکی سیاسی نایکات.دەبێ ئەوەش نەخەینە ئەستۆی رۆژنامە، واتا ئەگەر حزبێک بەرانبەر دەوڵەتێک یان حاڵەتێک ناتوانێ هەڵوێست وەربگرێ، نابێ تۆ داوا لە رۆژنامەنوسێک بکەیت ئەوە بکات. بەڵام لەهەمان کاتیشدا

مـانـای ئەوە نیـە رۆژنـامـەنووسـەکـە بێ دەنـگ بێت. رۆژنـامـەنووس دەیان شـێـوەی دەربڕینـی هـەیە. ئێـسـتـاش ئازادیـیـەک هـەیەو دەتوانێ بەشـێـوەیەک لەشـێـوەکـان بیروڕای خۆی دەربـبڕێ، بەڵام دەبێ شـێـوەی دەربڕین بدۆزێتـەوە، راسـتـەوخۆیە یان ناڕاسـتـەوخـۆیە، بە رێگەیەکی هونـەرییە.هـەندێ جـار لە رێگەی درووشـمێکەوەیە یان لەرێگەی گـۆرانیـەکـەوەیە. جـا لێـرەدا هـەروەکـو لەسـەرەتـاشـدا گـوتم هونەری رۆژنامـەنووس لەوەدایە توانـاو بەهرەی خۆی پەروەردە بکاو پێی بگەیەنێ و رێگە بۆ دەربڕین بدۆزێتەوە.

*** واتا تا ئێستا رۆژنامەنووسی کورد وەکو رۆژنامەنووسی وڵاتانی دیکە ئازاد نیە بەشێوەیەکی سـادە ئەوەی دەیەوێ دەری ببڕێ. باشـە ئەگەر ئەو هـەمـوو ئاسـتـەنگە لەبـەردەم رۆژنـامـەنووسی کـورد بێت ،دەبێ رۆژنـامـەنووسی کـورد ئەوەندە هـونەر بەکـاربێنێ ، ئەگـەر لە دەرگـەیەکـەوە نەیانهـێشت قسـە بکات هـەوڵ بدات شێـوەی رەمزی دەرگەکانی دیکە ببینێتەوە، ئایە زەمەنی ئەوە ماوە!؟**

** نەخێر مـەرج نیە رەمزی بێ. هـەندێ حاڵەت هـەیە دەتوانێ راسـتەوخۆ بەتوندی روونی بکـەیـتـەوە، هـەندێ جـار بـەلێکدانـەوەیەکی مـەنتـیـقی ،کـەس نەتـوانێ رەدت بداتەوە. ئەمـەش لەسـەر تواناو هونەری رۆژنامەنووسەکە دەوەستێ. ئاسـتـەنگ هـەیە ،من نالێم ئەو ئاستەنگانە بمێنن ، پێویستە نەبن، من دەڵێم ئەم ئاسـتـەنگانە هـەیە کە ناهێڵن. بەڵام لەهەمـانكاتدا مـانای ئەوە نیە رۆژنامـەنووس تەسلیـمی بەرامـبەرەکـەی بێ. لەهەر سـەردەمێکدا ئاسـتـەنگی تایبـەتی هـەبووە؛ لە شەستەکان و حـەفتاکاندا بە شـێـوەی دیکە ئـاسـتـەنگ هـەبووە، رۆژنـامـەیان دادەخـسـتـین، راویان دەنـاین و دەیانگرتین. ئاسـتـەنگی ئێـسـتـا جـیـاوازە ناتگرن، رۆژنامـەت داناخـەن، بەڵام بەشێوەیەکی دیکە رێگەی دەربڕینت لێ دەگرن. لەشـەستەکان و هەفتاکاندا دووجار سـەبارەت بەمن ،بە رۆژنـامـەکـان گـووترابوو فـلانکەس بەو نـاوەیە شـتی بـۆ بلاو مـەکـەنەوە، ناچار ناوی رەمـزی (نازناو)م بەکـار هێنا. بەڵام ئێـسـتـا واناگـوترێ ،بەشـێـوەیەکی دیکە دەگـوترێ. بۆ نمـونە مـەسـەلەی بەرژەوەندی نەتەوەیی، ئاینی، بەرژەوەندی کۆمـەڵایەتی و... هتد، بەکار دێت. من دەڵێم رۆژنامـەنووس نابێ تەسلیم ببێ. رۆژنـامـەنووس هـەر ئەوە نیـە هەواڵ بگێـڕێتـەوە، رۆژنامـەکانـی ئێـمـە زۆربەیان هەواڵ دەگێڕنەوە هەواڵ دروست ناکەن، نەک بەمانـای (اختلاق) کردن، واتە شـتێکت دروست کرد ببێتە رووداوی باس کردن .بۆ نمونە لە هەشـتـاکاندا رۆژنامـەنووسێک خـۆی کـرد بەکـرێکاری تورک و چوو لە چەند کـارگـەیەک ئیـشی کـرد، خـاوەن کارگەکانیش وەکو تورکێک مامـەڵەیان لەگەڵدا دەکرد و دەیانچەوساندەوە. کە دوو سێ سـاڵی تەواوکرد ،کتێبێکی دەربارەی نووسی ، هـەرایەکی گەورەی لە ئەڵمـانیـا دروست کردو درا بەدادگاو چەند ملیۆن دانەش لەکتێبەکەی فرۆشرا.

مەبەستم ئەوەیە هەندێ سیفـاتی رۆژنامەنووسی هێشتا لەرۆژنامەنووسانی ئێمەدا بەو شـێـوەیە پەیدا نەبووە. ئەوەی لە چیا پـەیدا بـبـوو بەشـێـوەیەکی دیکە بوو، لەوێ پێـشـمـەرگـە بـوو، دەشـینووسی و بـەرگریشی دەکـرد. ئێـسـتـاش دەڵێم ئەگـەر رۆژنامەنووس دەیەوێ ئەو رۆڵە ببینێ، دەبێ ئامادەی دادگا و بەندیخانە بێت.

جارێک لەکاتی باسکردنی یاسای چاپەمەنیدا ، لەپەرلەمان باسی ئەوەم کرد، هـەندێ رۆژنامەنووسیش لەوێ دانیشتبوون و گوێیان لێ بوو. باسی ئەوەدەکرا چ قـەدەغەیە وچ قـەدەغەنیـە. ئەندامـانی پەرلەمـان بوون بە دوو بەشـەوە ؛هەندێکیـان دەیانگووت کـۆت وبەند دابنێن. من گـووتم بۆ ئـاسـتـەنگ دابنێـین، دەبێ بڕوامـان هـەبێ

ڕۆژنامەنووسانی ئێمە نەتەوە پەروەر و نیشتمان پەروەرن، دەزانن بەرژەوەندی نەتەوەیی ئێمە چیە، ئەگەر هاتوو لایاندا ، بیانبەن بۆ دادگا. گووتم حەز دەکەم ڕۆژێ لەرۆژان ڕۆژنامەنووسێک لەکوردستاندا بدرێ بەدادگا وبزانن چۆن دادگایی دەکرێن. بەس لەسەر ڕەخنە نووسین نەک شتی دیکە،با بزانن بەچ یاسایەک و بەچ شێوەیەک دادگاییان دەکەن. ڕۆژنامەنووس نابێ بترسێ، ناڵێم لەخۆڕایی شتێک درووست بکا، بەلاّم ئەگەر شتێکی جدی هەبوو بابنووسێ و باسی بکات. دڵنیاشم ڕۆژێ لەرۆژان لەکوردستان ئەم بارە دێتە پێش و ڕۆژنامەنووسی بەجەرگ دروست دەبێ. من ناڵێم ئەو ڕۆژنامەنووسانەی ئێستە بەجەرگ نین، ڕەنگە هەندێک لەرووی سیاسیەوە ڕەچاوی وەزعەکە دەکەن و بەرژەوەندی لایەنەکان، بەرژەوەندی نەتەوەیی، بەرژەوەندی ئەم تاقیکردنەوەیە ،ڕەچاو دەکەن . ڕەنگە ئەمانە خۆی ببێتە ئاستەنگ لەمێشکی ڕۆژنامەنوسەکاندا .

*** ئێستا جۆرێ لەناتەبایی ناوخۆیی هەیە، کورد لەهەموو کاتێکی دیکە، پتر پێویستی بەرایەکی گشتی یەکلاکەرەوە هەیە. تاکو ئێستا کامیان لەو دووانە ڕۆڵیان پترە لەدروستکردنی ڕای گشتیدا؛ کەسانی سیاسی یان ڕۆژنامەنووس؟**

** خەڵک پێویستی بەزانیاری هەیەو زانیاری بیروڕا دروست دەکات، بۆیە دەبێ نوسینەکانی ئێمە پڕ زانیاری بێ. ڕۆژنامەی بەهەڵوێست ،ڕایگشتی دروست ناکا، چونکە هەندێک خەڵک لەقاڵب دەداو بتەوێ و نەتەوێ سەر بەو بیروڕایەکی دیاریکراو دەبێ. بەلاّم تۆ پێویستیت بە ڕۆژنانووسێ هەیە بەمانای ڕۆژنامەنووس کە لەرووی زانیاریەوە دەتوانی بیرو ڕا و ڕایگشتی دروست بکات. بێگومان هەڵوێست دەربڕین مافێکی نووسەرە، بەلاّم دەبێت هەڵوێستی نووسەر زۆر کەم بە نووسینەکانیەوە دیار بێ، یان هەر دەرینەبڕێت. بەلاّم پتر پێویستیت بەزانیاری هەیەبۆ ئەوەی بخەیتە بەردەستی خەڵک و خەڵک هەڵوێست وەربگرێ.

ڕۆژنامەنووس نابێت چۆک دا بدات. من بۆ خۆم تا توانام هەبووە پێشێلم کردوون، بەس لەهەندێ حاڵەتدا هەستی پێکراوەو زۆر بەتوندیش بەرەنگارم بوونەتەوەبەلاّم چۆکم دانەداوە و بەپێی پێوەری خۆم. سروشتی ڕۆژنامەنووسیش ئەوەیە هەمیشە بەرەو پێشەوە بچێت.

*** واتا سنور بۆ کاری ڕۆژنامەنووس نیە؟**

** نەخێر نیە.. سروشتی ڕۆژنامەنووس ئەوەیە هیچ شتێک نیە لە دنیادا نەبێتە بابەتی ڕۆژنامەنووسی. بۆنمونە دەتوانی لەسەر گلاسێک ئاوە شت بنووسی ،جا ئاوەکە بێت یان گلاسەکە و کۆمەڵێ لێکۆڵینەوەی لەسەر بکەیت . من لە ژیانمدا هیچ وەختێک پێویستم بەوە نەبووە بگەڕێم چی بنووسم، بەلاّم هەمیشە ئەوەم بووە ،لەو بابەتانەی کەهەمیشە فشارم بۆ دێنن کامەیان بنووسم، ئەوەندە بابەت زۆرە. ڕۆژنامەنووسی سنوری بۆ نیەو دەتوانێ بابەتێکی سیاسی یان کۆمەلاّیەتی ، هونەری ، سروشتی بکرێتە بابەت، لەهەمان کاتدا بیکرێتە هەڵوێستیش.بەراستی ڕۆژنامەنووسی ئاوێنەی ژیانەو هەموو ژیان لە ڕۆژنامەدا ڕەنگدەداتەوە. لەبەر ئەوەیە ،ئەمڕۆ ڕۆژنامەنووسی گەیشتۆتە ڕادەیەکی تایبەتی وبۆ نمونە ناکرێ وەکو جاران، بەرەحمەت بن پێرەمێرد یان مەدحەت میقداد بەدرخان ،لە ئەلفەوە هەتا (یاء) هەمووی بنووسێ. ئێستا ئیختساس پەیدا بووە، چونکە ئەوەندە ورد بۆتەوە. هونەر، سەیردەکەی دەبێتە ڕەخنەگری هونەری، لەرەخنەگری هونەری دەبێتە ڕەخنەگری شێوەکاری، لە شێوەکاریەوە دەبێتە ڕەخنەگری نیگارکێش.

*** با هەنگاوێک بگەڕێینەوە بۆ بەشێک لە مێژووی ڕۆژنامەنووسی کوردستان. جەنابت وەک ڕۆژنامەنووسێک کە لە ڕۆژنامەی نهێنی و لە ڕۆژنامەی حزبی زۆر کارت کردووە، ئێستا ڕۆڵی ئەو بەشە لەماوەی ١٠٠ ساڵدا چۆن هەڵدەسەنگێنی؟ مەبەستم ئەوەیە لەبڵاوکردنەوەی هۆشیاری کۆمەڵایەتی و پێگەیاندنی ڕۆژنامەنووس لە چیادا و لەهەمان کاتدا لە پێشخستنی کۆمەڵی کوردەواری دا، چەند ڕۆڵی هەبووە؟**

** بەراوردکردنی ڕۆڵی ڕۆژنامەنووسی نهێنی لەگەڵ ئاشکرا مەسەلەیەکی زۆر گرنگە. دەتوانین هەمان شت بخەینە قالبێکی دیکە. جارێ ئایا هەموو ڕۆژنامەنووسی کوردی حزبی بووە یان چەندی حزبی بووە، چەندی ئەهلی بووە؟ هەندێ کەس وا دەزانێ لە کوردستاندا هەمیشە ڕۆژنامە حزبی بووە ،بە تایبەتی ڕۆژنامە نووسانی ئەمڕۆ. نەخێر ڕۆژنامەنووسیی لەبنەڕەتەوە بە ئەهلی دەستی پێکرد؛ **(ژین)** و **(گەلاوێژ)** و **(هیوا)** ئەهلی بوونە کە گرنگترین ڕۆژنامەو گۆڤار بوون کاریگەریەکی زۆرپۆزەتیف و بەرزیان بەسەر ڕۆژنامە نووسیی کوردیەوە هەبووە.

*** واتە ئەهلیەکان ڕۆڵیان لە حزبیەکان زیاتر بووە؟**

** زیاتر بووە. ئێستاش هەرچەندە کەمتر ڕۆڵی بنەڕەتی هەبووە لە چەسپاندنی دابونەریتی ڕۆژنامەنووسی و بڵاوکردنەوەی هۆشیاری کۆمەڵایەتی و ڕۆشنبیری. ئەمە لەلایەک، لە ڕۆژنامە حزبیەکانیش کۆنترین ڕۆژنامە کە تائێستا ماون [کوردستان ]ی ئۆرگانی حزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران و [خەبات ]ە کە دەوامکەری [ڕزگار ]یە، لە ساڵی ١٩٤٦ دەرچوون . ئەم دووانە هەندێ جار بەئاشکرا دەرچوون و هەندێ جار بەنهێنی. بۆ نموونە ،تەماشای خەبات بکە لەو ماوەیەی بەئاشکرا دەرچووە چ کاریگەرییەتیەکی هەبووەو لەو ماوەیەی کە بەنهێنی دەرچووە چ کاریگەرییەتیەکی دیکەی بووە. کە بەنهێنی دەرچووە دەتوانم بڵێم تەنیا بڵاوکراوەیەکی حزبی بووە، بەیاننامەو دروشم و بانگەوازی ڕاگەیاندووەو کاریگەری هەبووە لە ڕێکخستنی حزبایەتی .لەو بوارەدا یەکەم بووە. لە بڵاوکردنەوەی هەندێ هەڵوێست زیاتر، هیچ ڕۆڵێکی دیکەی نەبووە. بەڵام لە ماوەی ١٩٥٩ تا ١٩٦١ کە لە بەغدا ڕۆژانە دەرچووە ، لە مێژووی ڕۆژنامەنووسی عێراقیشدا باسی ،دەکرێت ڕۆڵێکی گرنگی بووە. (التاخی) بابڵێین جێگری خەبات -ە بۆ ماوەیەک لە 1967 -1974 کە بەئاشکرا دەرچووە، ڕۆڵێکی زۆر زۆر گرنگی هەبووە. بەڵام خەبات کە لەو ماوانەی بەنهێنی دەرچووە ڕۆڵی حزبی و شۆڕشگێڕی خۆی ماوە.هەڵبەت وەکو ڕۆژنامە و گەیاندنی هۆشیاری بەخەڵک ئەو ڕۆڵەی نەبووەوتەنیا بڵاوکراوەیەکی حزبی بووە بۆ گەیاندنی هەڵوێستی حزبی بە کادیرو ئەندامەکانی. بێگومان ئەمە مانای ئەوە نیە کەوا ڕۆژنامەی نهێنی ڕۆڵی نیە. بەپێچەوانەوە، ک[وردستان ]لە قاهیرەو ئەورووپا بەئاشکرا دەرچووە ،لە کوردستان بەنهێنی بڵاوبۆتەوە، ڕۆژنامەکان لە چیا بەئاشکرا دەرچونە بەڵام لەناو شار بەنهێنی بڵاو بوونەتەوە.

ئەمانە مانای ئەوە نادەن لە ڕۆڵی ڕۆژنامە نهێنیەکان کەم بکەینەوە، هیچ نەبێ ڕۆڵی هۆشیاری سیاسی ڕاستەوخۆی هەبووە ئەوانەی ڕۆژنامە نهێنیەکانیان بەڕێوەبردوە زۆربەی زۆریان سیاسیەکان بوونە، بەپێی مێژوو هەمیشە سکرتێری حزبەکان یان ئەندامی مەکتەبی سیاسی یان ئەندامی کۆمیتەی ناوەندی حزبەکان ڕۆژنامەکانیان دەرکردووە، کەواتا لەگەڵ مێشکی توێژێکی تایبەتی لە کۆمەڵی کوردەواری هەمیشە تێکەڵاو بووە. بۆ نمونە مێژونووسێکی وەکو د. کەمال مەزهەر کتێبێک دەنووسێ

لەسەر (تێگەیشتنی راستی) کە باڵیۆزخانەی بەریتانیا دەریکردووە، بێگومان باڵوێزخانە بۆ بەرژەوەندی وڵاتەکەی خۆی دەری کردووە، سەرەڕای ئەوەی هەندێ نووسەری کوردی ناسراو تێیدا نووسیویانە. ئێستە کە هەڵیدەسەنگێنین دەبینین لایەنی ئیجابی زۆری تێدایە. کەواتا بەم پێوانەیە دەتوانم بڵێم هیچ رۆژنامەیەک زیانی نەبووە. سەرجەم بڵاوکراوەکانی ئەم ١٠٠ ساڵە کە بەزمانی کوردی دەرچوبن بەش بەحاڵی خۆیان رۆڵیان بینیوە.

*** بەشێکیدیکە لە مێژووی رۆژنامەنووسی کوردی، زۆر نزیکە لەو بەشەی کە ئێستا باستان کردەواتە لەبەشی رۆژنامەنوسی نهێنی ، ئەویش رۆژنامەنووسی ئاشکراو بەرهەنگاریە کە لەناو پێشمەرگەدا لە چیا دەردەچوو. کە ئەویش بەشێکە لە رۆژنامەنوسی ئازاد، بەڵام جۆرێکی دیکە لەرۆژنامە نووسی ئازادی کوردی. ئەمەیان چۆن هەڵدەسەنگێنی، چونکە ئەوە تەواو نهێنی نەبووە؟**

** بەڵێ ،ئەمەیان دەچێتە خانەی ئەوەی باسم کرد. هەندێ جار لەچیا بەئاشکرا دەرچووەو گەیشتۆتە شارەکان. ئەمەیان بۆ پێشمەرگە دەرچووەو هەموو حزبەکان هەیان بووە. ئێمە لە ساڵی ١٩٨٣و ١٩٨٤ کۆمەڵەیەکمان پێک ێنا لە چوارچێوەی بەرەیەکی سیاسی بۆ رۆژنامە نووسان و نووسەرانی دیموکراتی لەچیا. دوو ژمارەی رۆشنبیریمان دەرکرد بەناوی [رۆشنبیریی پێشمەرگە] بەکوردی و بە عەرەبی، چەند ژمارەیەکی لێ دەرچوو. ئەویش هەوڵدانێک بوو بۆ بڵاوکردنەوەی هەندێ بەرهەم و بیرورا. هەروەها زۆربەی حزبەکان بڵاوکراوەی خۆیان هەبوو. ئەم شتانە لە ناوچە رزگارکراوەکاندا بەئاشکرا بڵاودەبۆوە. ئێمە ئەمرۆ کاتێ باسی ئەو ٢٥ ساڵەی دوایی دەکەین ،جگە لە شۆرشی ئەیلول ،سەیر دەکەین کەلەپورێکی فرەوان هەیە ئەگەر کۆبکرێتەوەو باسی بکرێت ،لەبەرهەمی پێشمەرگەو نووسەران و رۆژنامە نووسانی پێشمەرگە، بەرهەمی حزبەکان کە لەو سەردەمەدا هەمووی بەرهەمی بەرگری بووە لە میللەت ،لەکاتێکدا کە تووشی ئەنفال و ماڵوێرانی و کاولکاری و راوناون و لەسێدارەدان بووە، ئەمانە هەمووی بەشێکی گرنگی لاپەڕەی رۆژنامەنووسیی کوردیە. لەبەر ئەوە من دەڵێم هەر لاپەرەیەکی رۆژنامەنوسیی کوردی ــ جگە لەوانە نەبێت کەراستەوخۆ لەلایەن دوژمنەوە دەرچوونە ئەوانیش زۆر کەمن ، بریتیەلەچەسپاندنی دابونەریتی رۆژنامەنووسی کە بزوتنەوەیەکی قوڵی فرەوانە بەسەر کورد.

*** بەپێی ئەزموونی تۆ، کامیان زووتر رۆژنامەنووسیان پێدەگەیاند؛ رۆژنامە نووسیی نهێنی یان رۆژنامەنووسیی پێشمەرگە کە بەئاشکرا دەردەچوو؟**

** رۆژنامە نوسی نهێنی هەمیشە کەم تیراژ بووە، کەم لاپەڕە بووە، نووسەر نەیتوانیووە ناوی خۆی بنووسێ کە مافێکی سروشتی نووسەرە ناوی خۆی بنووسێ و هەم هاندانێکە بۆ نووسەر. ئەوەی بەئاشکراو راستەوخۆ دەنووسێت ئەوە پتر هاندەرە رۆژنامەنووس پێبگەیەنێت. هەموومان بەوە پێگەیشتووین.

*** تۆ پێگەیشتووی کامیانی؟**

** هی ئاشکرا.. بەنهێنیش شتم دەنووسی .تەنانەت یەک دوو ژمارەی رۆژنامەیەکی دەستیم دەرکرد بۆ جوتیاران لە دژی ئاغاکان، بەڵام پتر لە رۆژنامەی ئاشکرادا و بەتایبەتی لە (التاخی)وە لە ساڵی ١٩٦٧، پێش ئەوەش هەر دەمنووسی.

*** لە هەردوو بەشەکەی رۆژنامەنووسیی نهێنی و رۆژنامەنووسیی بەرهەنگاری ، تا ساڵی ١٩٩١ بەشێکی یەکجار زۆر لە رۆژنامەنووسی ئاشکراشدا، زۆربەی**

**ڕۆژنامەکانی کوردستان ڕۆژنامەی بەرهەنگاری و داکۆکی کردن بوونە لەمانەوەی نەتەوەی کورد . بۆ ئەویش ڕۆژنامەکان دابەش بوونە بۆ کۆمەڵێک ڕەنگی جیا جیا، هەندێکیان ڕۆژنامەی ئایدیۆلۆژیا بوونە ، نەمانگوت ڕۆژنامەی سیاسی نەبوونە، بەڵام ڕۆژنامە بوون و تەرخان بوونە بۆ ڕێبازێکی ئایدیۆلۆژی. ئێستاش لەم قۆناغە خەریکە لەوە دەردەچین، چونکە دنیا گۆڕاوەو ڕۆژنامە حزبییەکانیش زۆرتر دەبێ خۆیان وەکو ڕۆژنامەی ئازاد بنوێنن. پێت وایە لە رووی زەرورەتەوە ،لە کوردستان گەیشتوینەتە ئەو قۆناغەی کە ماڵئاوایی لەجۆری ئایدیۆلۆژی و حزبی بکەین لەکاری ڕۆژنامەنووسیدا؟**

** ماڵئاوایی یەکجارەکی نابێت ،هەر دەمێنێت. ڕاستە بەشێوەی دۆگمایی پێشوو نامێنێت بەڵام دیسان دەمێنێت. چونکە سروشتی مرۆڤ وایە دەیەوێ خۆی لە قاڵب بدات و لە چوارچێوەی قاڵبێک دەناسرێت لەناو کۆمەڵگادا، جارێ بەشێوە ئایینیەکەی و جارێک بەشێوەی نەتەوەیی و جارێک بەشێوەی ئایدیۆلۆژی و جارێک بە شێوەیەکی هونەری. ئەمە سروشتی مرۆڤە، بەڵام بەر لەو ململانێ توندو تیژەی کە هەبوو لەو سەدەیەی دوایدا، ڕەنگە شێوەکەی بگۆڕێ. بەڵام سروشتی دی دێتەپێش. ڕەنگە لەم شێوە ئایدیۆلۆژیە توندتربێ، ڕەنگە تۆ لە قاڵبی ئایدیۆلۆژی وشکەوە بچیتە قاڵبێکی لیبرالی . کەچی خەڵکی دیکە هەیە ملی خۆی دەکاتە پەتەوە. لە دنیادا ئەو توندرەویەی کە هەیە ڕەنگدانەوەی ئەو ئایدیۆلۆژیەیە، ئەو توند ڕەویە لەوڵاتە ئیسلامیەکان هەیە لەوڵاتە مەسیحیەکان هەیە تەنانەت لە ژاپۆنیش پەیدا بووە. ئەوە شێوەیەکی دیکەی وشکبینی یان تەنگبینی ئایدیۆلۆژیایە، جا یان شێوەی ئایینی یان شێوەی عەشیرەتگەری و ڕەگەزی وەردەگرێت.کەواتە سروشتی مرۆڤ وایە هەمیشە خۆی لەقاڵبێک دەدات و هەمیشە بەدوای شتی تازەدا دەگەڕێت .

*** ئەمڕۆ لە کوردستاندا ڕۆژنامەکان هەموویان سەر بەحزبەکانن. تەنیا چەند ڕۆژنامەیەک و گۆڤارێک نەبێت کە لەم دواییەدا لە وەزارەتی ڕۆشنبیری دەردەچن و سەر بەحکومەتی هەرێمی کوردستانن، ئەویش دیسان ڕۆژنامەی ئازاد نین .بۆیە لە کوردستاندا ئەو ڕایە دروست بووە کە ڕۆژنامەکان لەچوارچێوەی حزبی شەتەکتر دراون. لەرووی ئایدیۆلۆژیشەوە ئەو حزب و لایەنانەی کاری ڕۆژنامەنووسی بۆ ڕازاندنەوەی ئایدیۆلۆژی بەکاردێنن ناڵێم بەرەو کەمین، بەڵام بەرەو زیادیش نین. ئەو ڕایەش خەریکە دەر دەکەوێ کە ڕۆژنامەنووسی ئایدیۆلۆژی ئازاری خوێنەرو کۆمەڵ دەدات. لەلایەکی دیکەوە ڕۆژنامەنووس لەناو ڕۆژنامەکانی حزبیدا ئازاد نیە لەوەی ببێتە بەشێک لە ڕایگشتی تا بتوانێ لەبەرامبەر ململانێی ئایدیۆلۆژی، بەشێوەیەکی ئازادانە یارمەتی دروستکردنی ڕایگشتی بدات. لەم وێستگەیەدا ڕۆژنامەنووس لەناو ئەم ڕۆژنامانەدا دەتوانن هەروەکو ئێستا ئەم پەیامە بەجێ بگەیەنن یان ناچار دەبن لەئەنجامی کاری ڕۆژنامەنووسیدا سنوری حزبی ببەزێنن؟**

** ئەوەیان دەمێنێتەوە سەر هەڵوێستی حزبەکە، ئایا تا چەند ئازادی قبوڵ دەکات. کە دەڵێی ڕۆژنامەکان زۆربەیان حزبین یان حکومین ،ڕاستە، چونکە ڕۆژنامەنووسی، سێ چوار مەرجی هەیە؛ یەکێک لەوانە سەرمایەیە .جگە لە دەستەی نووسەران و کادیرو پەخش و بڵاوکردنەوەو گەیاندنی بە خەڵک. ئێمە دەبێ بزانین ڕۆژنامەی غەیرە حزبی و حکومی کێ دایدەهێنێ. تا ئێستا دەوڵەمەندەکانی کوردستان ئەوەیان نەکردووە، بۆیە ڕۆژنامەکانی ئێستا زۆربەیان حزبین، چونکە تەنیا حزبەکان و حکومەت دەتوانن پارە بدەن. ڕۆژنامەی غەیری حکومی و حزبی دەبێ یەکێک

دەریبکات نە حزبی بێت و نە لە حکومەت دەسەلاتی هەبێت، نەترسی لە دلدا بێت. واتا دەوڵەمەندەکانی کوردستان. دەوڵەمەندەکانی ئێمەش نەختێک پارەی دەست بکەوێ دەیباتە دەرەوە، یان هەندێکیان ئەو پارەیە ناخەنە خزمەت پرۆژەی لەمجۆرە، چونکە لەوە دەترسن ئایندەی نەبێت. هەشیانە مەسەلەی رۆژنامەنووسی و چاپی بەلاوە گرنگ نیە.

ئەگەر سەیری ئەو دامودەزگا رۆشنبیریانەی دنیا بکەی و ئەوانەی لەیەکەم جاردا دایانمەزراندووە خۆیان کەسانی رۆشنبیر بوونە، دواتر کە نەوەکانی هاتوون کارەکە بۆتە مەسەلەیەکی سەرمایەداری، بەلاّم لە هەمان کاتیشدا وەک دەزگایەکی رۆشنبیری ماوەتەوە. ئەگەر سەرنج بدەینە رۆژنامەی **(کوردستان)**ی خۆمان کە یەکەم جار لە ساڵی١٨٩٨دەورچووە، دەبینین لە ژمارەی چواردا دەڵێ لە چاپخانەی کوردستان چاپ کراوە، واتە هەوڵیداوە چاپخانەی هەبێت، چونکە سەرەتا نووسیویە لە چاپخانەی **(هیلال)** چاپ کراوە.

حوزنی موکریانی چووە لە ئەڵمانیاوە چاپخانەی هێناوە.لە ساڵی ١٩١٥ هەستی کردووە کە رۆژنامە بەبێ چاپخانە نابێت. دەکرێ چاپخانە خاوەنی دەزگای بلاّوکردنەوە نەبێ. یەکەم کەس حوزنی موکریانی هەندێ پیتی داناوە وەک (لامی) قەڵەو، ئەو یەکەم کەس بووە هەوڵیداوەو چووەتە ئەڵمانیا لە کارگەیەکی چاپخانە، چاپخانەی بۆ دروست کردوە، ئەوە نەحزبی بووەو نە حکومی. کە باس لە رۆژنامەی ئازاد دەکەی واتە رۆژنامەی ئەهلی، یەکێک یا چەند کەسێک لە هەولێرو دهۆک و سلێمانی خەریکی بن، ئێستا چەند چاپخانەیەکی بچووک هەیە ،رەنگە ئەوانە پەرە بسێنن ،ئەگەر هاتوو لە بارودۆخەکە دڵنیابوون. چونکە پارەدانان لە رۆژنامە موغامەرەی دەوێ. دەتوانم ئەوەش بڵێم کە بۆرژوازی کورد ترسنۆکەو زۆر زۆر دواکەوتووە، پارە لە قاچاخچیەتی بەکاردێنێ، دەینێرێ بۆ دەرەوە، بەلاّم بۆ کاری رۆژنامەنووسی بەکاری ناهێنێ. دیارە رۆژنامەگەری جگە لەوەی لایەنێکی رۆشنبیریی و کەلتوریە، لایەنی بازرگانیشی تێدایەو کارێکی ئاساییە. راستە حزبەکان هەمووی بە خۆرایی پارەکە دەدەن و پارەکە ناگەڕێتەوە، هەروەها ئەو رۆژنامە عەرەبیانەی لەلەندەن دەردەچن ساڵی واهەیە9تا ١٠ ملیۆن دۆلار زەرەر دەکەن، بەلاّم ئەوانە مەبەستیان تەنیا ئەوەیە دەربچن، چونکە بۆ پروپاگەندەیە، رۆژێک دەشبینن ئەم رۆژنامانە رادەوەستێن، چونکە لەسەر بنەمایەکی پتەو نین.، بەلاّم رۆژنامەی دیکە هەن لەسەر بنەمایەکی زانستی دامەزراون قازانجیش دەکەن، مافی خۆیەتی هەوڵیش بدات بۆ قازانج.

*** کەواتا رۆژنامەنووس لەناو رۆژنامە حزبیەکاندا ناتوانن بەو ئازادیە بنووسن ولە کۆمەڵی ئەمرۆی مرۆڤایەتی بەم شێوەیەی کە پێویستەکاری رۆژنامەوانی رابەڕێنن ؟**

** دەبێ ئێمە هەرگیز گلەیی لە رۆژنامەنووسانی کورد نەکەین، رۆژنامەنووسانی ئێمە هێشتا زۆر ئازادترن لە رۆژنامەنووسانی دەوروبەری کوردستان. لە ئەوروپا، لە رووسیا رۆژنامە حزبیەکان سنوری خۆیان هەیە. رۆژنامەنووسی کورد سەرەڕای هەموو گرفتەکانی هێشە ئازادترە لە رۆژنامەنووسی عەرەبی عێراق و فارس و تا ئەندازەیەکیش لە هی تورک. سەیر بکەن لەم هەرێمە بچووکە بە هەموو زمانەکانی عەرەبی ،کوردی ئاشوری ،تورکمانی شت بلاّو دەکرێتەوە، هەیە بۆ رەوتی ئیسلامی و هەیە بۆ رەوتی مەسیحی، هەیە چەپەو هەیە راست، هەیە عەلمانی و هەیە ئایینی. واتە ئەگەر لێکبدرێتەوە بارودۆخی ئێمە لە زۆر شوێنان باشترە، لەگەڵ ئەوەشدا

کوردستان پێویستی بە ڕۆژنامەی ئەهلی کە هەیە نەحزبی و نەحکومی بێت.

*** پێش ماوەیەک گوتت هیچ یەک لەو ڕۆژنامانەی کە لەمێژووی ١٠٠ ساڵەی ڕۆژنامەگەری کوردیدا دەرچوون بێ کەڵک نەبوونە، بەشێکی زۆر لە ڕۆژنامەنووسی کوردی ڕۆژنامەنووسی ئەو حکومەتانە بوون کە کوردستانیان داگیرکردووە. بەشێکی زۆری ئەو ڕۆژنامانە بۆ مەرامی سیاسی خۆیان بوون و بەتایبەتیش لە کوردستانی عێراقدا، بەشێکیش ئەدەبی و ڕۆشنبیری بووە، ئەم بەشەیان چۆن هەڵدەسەنگێنی، چونکە رایەک هەیە هێڵی ڕاست و چەپ بەسەر ئەم ڕۆژنامەنووسییەدا دەهێنێت. ئایا دەتوانین شانازی بە هەندێ لایەنی ئەم ڕۆژنامەنووسیەوە بکەین؟**

** بەڵێ.. دەتوانین .. با بۆ نموونە (ڕۆژنامەی هاوکاری) وەرگرین کە حکومەتی عێراق دەری دەکات، لەسەردەمێکدا دەرچوو هەموو نووسەرانی کورد تێیاندا دەیانووسی. ڕۆژنامەکە تا ئێستاش لە بەغدا دەردەچێ، ژمارەیەک لە نووسەران لەم ڕۆژنامەیەدا پێگەیشتوون و زۆر خزمەتی زمانی کوردی تێدا کرا لەسەردەمانێکدا، لەو (١٠-١٥) ساڵەی دوایدا وردە وردە ڕۆژنامەکە دابەزی و لایەنێکی زۆری پروپاگەندەیە بۆ ڕژێم. هەروەها گۆڤاری کاروان لەسەردەمی ڕژێمدا دەرچووە، چەند لاپەڕەیەکی پروپاگەندە بوو، بەڵام ئێمە وەک وەزارەتی ڕۆشنبیری هاتین هەموو ژمارەکانیمان بەیەکەوە گرێداو کردمانە بەشێک لە کەلەپووری کوردی، چونکە دوو لایەنی تێدایە، یەک ئەمە دەرچووە و دووەمیان زۆربەی هەرەزۆری باشترین نووسەرانی کورد تێیدا بەشدارن.

**ئەگەر ئەم جۆرە ڕۆژنامەنووسییەی ژێر دەسەڵاتی حکومەتی داگیرکار نەبوایە ڕۆژنامەنووسی کوردی جۆرە کەلێنێکی تێدا دروست دەبوو؟**

** دواسدەکەوتین، من ئەوەی ئێستا دەیڵێم لە (١٩٨٦) لە چیا نووسیم. لێرە پاشان حاڵی بووم رەنگدانەوەیەکی سەلبی هەبووە، ڕژێم تەماشای کرد کاری باشی کردووە، ساڵی (١٩٨٥) (٧٩) کتێب چاپکرا بوو، ئەم کتێبانەم تەماشا کرد شەشی لێدەرکەی،ئەویدیکە هەموویان کتێبی باش بوون. جارێکیان لێیان پرسینم؛راستە حکومەتی عێراق ئەو هەموو زۆرداریەی دژیی کورد کردووە، بەڵام ڕێگەشی داوە زمانی کوردی پێشبکەوێ. مەبەستم ئەوەیە دەبێ تروسکاییەکە ببینین وەکو تاریکیەکە دەبینین،.بۆ نمونە ئێستا گۆڤاری (**سروە**) لە ئێران دەردەچێت، خزمەتێکی گەورەی کردووە، هەروەها (ریا تازە) و رادیۆی یەریڤان لە سۆڤیەتی جاران ڕۆژنامەنووس و نووسەری کوردیان لە هەموو کۆمارەکانی جاران پێگەیاند. رادیۆی (کرمانشان)، شا وەک کاردانەوەیەک دژی جەمال عەبدولناسرو رادیۆی کوردی قاهیرە کردیەوە، بەڵام ڕۆڵێکی گرنگی بینی لە پێشخستن و برەوپێدانی مۆسیقای کوردی . دیسان مەبەستم ئەوە نیە پاساو بۆ ئەو ڕۆژنامەنووس و نووسەرانە بهێنمەوە کە خلیسکاون. دیارە خلیسکاوەکان بەپەنجەی دەست دەژمێردرێن.

*** کە ڕۆژنامەنووسێک دەخلیسکێ بەپێی پێناسەی ئەمڕۆ پێی دەڵێن ڕۆژنامەنووسی نا شۆڕشگێر، ئایا شۆڕشگێری و ناشۆڕشگێری ڕەنگدانەوەی بەسەر ڕۆژنامەنووسدا هەیە؟**

** من بەمانای حزبایەتی نایڵێم کابرا ببێتە پێشمەرگە، مەبەستم لە خلیسکان ئەوەیە کە لە دەزگاکەدا ببێتە سانسۆر بەسەر برادەرەکانیەوە. جارێکیان سەرم

لەمامۆستا (هێمن)دا، دەیگوت لە[ هاوکاری] کە شتێکت بڵاودەکردەوە هەندێ نووسەری کورد دەهاتن راپۆرتیان دەنووسی و دوژمنیان ئاگادار دەکردەوە و دەیانگوت مەبەستی ئەوەو ئەوەیە. خلیسکان ئەوەیە ،نەک ئەوەی لەم گۆڤارانە دەنووسن. من پێموایە ئەم جۆرە کەسانە نەخوێندەوارەکانن، ناڵێم نەبووە، بەڵام رۆژنامەنووس و نووسەری رەسەن زۆربەیان خۆیان پاراستووە. ئەوە جێگەی شانازی ئێمەیە، جا نەک هەر لە کوردستانی ئێمە، بەڵکو لە پارچەکانی دیکەش رۆژنامەنووسان و نووسەران سوودیان لەو دەزگایانە وەرگرتووە کەحکومەتەکان بۆ مەبەستی دوژمنایەتی کردن دایانمەزراندووە.

*** بەڕێزتان دوای ئەم ئاماژە کردنانە لە هەردوو رووی سەلبی و ئیجابیەوە بۆ رۆژنامەنووسی بەر لە راپەڕین، ئێستا وەک وەزیری رۆشنبیریی لە حکومەتی هەرێمی کوردستان قۆناغێکی تازە لە رۆژنامەنووسی کوردی دەستی پێکردووە . ئێوە لەسەرووی دەسەڵاتی رۆژنامەنووسین لەرووی دەسەڵاتی سیاسیەوە، پێتوایە حکومەتی کوردستان (ماوەی دەسەڵاتی بەرەشی لەگەڵدا) توانیویەتی بەشێک لە ئازاری رۆژنامەنووسی بەر لە راپەڕین و دوای راپەڕین چارەسەر بکات، یاخود هەنگاوی نابێت؟**

** ئەوەی راستی بێت  چ لەکاتی بەرەو چ حکومەتی هەرێم و چ حزبەکان ،نەپڕژاونەتە سەر دانانی بەرنامە بۆ رۆژنامەنووسی و چاکی بکەن. جا دەتوانم بڵێم شێوەی پەرەسەندنیش هۆکاری حزبی هەبوو بۆ ململانێی حزبایەتی و کۆکردنەوەی خەڵک لە دەوروبەری خۆدا. پتر لە (١١٠) گۆڤارو رۆژنامە داوای ئیجازەیان کردووە، ئێستە نزیکە، (٣٠-٤٠) گۆڤارو رۆژنامە تەنیا لە هەولێر و دهۆک دەردەچێت. دیارە رۆژنامەنووسان و نووسەران لەم چەند ساڵەدا بیرو بۆچوونی خۆیان پێشنیار کردووە، بەڵام سەرکردایەتی سیاسی تائێستا نەهاتووە دابنیشێت و سیستەمێک بۆ چارەسەری گیروگرفتە سیاسیەکان دابنێت.

*** بەڕێزتان لەماوەی تەمەنتاندا رۆژنامەنووس و شۆرشگێربوون ئەو حکومەتە بەرهەمی ئەو شۆرشە بووە، هەست دەکەن حکومەتی هەرێم هاوکارن لەگەڵ تۆدا کە بەپەلە کارە رۆشنبیری و رۆژنامەنووسیەکان چارەسەر بکرێن، یاخود وەک رۆژنامەنووسێک لەململانێ دای تا بەرهەمێک بەدەست بێت؟**

** رۆژنامەیەک یان رۆژنامەنووسێک حاڵی چاک دەکرێت، ئەوە چاککردن نیە، بەڵکو رۆژنامەنووسی پێویستی بە رێکخستنی کارەکان هەیە.  بۆ نموونە ئێستا دوای هەوڵێکی زۆر پرۆژەی سەندیکای رۆژنامەنووسانمان گەیاندە پەرلەمان، کە دەرچوو ئەوە حکومەتی هەرێم بەڵێنی داوە ئەو ئیمتیازاتانەی کە لە یاساکەدا هەیە دابینیان بکات.

هەروەها پێویستە پرۆژەیەکیش بۆ رێکخستنی کاروباری رادیۆ و تەلەفزیۆن هەبێت. هەروەها کۆڕی زانیاری کوردستان.. واتا ئێمە دەتوانین لەم رێگەیەوە چارەسەری گرفتەکان بکەین ئەگینا ئەوی دیکە مەسەلەیەکی تایبەتی و شەخسی دەبێت، بۆ رێکخستنی کارەکانیش چیمان داواکردووە کراوە. یەکێک لەوانە بۆ ئەو نووسەرو رۆژنامەنووسانەی تەمەنێکی زۆریان لە خزمەتی رۆشنبیری و رۆژنامەگەری بەسەر بردووە مووچەیەک بە شێوەی پاداشت و هەمیشەیی بۆیان دابین بکرێت ئەویش رەزامەندی وەرگیراوە، دیارە ئەمەش مافێکی شەرعی خۆیانە... دیارە بۆ ئەم کارانەش کەم تا زۆر گرفتێک دێنەڕێ کە لە دەسەڵاتی کەسدا نیە.

*** وەک ڕۆژنامەنووسێک و ئێستاش بەشێکی لە دەسەڵاتی سیاسی، هیچ جارێک وەک ڕۆژنامەنووس لەکاتی ئێشدا خۆت لە ئۆپۆزسیۆندا بینیوەتەوە؟**

****** ئێستا یەکێک لە کێشەکان بڵێم ئا... ئەوە ناکرێت، چونکە یەکێک لە ئاستەنگەکانی مرۆڤ ناتوانێ هەموو شتێکی کارگەی دروست کردنی بڕیاری سیاسی، لەدەرەوە قسەی لەسەر بکات. نزیکەی (٣٠) ساڵ دەبێت من لەسەرکردایەتیەوە نزیکم و (٢٣) ساڵیشە لە جەرگەی دەسەڵاتی سەرکردایەتی سیاسیم نەک تەنیا هی پارتی، بەڵکو هی هەموو حزبەکان بە حوکمی تێکەڵاوی و لێکتر نزیکی بارەگاکان. بۆ ئۆپۆزسیۆن بەڵێ، بەڵام بە چ مانایەک؟

زۆر را هەبووە نەک من، خەڵکی دیکەش نارەزایەتییان هەبووە لەسەر مەسەلەی زۆر گەورە. بۆ نمونە لەکاتی شەڕی (عێراق - ئێران) بەردەوام بوو، ئایا پشتگیری بکەین یان نەکەین؟ یان کە بەرەی کوردستانی پێکهات خۆمان بۆ راپەڕین ئامادە بکەین یان نا؟ یاخود بڕیارە ئەساسیەکانی راپەڕین، ئێمە مانگی (٥)ی ١٩٩٠ باسی راپەڕینمان کردووە بەر لەوەی عێراق بچێتە کوێت ئەوە لە کاتێکدا کەس بەخەیاڵیدا نەدەهات - ئێمە بەرنامەمان بۆ داناوە. بۆ نمونە گفتوگۆ لەگەڵ بەغدا لەو دەمانەدا من بە ئیشوکاری بەرەی کوردستانی چووبوومە سوریا و پاشان زۆر وڵاتی دیکە، کە گەڕامەوە چەند بیروڕای جیاوازم هەبوو لەگەڵ پارتیشدا یەکی نەدەگرتەوە بڵاویشم کردەوە، من ناڵێم هەڵوێستم وەرگرتووەو لەو جوغزە دەرچووم.. نەخێر، بەڵام رام هەبووە.

*** کاری ڕۆژانەی بەدەر لە ڕۆژنامەنووسی ڕێگەی نەداوی وەک ڕۆژنامەنووسێک و ڕۆشنبیرێکی سیاسی هەڵسوکەوت بکەیت؟**

****** رەنگە هەر کەسە لە ژیاندا لەسەر خۆی جۆرێک بۆچوونی هەبێت، خەڵکیش بۆچوونی جیاوازیان لەسەری هەبێت. من هەرگیز نەمدەویست ببمە سیاسی.. بووم بە سیاسی، نەمدەویست ببمە وەزیر بوومە وەزیر، لە ساڵی ١٩٦٠ بۆ پلەیەکی حزبی گەورە پاڵێورابووم، وازم لێ هێنا. رەنگە بەخەیاڵمدا نەهاتبێت رۆژێک ئەندامی مەکتەبی سیاسی هیچ حزبێک بم... ئەوانە هەمووی بووم و پەشیمان نیم، بەڵکو بە بەشێک لە جێبەجێکردنی ئەرکی نیشتمانی و نەتەوەیی خۆمی دەزانم. من دامنابوو ببمە نووسەرێک، چیرۆک بنووسم، رۆمان بنووسم، کتێب بنووسم، هەروەها لە رێگەی رۆژنامەنووسیەوە مومارەسەی ژیانی خۆم بکەم ،کەچی وادەرنەچوو، بۆیەش ئێستا خۆم نە بە رۆژنامەنووس، نەبەسیاسی، نەبە وەزیر دەزانم.

*** مامۆستا فەلەکەدین ئەو ڕۆژنامەنووسەی بەزۆر کرابە ڕۆژنامەنووس، بەدرێژایی ئەو تەمەنەت ڕۆژنامەنووسێکی ناوداری ئەم میللەتەی، هەردەم وەک ڕۆژنامەنووسێک دێیتە خەیاڵی ئەم خەڵکە، لە پۆستی مەکتەبی سیاسیدا وەک ڕۆژنامەنووسێک مایتەوە، توانیت تەجاوزی ئەم قۆناغە بکەیت، چونکە هەمیشە دەڵێن دەسەڵاتی سیاسی و پۆستی سیاسی بۆ نووسەرو ڕۆژنامەنووس وەک تەڵە وایە و لەکاری دوور دەخاتەوەو لەباری دەچوێنێت، چۆن دەبێ ئێستا تۆ لە پۆستی وەزارەت لەململانێیدا نەبیت؟**

****** نەخێر، پۆستی وەزارەت پۆستێکی سیاسیە، لە هەموو دنیاشدا پۆستی سیاسی پۆستێکی کاتیە، هەر گۆڕانکارییەک یاخود هاوبەندیێک لەگەڵ حزبێک کرا رەنگە ئەو حزبە حەز لەو وەزارەتە بکات. پاشان من لەسەرەتاوە بە دوودڵی دەستم بەکارکرد، بەڵام ئێستا زۆر خۆشحاڵم کە توانیومە برادەرێکی زۆر پەیدا بکەم،

هاوکـاریم دەکـەن و هاوکـاریان دەکـەم. کـاتێ بە وەزیر دانرام و سـوێندمـان لە پەرلەماندا خوارد، دوای سوێندەکە گوتم یەک شت لای من گرنگە ئەویش ڕۆشنبیران و هونەرمەندان و نووسەران بڕواو متمانە بەخۆیان پەیدا بکەنەوە. سەرەتا کە دەست بەکاربووم کەم کەس بڕوای بەخۆی مابوو بەتایبەتیش بڕوایان بەوەزارەتەکەیان بێت، کە وەزارەتی خۆیانە. ئێستـا خۆشحـاڵم کـە ژمـارەیەکی زۆر لە ڕۆژنامـەنووسـان، نووسەران، هونەرمەندان هاوکاریمان دەکەن، ئەم هاوکاریە بە هاوکاری خۆم نازانم، بەڵکو بنەمـایەکـە بۆ ئاییندە کـەوا بتـوانین پێکەوە بۆ بزووتنەوەی ڕۆشنبـیـریی میللەتەکەمـان کاربکەین. دیارە لەمەوپێش ئامـاژەمـان بەوەدا کە پۆستی وەزارەت کارێکی کاتیە و کورد گوتەنی ئەو کورسیە گەر وەفای بۆ لەمەوبەر هەبوایە بۆ تۆ نەدەمایەوە.

دیارە خۆشحـاڵیش دەبم ئەگەر بەسـەلامـەتی لە وەزارەت بوومەوە، ئەگەر دەرفـەتیش بوو بڵـێم کـاکـە یەکـێکی وەک من لـە ئەندامی مـەکـتـەبی سیـاسـی بێت.پـتـر ناتوانم شتێکی دیکە بم خۆنابمە سەرکۆمار؟ بەڕاستـی دەمـەوێ کاتێک بدۆزمـەوە بنووسم ئینجا نووسینەکان بەکەڵک دێن یان نا، ئەوەیان شتێکی دیکەیە. پێش (٣٠) ساڵ ئەو کارانە باش بوون، بەڵام ئێستا نەخێر.

بەڵکو بتوانم ئەوانەش بکەمە بیانوو بڵـێم شوانی تەواو، شوانی حـەوت ساڵە هـی من (٣٠) سـاڵە، سوپاس بۆ خـوا ڕۆشنبـیـری باش لە کـوردسـتـان پێگەیشـتـوون و نەوەی نوێش بەڕێوەیەو دەبێ لە ئێمـەش تێپەڕێن، چونکە ئێمە هەر یەکەو لەکارێکی دیکەوە هـاتینە ناو ڕۆژنامـەنووسـی و بۆیەش ڕۆژنامەنووسانی ئێمـە ماف بە خـۆیان دەدەن لە هـەمـوو بوارێکدا بنووسن، بەڵام ئێـسـتـا لە دنیـادا شـتی وانیـە، هـەمـووی پسـپـۆڕیە، دەبێ زمانێکی زیندوو بزانێ، لەگەڵ پێشکەوتنی تەکنەلۆژیا بگونجێ و مامـەڵە لەگەڵ کۆمپیوتەر و ئەنتەرنێت بکات. کۆمپیوتەرمـان بەکارهێناوە، بەڵام وەکو پێویست نیە، دیارە ئەو مـەرجـانـە لە ئێـمـەدا نین، چونکە لەسـەردەمی ئێـمـەدا نەبوو، بۆیـە دەڵێم لاوانی نووسەرو ڕۆژنامـەنووس دەبێ هەوڵبدەن ئێمە جێ بهێڵن سەربەرزیە بۆ ئێمە، ئێمەش خۆمان بەجێمـاو حسـاب ناکەین، چونکە بەش بە حاڵی خۆمان لەسـەردەمی خـۆمـان توانیـمـان هێندە ئەرکـە بەجێ بگەیەنین، بەڵام نـەوەی نوێ، نـەوەی تەکنەلۆژیایە.

*** لە کـوردسـتـاندا ڕۆژنامـەنووس ناتوانێ باس لە ژیانی تایبـەتی کـەسـایـەتیـەکـان (مـەبەسـت ژیانی زۆر تایبـەتی نیـە) بکات، ئەوەی پەیوەندی بە ژیانی کۆمـەڵایـەتیـەوە هـەیە، وەک پەیوەندی لێپرسـراوان و خـاوەن دەسـەڵات، کەسایەتیـە نیشـتـمانیـەکان، ڕۆژنامـەگنووسی کـوردسـتـان بۆی نیـە باس لە ژیانی تایبـەتـی کرێکارێکیش بکات، وەک ڕۆژنامەنووسێک پێتوانییە ئەوە جۆرە لەنگیەک بێت؟**

** ئەوە دەکـەوێتـە سـەر ئەو ئاسـتـەنگانەی کە باسم کردن، مـەسـەلەی «دەسـەڵات و ئایین و سـێکس» ئەم سـێ شـتـە کـە تۆ نەتوانی باسی بکەی، ناتوانی باسـی هـیـچ شـتـێک بکەی. واتا ئێـمـە دەبێ ئاسـاییـانە وەری بگرین، وڵاتانی دەوروبەر تەنیـا هەندێک جار تورکیـای لێدەربچێ ئەگـەر نا قـەدەغـەیە، لە ڕۆژهەڵات بەگشـتی، ئەوە کەلتوورێکی خۆر هـەڵاتیە، کەسـایەتی بەشـتێکی پیرۆز دادەنرێت، بۆ نمونە کتـێبیان لەسـەر نەهرۆ نووسـی ڕەخنـەی تێـدابوو، ئەو کـات ئەندیرا گـاندی کـچی مـابوو ڕەخنەکان بچووکیش بوون سەبارەت بە هەندێ ئیجرائات لەڕووی سیاسەتی ناوەوەو دەرەوەدا . یەکسـەر ئەندیرا ڕەخنەی لەوانە گرت کە ڕەخنەیان لە کتێبەکە گرتووە،

لایەنگرانی ئەهرۆ تووڕە و پەست بوون، چۆن باسی ژیانی ئەهرۆ دەكرێ، ئەهرۆ مردووە.
ئەندێرا بۆ ڕۆشنبیران وەڵامی دایەوەو گوتی ژیان و كەسایەتی ئەهرۆ شتێكی گشتی میللەتە، هەموو كەس مافی هەیە قسەی لێ بكات نابێ كەس ڕێگەی لێ بگیرێت. یان فیلم لەسەر عەبدولناسر دەرهێنراوە، لە دیمەنێك عەبدولناسر بیجامەی لەبەرە ،كچەكەی شكاتی كردووە چۆن دەبێت باوكی بەبیجامە دەربچێت..؟ ڕەنگە بەرووتیش خەوتبێ، باشە ئەی چۆن فیلمەكە دەربكەی ئەگەر باس لە چوونە حەمام بكات؟!
مەبەستم ئەوەیە بەس كورد نیە، زۆربەی زۆری میللەتانی ئەم ڕۆژهەڵاتە ئاوهان، كوردیش لەرووی كۆمەڵایەتیەوە لەوان دواكەوتووترە، هەركەسەو ژیانی خۆی بە پیرۆز دەزانێ، لەكاتێكدا وانیە. من ناڵێم باسی هەموو شتێكی مرۆڤ بكرێ، بەڵام زۆر ئاساییەو ڕەنگە یەكێك لەلایەنە گرنگەكانی ئەدەب لە دنیادا باسی ژیانی تایبەتی و كەسایەتی بێت.
لە دنیا بەكارێكی جوان و ئیجابی سەیر دەكرێت، بۆنمونە (ڕۆسۆ) كارێكی زۆر سەیری لێدەگێڕنەوە، بە فەیلەسوفیش دەژمێردرا و گەورەترین پیاوی ئاشتیش بوو، لەسەر زۆر شتی كەم نامە بڵاودەكرێتەوە، كەچی لەم وڵاتانە و لە كوردستان بەداخەوە!
*** ڕۆژنامەنووسی ئافرەت لە وڵاتی ئێمەدا زۆركەمە تاكو ئێستاش ئافرەتێكی ڕۆژنامەنووسمان نیە ئەگەر خاتری كەس نەگری ناكرێ لەریزی پیاوانی ڕۆژنامەنووسی دابینێن؟**
** ئەوەش دەگەڕێتەوە بۆ سەر باری كۆمەڵایەتی، ئەو ڕۆژە خوشكێك لە گۆڤارێكی ئافرەتان پرسیاری كرد رات چیە لەسەردەرچوونی ئەم گۆڤارە؟ گوتم ئەوە پیاوان دەینووسن و پیاویش دەیخوێننەوە، خوشكە برام....
ئێستا بەبۆنەی (١٠٠) ساڵەی ڕۆژنامەنووسی كوردی د.كوردستان موكریانی كتێبێكی بۆ ناردووین و دەربارەی ڕۆڵی ئافرەتان لە ڕۆژنامەگەریدا باس لەو پیاوانە دەكات كە بە ئیمزای ئافرەتان بەرهەمیان بڵاوكردوەتەوەو ناوەكانیشی ئاشكرا كردوون.
*** لە ژیانی خۆت هیچ جارێك بەناوی ئافرەت شتت نووسیوە؟**
** بەڵێ منیش نووسیومە، بەڵام تەماشام كرد، چونكە ناوەكان زۆربوون ناوی منی نەهێناوە.
*** یەكێك لە سیفەتەكانی بەڕێزتان زۆر شت بەناوی خواستراو بڵاودەكەنەوە و بڵاوتان كردوەتەوە، ئەم نازناوانە حەزە یان واقیعێكی سەختە كە وایكردووە بەناوی خۆت بەرهەم بڵاونەكەیتەوە؟**
** یەكەم جار بەرەسمی لە ساڵی (١٩٦٥) ناوی من لە ڕۆژنامە قەدەغە كرا، ئەوكات وتارێكم لەسەر (دڵداری شاعیر) نووسیبو ناوی كوردستانی تیابوو، سەركۆماری عێراق عەبدولڕەحمان عارف بەسەرنووسەری ڕۆژنامەكەی گوتبوو نابێ فلانە كەس شت بڵاوبكاتەوە ئەوسا من تازە دەستم پێكردبوو دووچاری ئەم واقیعە هاتم و بۆیە ناچار بووم بەناوی خوازراواەوە بنووسم منیش گەنج بووم عینادی گرتمی، پاشان لە (تأخی) بەناوی ئاشكراو ئینجا هەلومەرج گۆڕاو جارێكی دیكە بەناوی خوازراوەوە، ساڵی ١٩٧٢ نووسەرێكی ئەڵمانی دێتە بەغداو دەربارەی نووسین و ژیانی ئەو

کەسانە سەرو سۆراخ دەکات کە بەناوی خوازراو نووسیویانە لە عێراقدا ئەو کات من بە عەرەبی دەمنووسی، ئەوکات راگەیاندنی عێراق نەیهێشت ئەو نووسەرە من ببینێ، ئەوکات ناوی خوازراو لە رۆژنامەگەری عێراقیدا ببووە دیاردە.

*** سانسۆر...؟**

** هەم لەبەر سانسۆر و ببووە عادەتیش، یان ئەوکات زوو زوو کودەتا دەبوو.

*** سانسۆر وای لێکردی بەنازناو بەرهەم بڵاوبکەیتەوە، لەم دواییە واباوبوو کە گوایە بەرێزتان لایەنگری لە جۆرێک سانسۆر دەکەن بەسەر چاپەمەنییەکاندا، خۆت بەرێزی مێژووت لەریزی رۆژنامەنووسە ئازادیخوازەکاندا بووی، ئەوەچی دەگەیەنێ، بەراستی تۆ بروات بەسانسۆر هەیە لە رۆژنامەنووسیدا؟**

** لە خۆتان دەپرسم رۆژێک سەرم لە رۆژنامەیەک داوە بڵێم چی دەکەن، تاکو ئەو رۆژنامەیەی خۆم کاری تیادا دەکەم و سەرنووسەرم تیایدا هەفتەی نیو سەعات دەیبینم، من نەمگوتووە سانسۆر گوتوومە باری راگەیاندن لە کوردستاندا پێویستی بە جۆرێک کۆنترۆڵ کردن هەیە، ئایا تەلەڤزیۆنێک مافی ئەوەی هەیە (١٠) سەعات کەناڵێکی سەتەلایت بگوازێتەوە، یان رادیۆ بۆی هەیە هەموو جۆرە گۆرانییەک بڵاوبکاتەوە. لەمیسر لیستەیەک گۆرانی لەوەزارەتی راگەیاندنەوە دەرچووە کە ئەمانە قەدەغەیە، چونکە لەگەڵ زەوقی گشتی ناگونجێ، یان وشەکانی یان مۆسیقای یان گوتنی لە ئاستێکی نزمدایە.

وەزارەتی رۆشنبیری پەروەردەی چێژی گشتی دەکات، با ئەو گۆرانییە لە بازاڕ هەبێت، بەڵام لە تەلەڤزیۆن و رادیۆ لێ نەدرێت، چونکە ئاستێکی نزمی هەیە.

هەر هیچ نەبێت با بەرنامەکانی خۆماڵی (٤٠٪) بەرنامەی کەناڵەکانی راگەیاندن بێت، واتا خۆت ماندوو بکەی نەک هەر لە سەتەلایت نەقل بکرێت، یاخود سنورێک هەبوو کەواتا مافێک هەیە ئەم گۆڤارو رۆژنامانە دەربچن، هەرگیز داوای ئەوەم نەکردووە سانسۆر بخەمە سەر رۆژنامە، ئێستا لیژنەیەکمان هەیە ئەویش بە ئاگاداری ئەنجومەنی وەزیران و لەسەر داخوازی ئێمەیە بۆ رێکخستن و کۆنترۆڵکردنی رادیۆ و تەلەڤزیۆن لە هەرێمدا بۆ هەر رێکخستنێک من لایەنگری دەکەم، بەڵام مانای سانسۆر جیایە.

*** مامۆستا فەلەکەدین ئێمە سەربەرزین رۆژنامەنووسی وەک ئێوەمان تیا هەڵکەوتووەو ئەم گفتوگۆیەمان بەبۆنەی (١٠٠)ساڵەی رۆژنامەگەرییەوە لەگەڵ سازکردی و زۆر سوپاست دەکەین و هیوای تەمەن درێژیت بۆ دەخوازین.**

** سوپاسی هەمووتان دەکەم بەتایبەت کە ئێوە هەمیشە گوێمان لێدەگرن.

مەسعود محەمەد:

# یەکخستنی زمانی کوردی بە قەد جەنگی جیهانی دووەم زەحمەتە

* مامۆستا ئەمساڵ [١٩٩٨] ڕۆژنامەنووسی کوردی ١٠٠ ساڵ تەواو دەکات، ڕۆژنامە بە هەموو ڕەنگەکانیەوە لە ژیانی کۆمەڵی کوردەواریدا دەبێ کاریگەرییەکی ئەوتۆی هەبووبێ، کە کورد ئێستا بە حەسرەتەوە خۆی بۆ یاد کردنەوەی ئامادە دەکات و دەیەوێ هەڵی سەنگێنێ؛ کە چ کاریگەرییەکی لەسەر کۆمەڵی کوردەواری هەبووە. بەڕێزتان وەک نووسەرێکی ناوداری ئەم وڵاتە، کە هەموو ژیانی خۆت بۆ نووسین تەرخانکردوەو بەشێکی زۆری نووسینەکانیشت جیا لە کتێب لە ڕۆژنامەکاندا بڵاوکردۆتەوە، ڕۆڵی ڕۆژنامە لە ژیانی مرۆڤی کورددا چۆن دەبینی؟

** دەرچوونی ڕۆژنامەیەکی کوردی لە شارێکی بێ کورد، لەلایەن کەسێکی تەنیاو هەژاری بێ دەسەڵاتی کورد، دوور لە ڕۆشنبیریی کورد ،چ وێنەیەکی واقیعی کورد دەگرێ؟ لە هەمان کات گیانفیدایی تاکی کورد دەگەیەنێ، کەسێک لە قاهیرە ڕۆژنامەیەکی کوردی دەربچوێنێ، بەبێ پشتیوانی و بێ ئەوەی بزانێ چارەنووسێکی دیاری دەبێ. ئەوە خۆی لەخۆیدا قارەمانیەتیەکە، لەخۆبووردنە، چونکە ڕۆژنامە کارێکی گەورەیەو شتێکی هەرە سەرووی کۆمەڵایەتیە کە بریتیە لە نووسین و چاپکردن و زانیاری دان و کۆکردنەوە.

واتە ڕۆژنامەنووسی لەناو کورددا ،خۆی لوتکەیەکی بەرز دایە- ئەگەر بەراوردی بکەی لەگەڵ وڵاتانی پێشکەوتوو کە پێموایە ئەوەیان بەراورد ناکرێ، بەڵام بۆ ئێمە شانازیە کە ڕۆژنامەمان هەیە؛ خۆمان لە واقیعێکی نزمداین و ڕۆژنامەشمان لە لوتکەیەکی بەرز دایە.

٢٥٠٠ ساڵە کورد خاوەنی هیچی خۆی نیە. واتە(٢٥٠٠) ساڵە یەک ڕستە بە کوردی نەنووسراوە. بەم دوواییە شیعر پەیدابوو، لە سەرەتای ئەم سەدەیەش لە کۆیە قوتابخانەیەک لەسەر داوای باوکم (مەلای گەورە) بە کوردی کرایەوە، لە سلێمانی قوتابخانەی ڕوشدیەی عەسکەری هەبوو، لە کۆیەش سلێمان نەزیف بروسکەی لێداوەو دەڵێ لەسەر شەرەفی مەلا محەمەد ئەفەندی ئەم قوتابخانەیە دەکەینەوە. مەبەستم ئەوەیە کە هەمووی (٩٠) ساڵە نووسینی کوردی و کتێبی کوردی پەیدا بووە.

کورد مادام بێ دەسەڵاتە ، کەواتە بێ ڕۆشنبیریشە، بێ بازرگانیە، بێ زانستەو بێ

هەمــوو شــتــێکە. جــاران دەگــوترا عــەشــیــرەتگەری بووەتــە هۆی دروست نەبوونی حکومەتی کوردی، بەڵام بەداخەوە لەم دواییە هەرچی نەزم هەیە هەمووی تێکچووە.

*** مـامۆسـتـا پێت وایە ئەو بێکەسـیـەو چەوسـانەوەیەی کە لەسـەر مـیللەتی کـورد هەبـووە، هۆکـاری بـنـەڕەتـی نـین لەوەی کــە ڕۆژنـامــەنـووســیــێکی ســیــاســی یان سیاسەتوانێکی وەک میقداد مەدحەت بەدرخان کە لە خێزانی بەدرخانیەکانەو لە چەقی بزووتنەوەی شـۆڕشگێڕی نـەتەوایەتی کـوردا بوونە، دوای ئـەم تێکشکانەی بەسـەریان هـات پەنایان بۆ بواری ڕۆژنامـەنووسی و ڕۆشـنبـیـریی برد. پێت وانیـە لایەنی بێکەسی و چەوسـانەوەکە وای لێکرد کـە ئەم ڕۆژنامـەیە لـە دەرەوە دەربچێ ئەگینا کورد دەیتوانی ڕۆژنامەکە لە کوردستان دەربکات؟**

** نازانم دەیتوانی یان نا، چونکە بڕوا ناکەم چاپخانە لە کوردستان هەبووبێ.

*** کەسایەتی میقداد بەدرخان، ئەو کابرایەی توانی یەکەم ڕۆژنامەی کوردی لە دەرەوە چاپ و بڵاو بکاتە ـــ چۆن هەڵدەسەنگێنی ؟**

** ئەگەر بە دەسـتم بێ لە هەمـوو شـارەکـان پەیکەری بۆ دەکـەم، هەنگاوێکی ناوە کەس نەیناوە.

*** دوای ئەم سەدەیە، مـەسـەلەی ڕۆژنامەنووسان لە کوردسـتاندا، بەدرێژایی (١٠٠) ســاڵ پـتــر پانتــاییــان بۆ کــاری فــیکری تەرخــانکردوە. ئایا لـەم بوارەدا تا چـەند توانیویانە ڕۆڵی شیاوی خۆیان ببینن؟**

** بەشی زۆری ڕۆژنـامـە نـهێنی و ئاشکراکـان لە دەست شـیـوعیـەکـاندا بوون، ئەوانەی قەومیش بوون، هەر سەرو سەودایەکیان لەگەڵ مارکسیەت پەیدا کردبوو.

*** مـامـۆسـتـا لایـەنێکی دیکەی ڕۆژنامـەنووسی کـوردی ئەوەیە، بایەخـی بەبواری ئەدەبیش داوە، کەچی نووسـینی ئەدەبی پتر لە گۆڤارو کتێبدا بڵاو دەکرێتـەوە. لە کوردسـتاندا ئەو ڕۆژنامـانەی لە شاخ یان لەژێر دەسەڵاتی حکومەتیش دەردەچوون ، ئێسـتاش ئەوانەی لەدوای ڕاپەڕین دەردەچن گرنگیەکی زۆر بە ئەدەب دەدەن. تۆ پێت وایە ڕۆژنامەنووسی بۆچی کارێکی وایکردوە، یان ناچار بووە بیکات؟**

** ڕۆژنامـەنووسی خـۆی لـەخـۆیدا ڕۆڵی شـارسـتـانی دەبینێ. دەتوانین بڵـێین ڕۆژنامـەنووسی کوردی ڕووخسـارێکی گەشـە، هەرچەنـدە جاروبار جنێو و قسـەی ناشیرینیشی تێدایە، ئەگەر جنێو بەخۆشم دەدەن، دەستیان خۆش بێ.

*** لەبواری زمـان، زمـانی ڕۆژنامەنـووسی لە هەموو دنیادا م هەندێ جار لە قاڵب و پێویستی زمـان دەردەچێ، بەو حوکمەی کە ڕۆژنـامەنووسی زمانی سادەی گفتوگۆیە لەگەڵ خـەڵکی ئاسـایی. گرفـتی زمـان لـە کـاری ڕۆژنامـەنووسـیدا لەسـەرەتاوە تاکو ئێستا ئەگەر لێی وردبوویبەوە، لە چ بوارێکدا سەرنجی ڕاکێشاوی؟**

** کـورد تا ئێـسـتـا زمــانی ئەدەبیی یەکگرتووی نیـە، چونکە دەوڵەتی نەبووە، زمـانێکی نیـە تێکرا قـەبوڵی بکات. هەندێ شێـوەزار هەیە ئەوی دیکە تێیناگـا. وا دەگەینە سـەدەی (٢١)، کەچی هێشتا هەر کەسەو خۆی بێ سوارچاکەو بۆخۆی لێی دەخـوڕێ. بڕوا بکە یـەکخـسـتنی زمـانی کـوردی بەقـەدەر جـەنگی جـیـهـانی دووەم زەحمەتە.

*** ڕۆژنامەکانی کوردستان ئەوەی کە سـەرنجی بەڕێزتانی ڕاکێشابێ لەم دوو شتەدا ڕۆڵیان لە کامیان پتر بووە؛ لە تێکدانی زمان یان لە بەرەو پێش بردنی؟**

** شـتـەکـان تێکەڵن، ناتوانم لایەنی سـەلبی بەسـەر لایەنی ئیـجـابیـدا زاڵ بکەم. کـابرایەک دوو چاوی کـزی هەیە، دوو چاوە کـزەکـە چاکـتـرە لەوەی کـە نەیبێ. بۆیە

رۆژنامەکان بە هەموو عەیبەکانیانەوە رۆڵێکی شارستانی دەبینن و پیرۆزبایيان لێدەکەم. لەهەمان کاتدا داوایان لێدەکەم خەڵکی لە هیچ و خۆڕاییەوە عەیبدار نەکەن، کابرایەک لەماڵی خۆی دانیشتووە، هیچ عەیبی نیە تۆ لەولاوە ملی لێ دەنێی.. ئەوەش کە روو دەدات لەبەر ئاستی نزمی باری شارستانیمانە. رەنگە تاک تاکە پیاوی چاک بین و شەرم لە خۆمان بکەینەوە.

*** مامۆستا پێت وایە کورد وەکو شارستانیەت نزم بێت، نەک تاک تاک و لە کەسێکەوە بۆ کەسێک. ئایا پێتوایە بەشێک لە لاوازی و لە بیدائیەتی مرۆڤی کورد بۆ بیدائیەتی شارستانی کورد دەگەڕێتەوە؟**

** ئێمە هەتا ئێستا به هەموو مێژوومانەوە سەرافێکمان نەبووە، نەک بانک. ئێستا ئێمە خاوەنی دراو نین، خاوەنی رێگەیەک یان پردێک نین کە خۆمان دروستمان کردبێ.

ئەگەر دەڵێی بۆرژوازین، ئێمە بۆرژوازی نین و پێش بۆرژازیەتین و هێشتا نەگەیشتووینەتە پلەی بۆرژوازیەت، چونکە بۆرژازیەت بەواتە؛ هەبوونی ئابوریە. ئەگەر پارەدارێکی کورد لە هەولێر ببەیتە موسڵ زۆر بە ئاسانی کارەکانی خۆی بەرێوە دەبات. ئەگەر یەکێک لێرە خاوەنی سینەمایەک بێت، یان فرۆکەو تۆپ و شتی لەم بابەتەی هەبێت، پێی دەڵێن بۆرژوازیەو لێرە چەقیووەو هەڵناقەندرێ، بەڵام بەپێچەوانەوە ئەوانە رەگیان نیە لەوانەیە هەندێک پرۆژەی وەک دەواجن هەیە، خاوەنی ئەم پرۆژانە حەزیان لە کارەبایە، حەزیان لە جادەی رێکوپێک و دادگەو پۆلیسە، چونکە ئیشەکەیان لەگەڵ شارستانیەت دەڕوات. خەڵکەکەی دیکەش کە خەریکی کاری قاچاخچی بوون، حەزیان لەوەبوو نە پۆلیس هەبێ و نەحکومەت و نەکارەبا، بەڵکو تەنیا بە سواری هێستر شتەکان بۆ ئێران بگوازنەوە.

*** کاری رۆژنامەنووسی رەنگدانەوەی کام لەم دوو واقیعانەیە کە جەنابت باست کردن؟**

** قوربان بەشێوەیەکی ئاسایی چاری ناچارە دەبێت هەڵکشێ لە کابرایەکی سواری کەرەوە ببێتە چیمەنتۆ دز.

*** دەڵێن گوایە لە پەنجاکانیش گرنگیت بە باری ئابوری و ژیانی ئابوری کوردستان داوە، وەک توتن و شتی دیکە؟**

** کاتێک لە پەرلەمانی عیراقدا نائیب بووم ،پازدە گوتارم لەسەر توتن نووسی و بەهۆی ئەو گوتارانەوە (مدیریەتی عامی ئینحسار) ئەو وەختە هەڵوەشایەوە. لە دوایيدا منیش لە نائیبی نەمامەوە ئەگینا پترم دەنووسی. هەروەها لە کاتی بەندکردنی بارزانیەکان توانیم لە پەرلەماندا وابکەم بۆ ماوەی پازدە رۆژ هەموویان ئازاد بکرێن.بەداخەوە بۆ جاری دووەم ماوەم نەبوو ببم بە نائیب دەنا گەلێک کاری دیکەم ئەنجام دەدا.

*** لە بواری سیاسی لە ماوەی ژیانی خۆت ئەگەر بە تێکرایی کاریگەری سیاسی لەناو رۆژنامەنووسی کوردی وەربگرین رۆژنامەکان چەند توانیویانە ئەو ئەرکە بەجێ بگەیەنن و وەکو مینبەرێکی سیاسی رۆژانە یان مانگانە خەڵک لە باروبۆخی سیاسی، لە بۆچوونە جاجیاکانی سیاسی ئاگادار بکەنەوە توانیویانە لەو بوارە رۆژنامەی سیاسی بە واتای کەلیمە بنووسنەوە؟**

** دەتوانم بە باوەڕەوە بڵێم پێش ئەوەی لە (٤٥)وە مارکسیەت لە کوردستان بڵاوبێتەوە، ئەوانەی کاری ڕۆژنامەوانییان ئەنجام دەدا، وەکو سەربازێکی نەناسراو وابوون. لە دوایــدا بارودۆخ گــۆڕاو ئایدیۆلۆژیەت و چینایەتی هاتە ناوەوەو بزووتنەوەی کوردی بەرەو چینایەتی ڕۆیشت، چونکە ئەگەر بزووتنەوەی نەتەوەیی کورد بەهێزتر بووایە ،بزووتنەوەی چینایەتی کوردی لەگەڵ هی عەرەب دادەبڕاو کەرت دەبوو، بۆیە دەبوو واز لە کوردایەتی بهێنرێ. هەڵبەت لەلایەنی ئازایەتی و فیداکاری کورد، خوا هەڵناگرێ خەڵکی ملی خۆی لە چەقۆ دەسوو. بۆ نموونە لەسەردەمی عەبدولکەریم قاسم ڕۆژنامەی پارتی درایە دادگا، بەلام من و دوو کەسی دیکە بووینە هۆی قورتار بوونی.

*** تۆ لە کوردستاندا هەست بەبوونی ڕۆژنامەنووسی دەکەیت؟**

** بەڵێ، چاکیش هەستی پێ دەکەم، گەلێک جاریش لێی تووڕە دەبم، بەلام ئەگەر پێم بکرێت دەست لە پشتی دەدەم و دەستخۆشی لێدەکەم.

*** لە ماوەی یەک سەدەی ڕۆژنامەنووسی کوردیدا، گرنگیەکی زۆر بە مافەکانی مرۆڤ دراوە، بەتایبەتی مافی ئافرەت و منداڵ، پێت وایە ئەم گرنگی پێدانە تا چەند کاریگەر بووە بۆ ڕزگارکردنی ڕۆشنبیری کوردی و تاچەند بووە بە دروشم بۆ ململانێی سیاسی؟**

** ئەو خەڵکە کاک ئەحمەدی شێخ نیە خۆی بکاتە قوربانی . ئەگەر لە سیاسەتەکە کار نەکات کاری دیکەی چۆن بۆ دەکرێ و چۆن پارەی خۆی خەرج بکات، یان ئەگەر پارەداریش بێت پارەی خۆی لەم ڕێگەیە خەرج ناکات، بۆیە دەبێت هەر لە ڕێگەی سیاسەتەوە بۆ ئەم بوارە کار بکات.

*** لەماوەی ئەو سەد ساڵەی ڕۆژنامەنووسی کوردیدا گرنگیەکی زۆر بە مرۆڤ دراوە بە هەموو چین و توێژەکانیەوە؟**

** ئەو ململانێیەی لە نێوانی ناوەندەکانی چەپ و ڕاست و ناوەڕاست هەبوو کە لە نواندنی چالاکی سیاسیدا دوژمنی یەکدی بوون، هەریەک بە ئایدیۆلۆژیای خۆی خزمەتی وڵاتەکەی کردوە، بەلام بە داخەوە لە ڕۆشنبیری کوردی و لە سیاسەتی کوردی ناوەڕاست قەت نەیوێراوە سەر هەڵبێنێ. ئێستاش دوو حزبی دەسەلاتدار هەیەو دیسان ناوەڕاست بووەتە پەراوێزی هەردوو حزبەکە.

*** ئەگەر بەراوردێک بکەی لە نێوان قۆناغەکانی مێژووی ڕۆژنامەنووسی کوردی، وەک سەردەمی ڕۆژنامەنووسی نهێنی و سەردەمی شاخ و شۆڕش و سەردەمی دانوستانەکان و ڕۆژنامەکانی حکومەتی ناوەندی و دوای ڕاپەڕین ،چ جیاوازییەک لە نێوان قۆناغەکاندایە؟**

** زۆر زەحمەتە ئەم وردپێویە دەستنیشان بکرێت؛ بڵێی فلان (٢٠)ی وەرگرت و فلان (٢٥)ی وەرگرت، زۆر زەحمەتە ئەم شتانە دەست نیشان بکرێن. بۆ نموونە من دەڵێم هاوین گەرمە، بەلام نازانم کام ڕۆژی لەکام ڕۆژی گەرمترە.

*** کامیان سەرنجی جەنابتانی پتر ڕاکێشاوە، کامیان کاریگەرتر بووە لە تەکوینی تۆدا؟**

** بە ڕای من ڕۆژنامەگەری بەپێی کەش و هەواو بارودۆخی ژینگەو وڵات بووە، ئەگەر بارودۆخ خۆش بووبێ باش بووەو بەپێچەوانەوە خەراپ بووە. ئێستا کوردستان ئابلۆقە دراوە، هەردوو حزبەکە لەگەڵ یەکدی دڕدۆنگن و هەر قۆناغێک بەپێی بارودۆخ کاری خۆی کردوە.

*** بەڕێزتان بە حوکمی ژیانتان لە بەغدا، لەگەڵ ڕۆژنامەنووسی ئەوێدا ژیاوی، هەندێ را هەیە پێی وایە سەلبیات لەناو ڕۆژنامەکانی دەرەوەی دەسەڵاتداریی کوردیشدا زۆرە. تۆ کامیان زۆرتر دەبینی؟**

** ڕۆژنامەیەکی کوردی لە بەغدا دەرچێ دەبێت ئاگای لەخۆ بێت کە سەدام حوسێن چی دەوێت و لەچی توڕەیە. وەکو دەڵێن ئەگەر لە خەتی سور لابدات پێی دەبڕنەوە. من کە دەنووسم گوێ نادەمە هیچ کەسێک و ئەوەی لەناو دڵمە ئەوە دەنووسم و تا ئێستا هەموو شتێکم بە ئازادی تەواوەوە نووسیوە. لە دائیرەی ئەمنەوە پێمگەیوەو گوتویانە ئەگەر لە سەرەوە فەرمانمان پێ نەکرایە نەماندەهێشت وا بنووسی. ئەو ساڵەی کە چوومە ئوردن و ماوەیەک لەوێ بووم، حکومەت بە دوایدا ناردم کە بگەڕێمەوە. کە هاتمەوە یەکێکی زۆر گەورە لەگەڵم دانیشت کە نوێنەرایەتی سەدام و حکومەت و حزبی دەکرد، لەسەر مەسەلەی کورد قسەی لەگەڵ کردم و گوتی لەگەڵ کێ بین و چۆن بین... هەر لەو دانیشتنە پێی ڕاگەیاندم کە هەرچی لە مێشکمدایە بینووسم و بە ڕاشکاوی بڵاوی بکەمەوە. ئەو شتانەی کە بڵاویشم کردونەتەوە ئەگەر هی من نەبن هەرگیز لە کەسی دیکە قەبوڵ ناکەن.

*** لەوەدا من تێدەگەم کە لایەنی ئیجابی بە رای جەنابت، لەو بەشە لە ڕۆژنامەنووسیدا یەکجار زۆر بووە، ئێستا کە لە ڕۆژی ڕۆژنامەنووسی نزیک دەبینەوەو خەریکە گەورەترین فیستیڤاڵ بۆ ئەم یادە بەڕێوەبچێت، چ قسەیەکت هەیە بۆ ڕۆژنامەنووسانی کورد بیکەیت، پێت وایە دەبێت لەمەودوا چی بکرێت؟**

** لە ڕاستیدا ئەوەی من ئاگام لێ بێت تا ئێستا کەس خۆی نەفرۆشتوە، بەتایبەتی ئەوەی دەیناسم و سەرپەرشتی چاپ و ڕۆژنامە دەکات، ئەوەش کە نایناسم نازانم.

*** ئەو کۆمەڵە ئەفەندییەی کە من بە نووسەرو ڕۆژنامەنووسیان دەزانم، لە سەرگەی تەواوبوونی سەدساڵەی ڕۆژنامەنووسیدا، بەڕێزت وەک نووسەرێکی خاوەن ئەزموون چ قسەیەکت هەیە ئاراستەیان بکەیت؟**

** زۆر زەحمەتە پیاو جورئەتی ئەوە بکات و بڵێ واز لە لاپەڕەی خۆت بهێنە، دوو مانگ پێش ئێستا کە مانگ گیراو خەڵکی تەپڵیان لێ دەدا، ئایا بە قسەی کەسیان دەکرد؟ ئەگەر بیانگوتایە تەپڵ لێ مەدەن، ئەوان تەپڵی خۆیان هەر لێدەداو واتێگەیشتبوون کە ئەجندە مانگی گرتووە.

*** بەواتا پێت وایە ڕۆژنامەنووسانی کورد دوای ۱۰۰ ساڵ لە کاری ڕۆژنامەنووسی ئەوەندە کەللە رەقن کە هیچ پەیامێک قەبوڵ ناکەن؟**

** قوربان رەئی من وەرناگرن، مەگەر حزبەکان چاویان لێ سوور بکەنەوەو بیانهێننە سەر رای من.

*** واتا ڕۆژنامەنووسی کورد گوێ لە مست و رامهاتووە؟**

** من ئەوە ناڵێم، پیاو کە گەیشتە رادەی کوشتن ئازانیە. من هەرگیز بە دەست خۆم خۆم نەهاوێشتوەتە بارێکی وا کە بمکوژن.دەبێت ڕۆژنامەنووس قەڵەم و زمانی پاک بێت و بۆ کوردایەتی بێت، ئینجا دوای شتی دیکە بکەوێت، لەو قسەیە شەرم ناکەم ئەوەی کوردایەتی نەکات حەرام زادەیە.

## پرۆفیسۆر مارف خەزنەدار [١٩٩٨]:

# ڕۆژنامەنووس دەبێ فەیلەسوف بێ

لە یادەوەری تێپەڕ بوونی (١٠٠) ساڵ بەسەر ڕۆژنامەگەری کوردیدا بە پێویستمانزانی دیمانەیەکی (مێژوویی- هەڵسەنگاندن) و گەلێ بابەتی دیکە لەگەڵ بەڕێز پرۆفیسۆر دکتۆر مارف خەزنەدار ساز بکەین، ئەمەش پوختەی ئەم گفتوگۆیەیە:

*** بەڕێزتان وەک نووسەرو لەهەمان کاتیشدا وەک ڕۆژنامەنووسێکی کۆنی ئەم ولاتە حەزدەکەین هەڵسەنگاندن و راو بۆ چوونی خێرات بزانین لەسەر کاری رۆژنامەنووسی لەکوردستانی عێراق و هەروەها پارچەکانی دیکەی کوردستانیش. چۆن باس لەو سەدەیە دەکەی کە کاری رۆژنامەنووسی کوردی تێدا کراوە؟**

** ڕۆژنامەگەری کوردی لەکۆتایی سەدەی نۆزدەهەمەوە تا دوایی سەدەی بیستەم، ئەم ماوەیە بە تەنیا نەک بۆ ڕۆژنامەگەری کوردی گرنگە، بەڵکو بۆ ڕۆژنامەگەری دنیاش بایەخی خۆی هەیە،چونکە رەنگە ڕۆژنامەگەری لەهەندێ وڵات بگەڕێندرێتەوە بۆ پێش مەسیح، گوایە لەوڵاتی چین بووە، لە ئەوروپا دوای شۆڕشی فەرەنسا زۆر پێشکەوتووە، بەڵام پێشکەوتنە هەرە گرنگەکەی بەلای منەوە لەسەدەی بیستەم بووە، سەدەی بیستەمیش لەنیوەی دووەمی، لەنیوەی دووەمیش لەچارەگی دوایی سەدەی بیستەم، ئەویش کە کۆمپیوتەرو ئەلکترۆنات هاتە گۆڕێ و پەیدا بوون، بۆ نموونە دوای شۆڕشی گەلاوێژی 1958 ڕۆژنامەو گۆڤار زۆر دەرچوون ئێستا لەکتێبخانەکاندا سەیریان بکەین دەبینین زۆربەیان لەسەر کاغەزی زەردو بەرەش و سپی چاپکراون. بەڵام سەبارەت بە کوردەوە زۆر گرنگە، گرنگیەکەشی لەوەدایە هەندێ رواڵەتی خۆیی و زاتی داوەتە مەسەلەکە، کە لەڕۆژنامەگەری وڵاتانی دیکە نەکات، لەوانە یەکەمیان دابەشبوونی کوردستان بووەتە هۆکارێک بۆ دواکەوتنی باری ڕۆژنامەگەری، لەگەڵ ئەوەشدا کەرەستەی ڕۆژنامەگەری نەک هەر لەکوردستاندا، بەڵکو لەو وڵاتانەی کوردیش لەگەڵیاندا دەژی و بە گشتی لە خۆرهەڵاتی ناوەڕاستدا، دواکەوتووە و درەنگ گەیشتوەتە ئەم ناوچەیە. ئەگەر بەراوردی خۆمان لەگەڵ بەغدا بکەین هەموو (٢٠) ساڵێک جیاوازی هەیە و ڕۆژنامەیەکیان بە ناوی (زەوڕاء) لەبەغدا دەرکردووە.

ئەوەی ئێـمـەش بە مـاوەیەکی کـەم دوای (زەوراء) لەقـاهـیـرە دەرچووە، چونکە بارودۆخی ئەو کاتە وایکردووە کوردی ئەو سەردەمە نەتوانن لەوڵاتی خۆیاندا دەری بکەن، ئینجا دوای دەرچوونی (کوردستـان)و (مەشروتیە)ی عوسمـانی و پەیدابوونی حـوریەت و جـەمـاعـەتی (ئیـتـحـادو تەرەقی) ئەمـانە تۆزێک دایلەنگاندەوە بەلای مـافـەکـانی کوردو بووە جـۆرێک زەوینە لەباربوون بۆ ئەوەی کـوردیش بـتوانێت لە ئەستەنبوڵ کار بکات، ئەوساکەش ئەستەنبوڵ نێوەندبوو، بێگومان دوای قاهیرە.
ئێمە لە کوردستـاندا بنکەی گرنگمان نەبووە ئەوەی سەرەکی بوبێت لە بەغدا بووە، جا دوای ئەوەی کوردستـان جارێکی دیکە پاش شەڕی یەکەمـی گێتی دابەشکرایەوەو دەوڵەتی عـێـراق لەسـاڵی (١٩٢١–١٩٢٥) دروست بوو راستـیـەکەی بلـێین لەسـاڵی ١٩٣٠ کە رۆژنامـەگەری دەستـی پێکرد سەبارەت بە کوردو عـەرەبیش لەعێراقدا ئەوە پێـشکەوتنێکـی گـەورە لەبەغـدا و لە سلێـمـانـی هاتەکـایەوە، دەبێ ئەو مـاوەیەش لەبیرنەکەین لەسـاڵی (١٩٢٦) حوسـێن حوزنی بەهەشـتی چاپخانەیەکی لە حـەلەبەوە هێنا بۆ رواندز ئـەویش زۆری نـەخـایاند، یەک دوو سـاڵ هـەندێک ژمـارەی زاری کرمانجی دەرکرد و کۆمەڵێک کتێبی بڵاو کردەوە لەپاش ئەوە وەستا.

ئەوە بوو چاپخـانەکـە دەسـتی بەسـەر داگـیـرا، پاشـان هاتە هەولێـرو لە (١٩٣٥–١٩٣٦) یازدە ژمـارەی رووناکی دەرچوو، ئەوە یەکەمین چاپکراوی دەوریە کە لە هەولێر بە زمانی کوردی دەرچووە. پاش ئەوە چاپخانەکە دەستی بەسەر داگیراو لەمـوسڵ مـایەوە تـا مردنـی حـوزنی بە هەشـتی. دوای ئەوە خـوالێـخـۆشـبـوو گـیـو موکـریانی چاپخـانەکەی وەرگرتووەو لـە سـاڵی (١٩٥٠) لە هەولێـر دایمەزراندەوە و ناوی نا چاپخانەی کوردستـان، ئینـجا رۆژنامـەگەری کوردیمـان لەبەغدا هەبووە بە حـوکـمی ئەوەی چاپخـانە لە بەغـدا زۆر بوونە، ئەو رۆشنـبـیـرانە بریتی بوون لەو قوتابیانەی کە پۆلی پێنجەمی ئامادەییان تەواو دەکرد و بۆ خوێندن دەچوونە بەغدا، هـەر لەبەر ئەمـەشە دروست بوونـی کۆمـەڵە و حزبە سـیـاسـیـەکان لە بەغدا بووە، وەک (هیـوا) هـەروەها (دارکـەر)یش لـە کـەرکـوک درووست بوو، بۆ؟ چونکە لـە رواندز و هەولێر و کۆیە قوتابخانەی ئامـادەیی لێ نەبوو، دیارە لە تەمەنی (١٧و ١٨) هەسـتی نیشتمـانی پەیدا دەبێت، ئـەمـەیان بواری رۆژنامـەگەریش دەگرێتـەوە. جا بەغدا وەک نێـوەند مـایەوە و دوای شـۆڕشی گـەلاوێژیش حـزبەکـانی وەک پارتی دیموکـراتی کوردستـان و حزبی شیوعی و گروپە نیشتیمانیـە عێراقیەکانی دیکە رۆڵیان بینی لە دەرکردنی رۆژنامەدا.

ئەوەی سلێـمـانیش وەک خـۆی مـایەوە و پاشـان بووە هـی شـارەوانی و ئینجـا هـی پیـرەمێـرد و ژین و ژیانـەوەی پێ دەردەکرد تـا ئەم دواییـەش بەردەوام بوو، هـەڵبـەت ئەویش وەک بنکەیەکی رۆشنبیری گرنگ بوو بۆ باری رۆژنامەگەری، بەڵام دوای ئەو گـۆڕانکاریانەی هاتنە کایەوە ئەوە بـوو حکومـەت و دەوڵـەت بوونە خـاوەن رۆژنامـە، ئەوەیان کـوردیشی گـرتەوە لە دوای (١٩٦٨) بنکەیەکی گـرنـگ لە بەغدا دامـەزرا و وەزارەتی راگـەیانـدن ئەرکەکەی خستـە سـەر شـانی خـۆی و تـا ئێسـتـاش گۆڤـار و رۆژنامە دەردەکەن.

*** مـامـۆسـتـا مـەسـعـود محـەمـەد پێی وابوو دەرچوونی یەکەم رۆژنامـەی کـوردی (کوردسـتـان) لەلایەن بەدرخانەوە لەبەر نزمی ئاستی رۆشنبیری کورد بوو، هەروەهـا لە بێکەسی و لە ئەنجـامـی ئەو چەوساندنەوەیە بوو کە لە کـوردسـتـان هـەبووە، بۆیەش**

**ئەم ڕۆژنامەیە لە شوێنێکی وەک قاهیرە دەرچووە، لە کاتێکدا بەڕێزتان پێتان وایە دەرفەت لە ئەستەنبوڵ و بەغدا هەبووە هەر لە سەرەتاوە ئەم ڕۆژنامانە دەربچن، ئایا بەڕێزتان لەگەڵ ئەوەدان لایەنی نەزمی ڕۆشنبیری بەشێک بووە لەو هاندەرەی کەوایکرد بەدرخان لە قاهیرە ڕۆژنامەکەی دەربکات؟**

** بێ گومان.. بەڵام مەسەلەکە بە لای منەوە بەمجۆرەیە ئێمە ئەگەر بەدرخانیەکان وەک بنەماڵەیەک وەربگرین ڕۆڵیان لە مێژووی کورددا هەبووە، ئەوانە لە سەدەی نۆزدەهەم ڕۆڵێکی سیاسی عەسکەریان هەبووە لە هەڵایساندنی شۆڕشەکان و بە تایبەتیش لە دوای ساڵانی پاش بزووتنەوەی شێخ عوبەیدوڵلا، بەدرخانیەکان وردە وردە بەرەو لێژی چوون.

***ئەی لە رووی ڕۆشنبیریەوە؟**

** لە ڕووی ڕۆشنبیریەوە جموجوڵیان هێندە نەبوو، بەڵام بەهۆی ئینتیمای بنەماڵەوە کە دەوڵەمەند و میر بوون ڕۆشنبیریان تێدا هەڵکەوتووە، بۆ خوێندن چوونەتە ئەورووپا، بەلای منەوە کرۆکی کۆششی ئەوان جارێ دیار نەبوو ئەو کۆششە کەی دروست بوو، پێم وایە دوای ئەوەی شۆڕشەکە لە بەین چوو ئەوان پەراگەندە بوون لەوێ ڕۆژێدا زۆریان چوونە سوریا، دیارە مەدحەت بەدرخان ئەو کاتە لە کۆتایی سەدەی نۆزدەهەم لەبەر چەوسانەوە بۆی نەکراوە ڕۆژنامەکە لە ئەستەنبوڵ دەربکات، ئەو کاتە قاهیرەش هەر سەر بە عوسمانی بوو، بەڵام جۆرێک لە بێلایەنی و پتریشی پێوە دیار بوو، هیچ نەبێت دروشمەکان هەر ئەستێرە و مانگەکە بوو، کەچی هی تورک سوور و هی میسر سەوز بوو، لە پاشاندا شالاوی ناپلیۆن و ئیمپریالیزمی فەرەنسا و ئینجا بەریتانیا و نەفسی تورکیاش ئەمانە هەمووی بەسەر میسرەوە بوو، واتا چاکترین جێگە بوو میقداد مەدحەت بەدرخان بتوانێ ڕۆژنامەکەی تێدا دەربکات و لە چاپخانەی (هلال) لە چاپی بدات، دوایش نەیتوانی لەوێش بەردەوام بێت چەندین جێگەی پێکرا وەک ژنێف، فۆکستۆن، لەندەن... هتد. دوای ئەوە لەسەرەتای سەدەی بیستەم دەبینین چەند ژمارەیەکی لە ئەستەنبوڵ دەرچووە واتا جۆرێک هەلومەرجی مێژوویی لەبار بووە و جۆرێک دیموکراسیەت لە ئارادا هەبووە لە حوکمی عوسمانیدا. دیارە ئەو گرنگیدانە بە فکر و ئەدەب مانای وایە بارودۆخەکە گۆڕاوە و جۆرە ماندوبوونێکە لە سیاسەت، تاکو لای خۆشمان ئاوهایە جەماعەتێک شۆڕشیان هەیە بۆ کاتێکی دیاریکراو دادەمرکێتەوە ئەوانە چی دەکەن..؟ خۆیان کۆدەکەنەوە و دەچنە شاخ و مەشق دەکەن و گرنگی بە ئەدەب و ڕۆشنبیری و خوێندەواری دەدەن و چاوەڕێی بارودۆخێکی دیکە دەکەن. لێرەدا مەبەستمان کۆششەکەیە.

***هەوڵی بیرکردنەوەی بەدرخانیش بۆ هەڵبژاردنی قاهیرە پتر بیرکردنەوەیەکی سیاسی بووە، کە لەبارترین شوێن هەڵبژێرن بۆ ئەوەی بتوانرێ بەردەوام بێت..؟**

** دیارە ئەوە قسەو باس و لێکدانەوە زۆر هەڵدەگرێ، ڕەنگە نهێنیەکەش نەزاندرێ، بەڵام زۆر شوێن گەڕاون لە قاهیرەوە بۆ لەندەن و ژنێف و.. هتد.

*** بەڕێزتان یەکەمین کەسن لەو لێتوژەرەوانەی یەکەم ژمارەی (کوردستان)تان دۆزیەوە، ئەگەر بکرێ بەخێرایی بۆ مانی بگێڕیەوە؟**

** زۆر باسی ئەو لایەنە کراوە، بەڵام لەبەر ئەوەی بۆنەی (١٠٠) ساڵەکەیە رەنگە جێی خۆی بێت بە کورتی جارێکی دیکە باسی بکەم. بە راستی دەرچوونی رۆژنامەی کوردستان بەلای هەموو خوێندەوار و رۆشنبیری کورد و تاکو رۆژهەڵاتناسەکانیش ئەوانەی خەریکی رۆشنبیری کوردین گرێیەک بوو. وەک دەڵێن نەدەزانرا لە چ ساڵێک و چ مانگێک و چ رۆژێک رۆژنامەکە دەرچووە، کاتی خۆی کە ئێمە دەمان بیست دەیانگوت لە ساڵی (١٨٩٧) دەرچووە، لەبەر ئەوەی هیچ ژمارەیەکیان بە تایبەتی ژمارە (١) مێژووی میلادی لەسەر نیە، بەڵکو دوو مێژووی لەسەرە یەکیان (هیجری) ئەوی دیکەیان (رۆمی).

رۆژهەڵاتناسێکی هۆشیار و زیرەکی ئینگلیز (ئەدمۆنز) ساڵی (١٨٩٢)ی بۆ داناوە، کە نووسینەکانی زۆر وردە، پیاوێکی ئەکادیمیە، راستە عەسکەریە، بەڵام مامۆستایە، بە هەر حاڵ ئەوە گرێیەک بوو، دوای ئەوەی دەرفەت بۆ من و چەند قوتابیەکی دیکەش رێکەوت بۆ خوێندن چووینە ئەوروپا و لەوێ لە شەستەکاندا قوتابی بووم سەرو سۆراغی ئەو بابەتانەم دەکرد کە سەبارەت بە کورد نووسراون، ئەو ژمارەیەم لە «**ئامۆژگەی رۆژهەڵاتناسی ئەکادیمیای زانستی لینینگراد**» دەستکەوت و دۆزیمەوە. ئەو کات ساڵانی (٦٦ و ٦٧) بارودۆخ بۆ راگەیاندن و بڵاوکردنەوە بە هیچ جۆرێک لەبار نەبوو، تاکو مانەوەی ئێمە لە دەرەوە ئەوە هۆکارەکانی بوو، وەک دەزانین لە (١٩٦٧) بەیانی مافی نەتەوەیی دەرچوو، عەبدولڕەحمان عارف ئەو کاتە لەسەر حوکم بوو، نێوان شۆڕشی کورد و بەغدا بڵێین تۆزێک باش بوو ، هەندێک رێککەوتن و شتی نێوان هەر دوو لا هەبوو، بەشێک لە رۆشنبیرەکانی شۆڕش گەڕانەوە بەغدا لە مایسی (١٩٦٧) رۆژنامەی **(التآخی)** و پاشکۆکەی **(برایی)** کەوتنە دەرچوون، هەر ئەم هەلو مەرجە بوو وایکرد ئێمە زۆرمان بگەڕێینەوە ناوەوەی وڵات، من لە بەهاری (١٩٦٨) هاتمەوە، یەکێک لەو شتە بە نرخانەی هێنامەوە (ئەنیکۆ فیلمی) ئەو ژمارە یەکەی (کوردستان) بوو، وتارەکەم بە عەرەبی و بە کوردی ئامادە کردو لەگەڵ بەهەشتی ساڵح یوسفی رێکەوتین کە رۆژی (١٩)ی نیسان بڵاوبکرێتەوە، ئەو رۆژەش دەکەوێتە رۆژی هەینی، ئەو کات رۆژانی هەینی رۆژنامە بە تیراژێکی پتر چاپ و بڵاو دەکرایەوە. ئێستاش لە ئەوروپا ئاوهایە، رۆژانی یەکشەممە ژمارەی تایبەتیە و زۆری لێ چاپ دەکرێت. جا عەرەبیەکە کەوتە (١٩)ی نیسان و کوردیەکەش کەوتە (٢٢)ی نیسان.

*** ئەگەر لە رۆژنامەی کوردستانەوە دەست پێ بکەین تا ناوەڕاستی ئەم سەدەیە، تاچەند رۆژنامەکانی کوردی سیمای رۆژنامەیان پێوە بووە؟**

** لە سەرەتادا رۆژنامە بە هەوڵی تاکە کەسی پەیدا بوو، وەنەبێ حکومەت و دەوڵەت و حزب لە پشت دەرکردنی رۆژنامەوە بووبێت، لە رۆژهەڵاتی ئێمەدا رۆژنامە هەر نەبووە، کە درووستیش بووە لاساییکردنەوەی عوسمانی بووە و ئەوانیش لە ئەوروپایان وەرگرتووە، بۆ نمونە دوای دروستبوونی دەوڵەتی عێراق سێ کەس ئیمتیازی رۆژنامەیان وەرگرتووە یەکێکیان هەر نەخوێندەوار بووە، بۆیە تا ئێستاش یاسا رێگە دەدات خاوەن ئیمتیاز بازرگانێک بێت، بەڵام سەرنووسەر دەبێت خوێندەوار بێت، رەنگە پارتی کۆمۆنیستی عێراق یەکەمجار وەک حزب رۆژنامەیان دەرکردبێ جا نهێنی، یائاشکرا، ئەوەیان گرنک نیە، وەک گووتم لە کوردستانیش هەر ئەو ئەزموونەی سلێمانی کە (سۆن) کاتی خۆی چاپخانەکەی دانا ئەوە هەر

مایەوە و بەردەوام بوو، بەڵام ئەوی دیکە هەر هەمووی لە بەغدا بووە، ئەوەشمان لە بیر نەچێت چاپخانەی کوردستان لە هەولێر لە (١٩٥٠-١٩٥١) ئیمتیازی هەتاوی وەرگرتبوو کە مامۆستا گیو دەری دەکرد. تا ئەو کاتە هیچ رۆژنامەیەکی حکومەتی نەبووە تەنیا **(الوقائع العراقیە)** نەبێت کە هیچی تێدانیە لە یاسا بترازێت. لە دوای شۆڕشی گەلاوێژیش رۆژنامەکان هەر ئەو رۆژنامانە بوون کە پێشتر دەردەچوون (اخبار، زمان، بلاد)... تاد. هی کوردیش (شەفەق لە کەرکوک، ژین لە سلێمانی، هەتاو لە هەولێر).

*** هەر لە قاهیرە و تاکو بەغدا و هەولێر و سلێمانی ئەوانە لە رۆژنامەگەری کوردی بە قۆناغ دەژمێردرێن؟**

** بەڵێ چونکە گۆڕانی بەسەردا هاتووە ، هەروەها لە رووی سیاسی و کۆمەڵایەتیەوەش گۆڕانکاری هاتۆتە ئاراوە، ئینجا رۆشنبیرەکانیشمان کە لە دەرەوە گەڕاونەتەوە کەوتوونەتە بەغدا بە حوکمی ئەوەی زانکۆ لە کوردستان نەبووە، بەغدا و کەرکوک بنکەی حزبە کوردیەکان بووە، لە سلێمانی و هەولێر نەبووە، چونکە بچوکی شارەکان و هەلومەرجی ئەوێ رۆژێ وابوو.

*** سەبارەت دەرچوونی رۆژنامەی کوردی لە پارچەکانی دیکەی کوردستان، دەکرێ بە خێرایی ئاماژەیەک بەو ئەزموونانە بدەی؟**

** یەک لەوانە سوریا دوای شۆڕشی بەدرخانیەکان و بڵاوبوونەوەیان لەم وڵاتەدا بە تایبەتیش برایانی جەلادەت و کامەران بەدرخان کەوتنە شام. سوریا و لوبنان ئینتیدابی فەرەنسا بوون. لە دوای جەنگی گێتی یەکەم کاتێکی بۆ دانرا بوو کە لە (١٩٤٧)تەواو بێت، پاش جەنگ لە سیەکانەوە بە هۆی ئینتیدابی فەرەنسییەوە بەدرخانیەکان دەرفەتێکی باشیان دۆزیەوە کە لەوێ دەزگەیەکی کوردی دابنێن و ئەلف و بایەکی لاتینیشیان دانا و کۆمەڵێک گۆڤاریان دەرکرد وەکو **(هاوار، رۆژا نو)** تا دوای جەنگی دووەمی گێتی دەوامی کرد، لە تەک گۆڤاردا کۆمەڵێک کتێبیش چاپ کران، تا زمانی کوردی قەدەغە کرا. سەبارەت بە ئێرانیش کە سوپای هاوپەیمانەکان واتە رووس و ئینگلیز و ئەمەریکا چوونە خاکی ئێران جۆرە هەلومەرجێک هاتە گۆڕێ ئەوەبوو کۆماری مهاباد دامەزرا، بەڵام رۆژنامەگەری بەر لەوە دەستی پێکردبوو، هەڵبەت لەسەردەمی کۆماردا بە هێزتر بوو، ئیدی ئەوانیش وەک دەزانین کۆمەڵێک گۆڤار و رۆژنامەیان دەرکرد لە هەموویان گرنگتر ئۆرگانەکەیان بوو **(کوردستان)** کە تا ئێستا بەردەوامە، جگە لەوەش هەوڵی تاکە کەسیش لە ئێران بۆ رۆژنامەگەری کوردی دراوە، دەبینین کوردە گۆڤاری بە فارسی دەرکردووە، هەموویشی لەسەر کوردە، وەک گۆڤاری ماد کە کاتی خۆی د.محەمەد موکری دەری دەکرد، لە پاش (١٤)ی تەممووزیش رۆژنامەیەکی یەکجار زۆر ناسراویان هەیە (کوردستان) ئەویش حکومەت دەری دەکرد لەکاتی خۆیدا ماوەیەکی چاک بەردەوام بوو، بەڵام سەبارەت بە سۆڤیەت ئەوە لە ساڵی (١٩١٧) چەسپا، هەر سێ کۆمارەکەی (ئەرمەنستان، ئازەربێجان، گورجستان) کوردی زۆری لێیە، لە سەرەتادا هەموو مافێکی رۆشنبیری نەتەوەییان وەرگرت، ئەلف و بێیان لەسەر بنەمای لاتینی بۆ دانرا لە ساڵی (١٩٣٠-١٩٣١) دەستیان بە جموجۆڵ کرد ئەمە ساڵی (١٩٣٩) داخران، وەک دەزانین نەک ئەو چاپەمەنیانە داخران بەڵکو کوردەکەش ئاوارە و دەربەدەر کران تا

پاش جەنگ.

*** تا دوای مردنی ستالین؟**

** نەخێر، دوای شەڕ ستالین مابوو، ئەمانە دواتر بە سیاسەتی خۆیان داچوونەوە سەبارەت بە ناوچەی قەفقاز بە تایبەتیش بەرانبەر بە کورد، وا دەزانم بڕیارەکەیان بۆ ئەوە بوو کە کورد مافی رۆشنبیری پێ بدرێ و ببێتە وەرەقەیەک بە دەست حکومەتەوە (وەک دەڵێن)، ئەوە بوو کورد لە ئاسیای ناوەڕاست نەماو هەمووی لە ئەرمەنستان کۆبووەوە، لەوێ سەر لەنوێ دەستیان پێکردەوە، بەڵام ئەلف و بێیەکەیان گۆڕین،کرا بەو ئەلف و بێیەی رووسی پێ دەنووسرێ، ئیدی کتێب و کتێبی قوتابخانە و حزبی شیوعی دەستەڵاتی بەسەر مەسەلەکەدا هەبوو، ڕێیاتازە بە تەمەنترین رۆژنامەیە تا ئێستاش دەردەچێ، دیارە لە رووی چۆنایەتییەوە ناڵێم، بەڵام لە رووی چەندایەتییەوە ئەگەر بەراوردی بکەین بە شوێنەکانی دیکە لە هەر هەموویان باشترە بە کوردستانی عێراقیشەوە بە تایبەتی لە رووی کتێب چاپکردنەوە.

*** رۆژنامەنووسی کوردی چەندە کەوتووەتە ژێر کارتێکردنی رۆژنامە و رۆژنامەنووسانی دەوروبەری، بە تایبەتی شێوازی رۆژنامەنووسی ئایە بەلایەکدا پتر کاریگەری بەسەرەوە یان لە هەموو لاکان وەک یەک، کامیان ئێستاش لەسەر باری رۆژنامەگەری کوردی بەردەوامە؟**

** لە بنەڕەتدا کاریگەری ئەوروپا بەسەر هەمووانەوە دیارە، هەر لە بنکەی رۆژنامەگەری ئەستەنبوڵ و میسرەوە چونکە ئەم جووتەش لە سەرەتاوە لە ئەوروپایان وەرگرت و دەتوانین بڵێین یەک سیستەم بوو، جا لەگەڵ سەرەتای دروست بوونی دەوڵەتی عێراق، سۆن لە سلێمانی دابنیشێ و گۆڤار دەربکات دیارە شێوازەکەی لە هی تورک جیا نیە، چونکە تورکیاش هەر لە ئینگلیزەکەی وەرگرتووە. بەڵام لە هەمان کاتیشدا داهێنانە و دەبێ هەر شوێنە شێوازە نەتەوەییەکەی خۆی وەرگرێ، ئەمەش لە جێگەیەکەوە بۆ جێگەیەکی دیکە دەگۆڕدرێ.

**** واتە رۆژنامەنووس و رۆژنامەی کوردی ئێستا شێوازی تایبەت بە خۆی هەیە؟**

** بەڵێ.. ئەگەر سەیری گۆڤاری رامان بکەین سەیری بکە و دابەشی بکە با بڵێین لە رووی دیموگرافییەوە مەبەست دیمۆگرافی جیهانیە، چەند دەلاقەیەک دروست دەکەین، وتارەکان هەریەکە و لە دەلاقەی خۆی دادەنێین، دەبینین بەشی رۆشنبیری جیهانی تێدایە، بەشی رۆشنبیری هاوسێکانی تێدایە، لە هەمان کاتیشدا بەشی کوردیشی تێدایە، ئەوە لە رووی ناوەڕۆک، بەڵام ئێمە جێبەجێکردنەکەمان بە کۆمپیوتەری ئەوانە، دیارە ئەو گۆڤار و رۆژنامانەی کە لە ئەوروپا دەردەچن بتەوێ و نەتەوێ ئێستا کار لە جەنابت دەکات.

**• راستە.. بەڵام رایەک هەیە دەڵێ رۆژنامەنووسی ئێستە لە هەرێمی کوردستان زۆر لەژێر کاریگەری رۆژنامەنووسی عێراقیەو لاسایی ئەوان دەکاتەوە، هەروەها رۆژنامەنووسی کورد لەم ئاو و هەواوە هەڵکەوتووە، بۆیە ناتوانێ خۆی لەم کاریگەریە رزگار بکات هەر چەندە شێوەیەکی کوردی پێوەیە، بەڵام شێوەیەکی شێواو، ئێوە دەڵێن چی؟**

** نا .. شـێـوازەکـە هـەمـان شـێـوازە، چونکە نابێ دووشت تێکەڵ بکەین، لەوێ حکومـەت دەسـەڵاتدارە لێـرەش حکومـەتی هـەرێم، بەڵام هـۆکـارەکـە ئەوەیە ئێـمـە رۆژنامەی کەرتی تایبەتمان نیە، ئەمەش هۆکاری خۆی هەیە، دیارە رۆژنامەی کەرتی تایبـەت، چونکە ئۆرگـان نیـە رێڕەوی تایبـەتی خـۆی دەبێ وجـیـادەبێـتـەوە لە رووی شێوازو تاکو ناوەرۆکیش.

*** لە قسەکانی بەڕێزتان دوو رەوت سەرنجی راکێشا کە لەناو رۆژنامەگەری کورد رۆڵیان گێڕاوە، یەکیان گرنگیدانی راوێژکارە سیاسیەکانی ئینگلیز وئەوەی دیکەیان ئایدیۆلۆژیی کۆمۆنیزمی لە پێناوی گەشەدان بە تێکۆشانی سیاسی خۆیان، کاریگەری کامیان تا ئێستا بەڕای بەڕێزتان ماوە؟**

** کۆمۆنیستەکان پتر.

***لە ئینگلیزەکان هیچ سیمایەک نەماوە ئاماژەی پێ بدەیت؟**

** رۆژنامەگەری ئینگلیز لیبرالیەتی تێدایە، بەڵام هی ئێرە بێ لیبرالیەتە، تۆ لێرە بەرنامەی ئەو حزبە یان ئەو دەزگایە جێبەجێ دەکەی کە دانراوە، دیارە یەکێکی وەکو سۆن مەبەستێکی هەیە، دەیەوێ میللەتی کورد لە رووی رۆشنبیریەوە دروست بکات، گرەو بۆ چاکترین نووسینی کوردی دادەنێ، مانای وایە نووسینی کوردی کزبووە.

پارەیان دەداتێ،پارە دەدا بەخەڵکە خوێندەوارەکە چیرۆک بنووسێ، وتار بنووسێ، شتێکی جوان بنووسێ و لیژنەی بۆ دادەنێ و دەڵێ ئەمە کوردیەکەی پاکەو پاداشتی دەداتێ.

راستە ئەو بۆ ئامانجێکی سیاسی خۆی بووە، بەڵام کارەکە پیرۆز کەوتۆتەوە، ئێمە کاتێ دەمان گوت ئیستعمار هەمووی هەر خراپ نیە، ئەوەتا وڵات ئاوەدان دەکاتەوەو پرۆژەت بۆ دادەنێ و دوایش دەڕواو جێیدەهێڵێ.

*** زمـان هەر لەسـەرەتاوە یەکـێک بووە لە پێکهـاتـەکـانی باری رۆژنـامـەگـەری و پێشـخـستنی، یەکێک لە ئاسـتـەنگەکانی رۆژنامـەگەری کوردی ئەوەیە بەزمـانێکی یەکگرتوو نەنووسراوە، هۆکارەکانی زۆرجار باس کراوە، ئایە زمان چەنـدە ئاستەنگە لەبەردەم رۆژنـامـەگـەری کـوردی، هەروەها رۆژنامـەنووسی چەندە هاریکاری پوختەکردنی زمانی کوردی دەکات؟**

** ئەوە پرسـیـارێکی گـرنگە، سـەرەتا بەگـشـتـی بڵـێین بۆ هـەمـوو دیالێکـتـەکـانی شێوەکانی زمـانی کوردی چاپەمـەنی کاری کردوەتە سـەر پێشکەوتن و بابەتەکانی وەک شیـعرو چیرۆک و...هتد، جا بۆ نووسـینی کوردی بەهەردوو شێوەی میللیانە بڵێین (بادینی و سۆرانی) سێ ئەلف وبێمـان هـەیە، پێموایە تۆزێک موبالەغە دەکەین ئەگەر بڵـێین ئەوە کار دەکاتە سـەر پێشکـەوتنمـان، راسـتـە نەبوایە بـاشـتـربوو بەڵام بمانەوێ ونەمـانەوێ هـەردەبێ کوردی کوردسـتـانی سـوریاو تورکیا بەلاتینی بنووسن، چونکە تورکەکـەش هـەر بە لاتـینی دەنووسێ، تاکـو لە تـورکـیـا پـیـاوانی ئایـیـنیش بۆ کوردی نووسین لاتینیـەکە بەکـار دێنن، ئـەوی دیکە بۆ نووسـینی عـەرەبی بەکـار دێنن ئەگەر هاتوو عەرەبی زانی.

بەڵام کـوردسـتـانی عـێـراق و کـوردسـتـانی ئێـران پیـتی عـەرەبی بەکـار دەهێنن لەهەردوولاشـدا گـەشـەیان پێداوە، ئەلف وبێیەکان گەیشـتوونەتە ئەوە بەشـی زمـانی

کوردی بکات، ئەوەی رووسیاش دەبێتە سێیەم، دیالێکتەکە کرمانجی سەرووە. پاشان رۆژێک لە رۆژان بۆ لێکۆلەرەوەکان گرفتێک نەبووە، بۆ نمونە من بەشێوەزاری خواروو قسە دەکەم بەلام لە خانی و جەزیریم کۆلیوەتەوە، هەروەها ئەولاش بەم شێوەیە.

*** دوای سەدەیەک بەسەر رۆژنامەگەری کوردی بە هەولوکۆششی دەرهەمو ناوەوە، بەهەردو شێوەزاری زمان، دەبێ رۆژنامەنووسی کوردی بە لای تۆوە چ شێوەیەکی هەبێت بوێری چەندە، کاریگەری لەسەر ژیانی کۆمەلایەتی چەندە..؟**

** بێگومان کاریگەری خۆی هەیە، بەلام وەک دەلێن کۆمەل لە چین و توێژ پێک هاتووە، رۆژنامەگەری ئێمە تا ئێستە رۆژنامەگەری یەک رەوتە رۆژنامەی دەولەتە یاخود حزبەکانە، دیارە ئەوەش داوو دەزگەو باری رۆژنامەگەری لێی بەرپرس نیە، بەلکو رەنگدانەوەی سیستەمی ئابووری ئێمەیە، بەلام لای ئێمە کام دەولەمەند هەیە بەملیۆن پارە دانێ و دەزگەیەکی چاپ و بلاوکردنەوە دامەزرێنێت و رۆشنبیری گەورە گەورە لە دەوری خۆیدا کۆبکاتەوە.. هەلبەت نیە.

*** بوێری سەربەخۆیی رۆژنامەنووس پتر دەکات؟**

** بەلێ، بەلام ئەم بارودۆخە کاتیەی ئێمە وایکردووە ئەوەمان نەبێت، کە ئەوە نەبوو جارێکی دیکە بەیەک لایەنی دەمێنێتەوە، هەرچەندە ئازادیش هەبێت.

*** لە ولاتانی بچووک و دانیشتوان کەم هەمیشە بازرگان و دەولەمەندەکان سامانیان بۆ بواری رۆژنامەگەری تەرخان ناکەن، بەلام لەم جۆرە ولاتانە حکومەت ئەرکەکە دەگرێتە ئەستۆی خۆی وەک ولاتانی ئەسکەندنافی کەچی رۆژنامەنووسەکان هەر بەئازادی دەمێننەوە؟**

** بەلێ راستە.. بەلام دیارە ئەگەر ئەوەش هەبوویێت گرنگ ئەوەیە رۆشنبیر بە هۆشیاریەوە مامەلە لەتەک بارودۆخەکە بکات،من زۆر رۆشنبیر دەناسم لەو چەند دەورەیەی بەسەر عێراقدا هاتووە لە هەموو قۆناغەکان بە هۆشیاری مامەلەیان کردووەو خزمەتیان بەمیللەتی خۆیان گەیاندووە.

*** دوای راپەرین و دروست بوونی حکومەتی هەرێم وئەو پچرە پچریە، تەکانێک بەکاری رۆژنامەنووسی فەرهەنگی دراو ژمارەیەکی زۆر رۆژنامەی رۆژانەو هەفتەنامەو گۆڤارو تەکنیکی باش هاتەپێشەوە، بەرێزتان قۆناغی دوای راپەرین بە قۆناغێکی نوێ لە رۆژنامەگەری کوردی دەژمێرن ولە چیدا دەیبینن؟**

** جارێ دوای راپەرین وسالی یەکەم ودووەم وەکو ئەزموون زۆر سەرکەوتوونەبوو، بەلام دوای ئەوەی گۆڤارو رۆژنامەکان دەرچوون دەتوانم بیکەم بەدوو بەش لە رووی واقیعیەوە، ئەو رۆژنامەیەی یەک وتاری لێ بخوێنمەوە ئەوە سەرکەوتووە، چونکە دیارە بەتەنیا بۆ من دەرناچێ، هەر کەسەو لاپەرە و وتارو بابەتی خۆی دەوێ ئەوی دیکەیان کەوشتێکی تێدا نەخوێنمەوە ئەوە فت. لەگەل ئەوەشدا ئەوەی دەردەچێ ژمارەی یەکجار زۆرە.

*** مامۆستا، بەرێز شوکر مستەفا پێی وابوو دیاردەی زۆری و بۆری بە دەرچوونی رۆژنامەنووسی کوردیەوە هەیە لە هەرێمی کوردستاندا، ئەو پێی وابوو دوورنیە تۆخمەی پێبگرین، تا چەند لەگەلیدای؟**

**بەدڵنیایەوە، چونکە ئێمە بۆخۆمان هەندە کادیرەمان نیە، لە خۆڕا خۆمان کردووە بە ڕۆژنامەنووس.

ئەوەی دەردەچێ زۆرە، لە زانکۆ قوتابیمان ڕاسپارد سەرژمێری ئەو گۆڤارو ڕۆژنامانە بکاتن کە دەرچوون.. ژمارەیان لە (٩١)ەوە گەیشتە (٤٠٠) گۆڤارو ڕۆژنامە، هەڵبەت هەیە یەک ژمارەی لێ دەرچووە، بەڵام ئەوەی ئێستە دەردەچێ دیسان ژمارەیان زۆر زۆرە.

*** ئەو ژمارەیەی هەمانە هی زەمبردەیی و برسێتی و تێنوێتیە، یاخود مونافەسەی سیاسیە؟**

** بەراستی هەردووکی تێدایە ، مونافەسە کە هەر زۆر زەقەو دیارە.

*** مامۆستا ئێمە هیچمان نەماوە ئەگەر بەڕێزتان پەیامێکتان هەبێت بۆ ڕۆژنامەنووسان؟ چونکە پێت وایە ئێستەش لەپرۆسەی پێکهاتن دایە؟**

** بەراستی من قسەیەکم هەیە، بە تەوازوعەوەش دەیڵێم، ڕەنگە قورسیش بێت، بەلای منەوە ڕۆژنامەنووس دەبێت فەیلەسوف بێت، ئەگەریش پێم بڵێن قورسە دەڵێم دەبێ هەوڵ بدات ببێتە فەیلەسوف.پاشان ڕۆژنامەنووسی سەرکەوتوو ئەو ڕۆژنامەنووسە نیە (٦-٧)سەعات کاربکات و بچێتەوە ماڵێ، ڕۆژنامەنووس دەبێ (٢٤) سەعات ئیش بکات و خۆی پێ بگەیەنێ، پارێزگاری لە بیروڕای خۆی بکات، ئەوکاتە دەتوانێ لەهەموو جێگەیەکدا ئیش بکات.

جابۆیە پێویستمان بەرۆژنامە نووسی هەیە بەهۆشیاریەوە کاربکات. دیارە ئەم هۆشیاریە هەرچەندە جیاوازیشی لەگەڵ سەرنووسەرەکەی خۆی هەبێ دەتوانێ **نووسینەکانی خۆی فەرز بکات.**

***زۆر سوپاس مامۆستا بۆ ئەم دەرفەتەو لەگەڵ نووسەرو ئەدیب و مامۆستایەکی وەک بەڕێزتان کۆبووینەوە.**

** زۆر سوپاستان دەکەم بەراستی بایەخدانتان لەهەموو ڕوویەکەوە بۆ ڕۆشنبیری کوردی وەکو کەسایەتی تایبەتی بۆ من جێگەی شانازیمەو سوپاستان دەکەم.

# ڕۆشنبیران، چۆن لە گۆشەگیری دەربچن؟

[ دەقی کۆڕێکە، لە یەکێتی نووسەرانی کورد- لقی هەولێر پێشکەش کرا. ١٩٩٩]

سەرۆ قادر

ڕۆڵی ڕۆشنبیران لە پرۆسەی ڕۆشنبیریی هەر وڵاتێکدا و لە ژیانی میللەتاندا جیاوازی هەیە، بە تایبەتی لە هەردوو قۆناغی بەرلەسەرکەوتن و دوای سەرکەوتنی خەباتی میللی. ئێمە هەموومان لەم واقیعەداین ، ئەو پانتاییە زۆر فراوانە کە ڕۆشنبیران بەسەریدا دابەشبوونە. بەرەی جیاجیا هەیە ، هەڵوێستی جیاجیای تێدایە. لەلای منەوە ئەوە قۆناغێکە بەجێدەهێڵدرێت و دوای ڕزگاری ،قۆناغی تازە دەستی پێکردووە. لەم قسەیەمدا ،مەبەستم ئەوە نیە بڵێم کەسانی ڕۆشنبیر، دوای سەرکەوتن هیچ پەیوەندیان بە ڕابردووی خۆیانەوە نەماوە، هەروەها پێشمەوانیە کەسانی ڕۆشنبیر لەدوای قۆناغی ڕزگاریدا ،بە مێژووی بەرلە ڕزگاربوون بپێورێن یان هیچ ڕۆلێک بۆ هەڵوێستی جیاجیا نەهێڵدرێتەوە.

دەمەوێ بڵێم؛ لەدوای ڕزگاربوون، ڕۆڵی ڕۆشنبیران بۆ پتەوی بەخشین بە دانیشتوانی وڵات، لەبوارەکانی مەعنەوی و ڕۆشنبیری ،هەروەها ئامادەکردنیان بۆ تێگەیشتنی ئەرکە نوێیەکان و گفتوگۆکردن لەسەر ئەو بابەتە ڕۆشنبیریانەی کۆمەڵ ئامادە دەکات بۆ ئەوەی هەنگاو بهاوێژێ بەرەو قۆناغی نوێ. جابۆیە دەکرێ بەیەک ئەندازە سەرجەم ڕۆشنبیران دەستیان تێدابێ وڕۆڵی تێدابگێڕن، چونکە بیروڕا پەیوەندی بە هەڵوێستی سیاسییەوە نیە، فکر کاردەکاتە سەر میللەت، کارتێکردنیش مانای تایبەتی خۆی هەیە. ئێمەهەشت ساڵمان بەسەر ڕزگاریدا تێپەڕاند. هەموو لایەنەکان کاری خۆیان دەکەن وکاریگەری خۆیان هەیە، تەنیا باری ڕۆشنبیری نەبێت کە یەکجار لاوازە. ڕۆشنبیران کارتێکردنیان بەسەر ڕەوتی ژیانی نوێدا یەکجار کەمە، بێگومان ئەم حاڵەتەش هۆکاری تایبەتی خۆی هەیە .دەکرێ مرۆڤ بیریان لێ بکاتاەوە.

ئەزموونی ڕۆشنبیریی ئێمە ،دوای ڕاپەڕین ئەزموونێکە ،من بەش بەحاڵی خۆم زۆر بەشانازیەوە باسی ناکەم، واتا ڕۆڵی ڕۆشنبیران لەسەر ڕەوتی ژیانی میللەتەکەمان، دوای ڕاپەڕین ئەوە نەبووە بە ئاسانی شانازی پێ بکرێ. ڕۆشنبیری کوردی لە کەشوهەوایەکی شل وخاوو تەپ ،بەرەو گۆشەگیری و ترس چووە، لەوەی بکەوێتە سەنگەری ڕوویەڕووبوونەوەو بوێرانە فکر دابڕێژێتەوەو بتوانێ قسە بکات. کەچی ڕزگاری کوردستان لە کۆتایی سەدەی بیستەم دایەو مرۆڤی ڕۆشنبیر دەکرێ

بەئاسانی دەنگی بە هەموو دنیا بگەیەنێت ،نەک هەرمیللەتەکەی خۆی بە تەنیا.

من ،ئەو خاسیەتەی رۆشنبیرانی کورد دەگەڕێنمەوە بۆکەلتوری داگیرکەر. چونکە ئێمە میللەتێکین بەدرێژایی مێژووی خۆمان کیانێکی سەربەخۆمان نەبووە تا رۆشنبیر کەسایەتی خۆی مکوم بکات، ترس بووەتە بەشێکی زۆرگەورە لە کەسایەتی ئەو. جاری وا هەیە ئەم ترسە دادەبەزێتە ئاستی ترسی سادەلەوحێک. نەک ترس لەوەی ئەو فکرە کارتێکردنێکی نێگەتیڤانەی لەسەر کۆمەڵ دەبێت ،بەڵکو ترس لەوەی نەکا بیکوژن، لەکار دەریبکەن و..هتد، کەئەوانە بۆ ژیانی رۆشنبیر هۆکاری ئەو تۆنین لە بەرامبەریاندا مل کەچ بکرێ.

لەدوای راپەڕین ،یەکەم ئەزموونی بەڕێوەبردنی سیاسی کوردستانی سەربەخۆ، بەرەی کوردستانی بوو. بەرای من دەسەڵاتەکە بەرەڵلایی بوو، کەس خاوەنی دەسەڵات نەبوو، کۆنترۆل نەبوو. لەم قۆناغەشدا رۆشنبیرانی کوردستان زۆر خۆپارێزانە مامەڵەیان لەگەڵ دەسەڵاتی نیشتمانیدا دەکرد، وەک ئەو خۆپارێزیەی جاران لەگەڵ داگیرکەردا هەیانبوو،هیچ جیاوازیان لەنێوانیاندانەکرد. وابزانم ئەوە هەڵەیەکی یەکجار گەورەیە کە تائیستاش لەلایەن رۆشنبیرانی کورد ، لە دەرەوەی وڵات زۆر بەزەقی ماوە. رەنگە لەگەڵ ئەم مەسەلەیەدا ، ئێمە کە لە ناوەوەین کەمێک واقیع بینتر بین.

دیارە رۆشنبیر بۆی هەیە کاری رۆشنبیری خۆی بکات لە هەمانکاتدا حزبایەتیش نەکات ،بە پێچەوانەوەش هەر راستە، بەڵام دوای راپەڕین بەو بڕوایە هەڵسوکەوت کرا کە؛ دەبێ رۆشنبیر بێلایەن بێ وسیاسەت نەکات و دوورە پەرێز بوەستێت .لەدواییدا وایلێدێ رۆشنبیران حزبێکی بێلایەنیان هەبێت ،ئەمەش هەر خۆی جۆرێکە لە حزبایەتی. کۆمەڵێک ئەفکار هاتوونە گۆڕێ و هەوڵ دەدەن جارێکی دیکە بکەونەوە لێکدانەوەی جۆری حوکمرانی سیاسی کوردستان و بەگومانەوە دەڕوانینە سەرکردەکانی سیاسی . دیارە ئەمەش وادەکات مرۆڤی رۆشنبیر بەمجۆرە روانینە هەڵەیە بڕوای بەتێکۆشانی گەلەکەی نەمێنێت.

لە قۆناغی دووەمدا کە پەرلەمان و حکومەت دروست بوون،حکومەتی (ففتی – ففتی)هاتەسەرکار. ئەوجارەیان رۆشنبیران هەنگاوێکی تۆزێک باشتریان هاویشت لە بەراورد لەگەڵ سەردەمی بەرەی کوردستانی. بەڵام لەوقۆناغەدا ئەوەی جێگای سەرنجدانە، گۆشەگیری روشنبیران زیاتر بوو. هەڵبەت هەندێکیان لە دەسەڵاتی سیاسی نزیک کەوتنەوە، بەڵام بەشێوەیەکی سەقەت. سەقەت بەو مانایە؛ رۆشنبێرێک خواستە مادیەکان و پێداویستیەکانی بۆ دابین بکرێ و ببێتە کوێخایەک وەک کوێخای هەرگوندێک، بەلاشیەوە ئاسایی بوو چەند چەکدارێکی حەفتاوپێنجی بەشانی بەدواوە بێت بۆ ئەوەی ئیسپات بکات ئەویش دەتوانێ وەک هەر عەسکەریەک وهەر سەرەک عەشیرەتێک بجوڵێتەوە. بێگومان ئەم دیاردەیە تێڕوانینێکی خراپی لای رۆشنبیرانی دیکە دروست کرد ،تا دەنگ بەرز بکاتەوە بڵێ ؛ئا رۆشنبیر کە تێکەڵ بەدەسەڵاتی سیاسی دەبێ ئاوای بەسەر دێت. ئەوەش لایەنێکی نێگەتیڤ بوو، دەرەنجامێکی چاکی وەدەست نەهێنا.

دەمەوێ لێرەدا بڵێم چەمکی دوورە پەرێزی رۆشنبیران لەدەسەڵاتی نیشتیمانی کارێکی هەڵەیەو ئەمڕۆ لە دنیای دەرەوەدا بەپێچەوانەوە سەیر دەکرێت. ئەو کاتە

ڕۆشنبیر دەتوانێ کاریگەری خۆی هەبێت کە لەگەڵ ئیدارەی وڵاتدا تێکەڵ بێت.هەڵبەت نەک بەکرێگیراو یان چاوەشی بێت و حزبیەکی بەرچاو تەنگ بێت.

دیارە، بۆ زەمینە فراوانکردنی باری ڕۆشنبیری و فیکری ،دەبێ ڕۆشنبیر تواناکانی خۆی تێکەڵ بەدەسەڵاتی ڕاپەڕاندن بکات، چونکە هیچ ڕۆشنبیرێک ناتوانێت کارێکی مەزن بکات ئەگەر دەسەڵاتێکی گەورەی لە پشت نەبێت.

ئێمە لە ساڵی (١٩٩١) سەربەخۆییمان بەدەست هێنا. سەربەخۆیی ئێمە دەرەنجامی شەڕی گوندوبەگوندو شار بەشاری کوردستان نەبوو، هەڵبەت لەبیرمان ناچێت کە هێزی پێشمەرگەو بزووتنەوەی سیاسی ،پێشڕەوی شۆڕشەکە بوون، بەڵام ڕزگاری ئێمە لە ئەنجامی قۆناغێکی نوێی دنیابوو، ئەویش سەرەتای بەجیهانی بوونی هەموو لایەنەکانی ژیانی مرۆڤە.دیارە ئەم بەجیهانی بوونەش لەهاریکاری نێودەوڵەتیدا خۆی دەدۆزێتەوە لە پێناوی ڕزگارکردنی یکجارەکی مرۆڤ. هاریکاری کردنی مرۆڤ لەسەر ئاستی جیهان بۆ ئەوەی بەئاسانی لە کێشەکان حاڵی بێ و خەڵک لەگەڵ یەکدیدا تێکەڵ بێت، بەمەش خەریکە سەرەتایەک بۆ تێکەڵبوونی ڕۆشنبیریی جیهانی دروست دەبێت،ئەویش چەمکی هاوبەش ،زاراوەی هاوبەش، بۆچوونی هاوبەش، تەقالیدی هاوبەش دەبێت.

ئێمە لەکاتێکدا ڕزگارمان بوو ،چەپ و ڕاست لە فیکردا نەما، خەریکە چەپ و ڕاست بە مەفهومی جاران بەیەکجارەکی بەکۆتا بێت. کۆتایی هاتنەکەش کۆتاییەکی فیزیایی نیە کە تەنیا کامپی سۆسیالیزم تێکچووبێت، بەڵکو مرۆڤ کەوتە بەردەم قۆناغێکی نوێ لە بیرکردنەوەدا؛ ئەویش هەموو کێشەیەک لەم گۆشە نیگایەوە سەیر بکرێت کە چەند بەرژەوەندیەکانی مرۆڤ هەڵدەگرێ.

مەبەستم بەراورد نیە، بەڵام چەپ و ڕاست تاکو ئێستا لەناو ڕۆشنبیری کورد لەدەرەوەو لەناوەوەدا لەسەر شێوەی کۆن ماوەتەوە. بەڕای من ئەوە جۆرێکە لە پاشکەوتوویی ڕۆشنبیریی لەکوردستان .ئەوەش لێوردبوونەوەیەکی جدی و گفتوگۆی دەوێ. پێشمەوایە هۆکاری سەرەکی بۆ بەشدارنەبوونی ڕۆشنبیران و کەمی کاریگەریان لەسەر بەڕێوەبردنی وڵات دەگەڕێتەوە بۆ ئەمە.

ئێمە لە قۆناغێکدا ڕزگاری وڵاتەکەمان بەدەست هێناوە کە چەترێکی نێودەوڵەتیمان بەسەرەوەبوویە. ئەو چەترە دروشمەکانی بریتین لە(**دیموکراسی، مافی مرۆڤ**). هەڵبەت جاری وا هەیە ئەم چەترەی لێرە بۆ میللەتێک هەیە،لە شوێنێی دیکە لەسەر یەک کەس لەوڵاتێکی دیکە هەڵدەدرێ. لە وردبوونەوەیەک دەرهەق بەم هەلومەرجە تازەی دنیا، ڕەنگە لەماوەیەکی کەمدا هاوکاری نێودەوڵەتی دەست بخاتە کاروباری هەر وڵاتێک ولە هەر شوێنێک کە توانای بەڕێوەبردنی خۆیان نەبێت.بۆیە پێمـوایە ئەرکی ڕۆشنبیرانی کوردستان ئەوەیە فەرهەنگێک سازو ئامادە بکەن کە میللەتەکەمان بەئاسانی بتوانێ ئەرکە نیشتمانی و نێودەوڵەتیەکان تێبگا،واتە ئەوەی پەیوەندی بەژیانی کوردستانەوە هەیە ،ئەویش بۆ پاراستنی وڵاتەکەمان و ئیدارەکەمان. هەروەها بۆ ئامادەکردنی مرۆڤی کورد تاکو لە پێشهاتە نوێیەکان تێبگاو وەکو مرۆڤێکی هاوچەرخ بچێتە ناو ژیانی سەردەمەوە،.بەڵام ئێمە چەند ساڵە نەمانتوانیوە ئەوە بکەین کە چاوەنوارییمان لێدەکرێت. بەڕاستی ئەوە ئەرکێکی یەکجار گەورەی سەر ئەستۆی ڕۆشنبیرانی کوردستانە.

باشه بۆچی ئاستی فەرهەنگی ئێمە بەگوێرەی پێداویستەکانی قۆناغەکەمان، لە ئاستی ئەو ئیدارەیەنیە کە ئەزموونەکەمان بەرەو دەوڵەتی کوردی دەبات؟ ئەوەپێویستی بە رۆشنبیرییەکی نەتەوەیی پێشکەوتونخوازو□پێگەیشتوو هەیە،رۆشنبیرییەک دەقاودەق بەگوێرەی چەمکی پێشکەوتن.

دیارە نابێ نکوڵی لەوە بکەین باری ئابوری کوردستان هۆکارێکی گرنگە لە پاشکەوتوویی رۆشنبیریی ئێمەدا . ئێستا تێگەیاندنی مرۆڤ کارێکی ئاسانترە لەچاو دەساڵ لەمەوبەر، جا بۆیە خۆ جووڵاندنی رۆشنبیرانی کورد بۆ ئەوەی بەرهەمێکی فیکری بخەنە ناو وڵاتەکەیان، بەرهەمی زۆر پتری دەبێ لەوەی کە لەمەوبەر بیانویستایە. چونکە ئاستەنگەکانی ئەو رۆژگار و ئەمرۆ بەهیچ شێوەیەک بەروورد ناکرێن،؛ئەمرۆ رۆشنبیرانی کورد ئەو زەحمەتە نابینن ئەگەر بیانەوێ هزرێک بخەنە نێو رۆشنبیریی کوردیەوە یاخود بیانەوێ داکۆکی لە کارێکی پێشکەوتوو یان دەسکەوتێکی پێشکەوتوو بکەن.

ئەو فەرهەنگە سەقەتەش کە داگیرکەر لە وڵاتی ئێمەدا جێیهێشتووە ،ئەویش کاریگەری خۆی هەیە. ئەو پاشماوانە زۆر ئازار بەخشن، واتا زۆر کەڕەت لەلای رۆشنبیری کورد، لەنێوان ملکەچی و رەتکردنەوەدا بەرامبەر بە دەسەڵات شتێکی دیکەنابینین.رەتکردنەوەی موتلەق و دانیشتن لەماڵەوەو هەموو کەس بەخائین و بەنەزان و تێنەگەیشتوو دادەنێت و خۆشی هیچ ناکات.رۆشنبیری پێچەوانەی ئەمەش ،دەچێ تەواو لەگەڵ دەسەڵاتدا تێکەڵ دەبێت تا دەبێتە داردەست. بەداخەوە هەردووکی بێویژدانی تێدایەو خۆ دزینەوەیە لەو ئەرکەی سەبارەت بەباری فەرهەنگی لە کوردستاندا دەکەوێتە ئەستۆی رووناکبیران.

هەڵبەت لەکاتی وردبوونەوە لەباری کۆمەڵایەتیشمان ،ئاستەنگی زۆر گەورە لەبەرامبەر پێشکەوتن هەن و بەرەنگاری دەبنەوە. جا ئەگەر بڵێین ئێمە لەزاتەوە پێشکەوتنخوازین، بەڵام هەندێک هۆکاری دەرەکی نایەڵن ئێمە بەرەوپێشەوە بڕۆین،هەڵەیە. بۆیە دەبێ بیرێک لە هۆکارە ناوخۆییەکانیش بکرێتەوە .لەگەڵ ئەوەشدا نابێ لەبیرمان بچێت بەحوکمی ئەوەی ئێمە میللەتێکی داگیرکراو بووین، هیچ جۆرە گرێیەکمان (عوقدە) بەرامبەر بە مێژوو نیە و لەچاو دەوروبەرمان ،ئامادەکاری باشترمان تێدایەو دەتوانین پێشبکەوین.

لای ئێمە تەفسیری سیاسی بۆ ئاین ،بەمەبەستی سیاسی ،دیسان دەوری خۆی هەیە لە ئاڵۆزکردنی کێشەکەو ئاڵۆزکردنی پێشکەوتنی رۆشنبیری. هەروەک چۆن تەفسیری نەتەوەیی بەرچاو تەنگ رۆڵی هەیە بۆ دروستکردنی ئاستەنگ لەبەردەم رۆشنبیری نۆرمالدا .لێکدانەوەی چەپی توندڕۆ دیسان ئاستەنگ لەبەردەم پێشکەوتنی رۆشنبیری دروست دەکات.

ئێمە میللەتێکین زمانێکی تەواویەکگرتوومان نیە، نە لە نووسین، نە لەقسەکردندا .لەسەدەی پێشکەوتنی تەکنەلۆژیای راگەیاندندا، بژارکردن و یەکێتی زمان ئاسانتر بووە. ئەو خەیاڵەی کە ئێمە دەمانکردو دەمانگوت یەکگرتنی زمانی ئێمە زۆر زەحمەتە، ئێستا لەسەردەمی پێشکەوتنی تەلەڤزیۆن و ئەنتەرنێت و کەرەستەکانی راگەیاندندا کە لەچەند ساڵێکی ئایندەدا جۆری تازەتر دادەهێنری و ١٠٦
هەر کەسێ دەتوانێ هەیبێ، لەوەدا بابەتی تێکەڵبوونی زاراوەکان لەکوردستاندا،

مەسەلەی زاراوەی یەکگرتوو مەسەلەی بیرکردنەوەو گفتوگۆ لەسەر زمانێکی پاراوی دەوڵەمەند کە مرۆڤی کورد بتوانێ پێی دەربڕێ، دەبێتە کارێکی ئاسان، نەک تەفسیری زمانی پەتی کوردی بێت کە جاری وا هەیە جینگڵ دەدەمیت کە چۆن بتوانی پێی دەربڕی . ئەمەش ئاستەنگێکی دیکەیە لەبەردەم پێشکەوتنی رۆشنبیریی ئێمەدا. مەبەستمە بڵێم ئەو ئاستەنگانە هەن.

ناوچەگەری ،دیسان، چ بەشێوەی زاراوەیی،یان بە شێوازی دیکە بێ، کاریگەریەکی یەکجار زۆری هەیە. وەک کێشەی کوردستان و چوار پارچەبوونی، هەروەها کێشەی حزبەکان لەگەڵ یەکدی و تەئسیر وەرگرتنی هەر یەکێک لەو حزبانە لە کولتوری داگیرکەری ولاتەکەی خۆی. ئەوانەش کێشەی گرنگن کەبۆ ئێمە مایەی ئازارن .دوو نموونە دێنمەوە؛ حزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران و پەکەکە، ئێمە لێرە و هەندێ لە حزبەکانی کوردستانی سوریا، ئەگەر وردبیەوە لە روانگە گشتییەکانیاندا لەناو بزووتنەوەی سیاسی و هەندێکیش لەناو رۆشنبیریشدا، جۆرێک لەجیاوازیی هەیە. هۆی چیە ئێمەو پەکەکە تێکناگەین؟

کێشەی ئافرەت لە ولاتی ئێمەدا، تاکو ئیستا کێشەیەکی زۆر گەورەیە .وەکو هەموو ولاتانی پاشکەوتوو، لەکوردستانیشدا بەرەنگاریەکی یەکجار بەهێز هەیە بەرامبەر نیوەی کۆمەڵگەکەمان،تا لەناو ژیانی ئابوری و ئیداری و فەرهەنگیدا وەکو مرۆڤێکی باوەڕپێکراوبەشداری نەکات. جا پەنا بۆ هەمووئەوپاساوانەش دەبردرێ کە بەدرێژایی مێژوو رێگەی لە ئافرەت گرتووە بەشداری لە ژیانی ئابوری و ئیداریدا بکات.

روشنبیرانی ولاتی ئێمە ، بەزۆری لە چیرۆکنووس و شاعیر و ئەوانەی کاری لێکۆڵینەوە وکاری فکری دەکەن لە مەڵبەندەکانی زانکۆکاندا و ئەوانەی لە بواری مافی مرۆڤ دەنووسن،پێکدێن. ئەوانە کەمینەن، هەموو بوارەکانیان گرتووە، بەڵام لە هەموو بوارەکاندا کەم و کوڕی بەیەک ئەندازە دەبینرێ.

جموجۆڵی چاپەمەنی لەکوردستاندا زۆر پەرەی سەندووە. بوار بۆ دەربڕین لە هەموو روویەکەوە هەیە. ئەگەر سەرنج بدەن خەڵکان لە دەرەوەی کوردستان دێن، دەڵێن خەریکە دەگەنە قۆناخی تێر بوون، بەڵام کەموکوری زۆرەولاوازی پێوەدیارە. تا ئێستا ژمارەیەکی زۆر لە بەرهەمی رۆشنبیران بلاوکراوەتەوەورۆڵێکی زۆریشی دەبێ، کارێکی مەزنیشەو بچوک نیە، بەڵام لە کۆتایی ئەم سەدەیەدا کەوا دنیا بە ئاسانی لێک تێدەگات، لە هەر کوێیەکی دنیا کێشەیەک هەبێ، تۆ بە ئاسانی هۆکارەکانی تێدەگەی. دەڵێم جێی پرسیار نیە کە لە فەرهەنگی کوردستاندا ،کێشە سەرەکیەکانی ناوخۆمان رەنگێکی باش ناداتەوە، چارەسەری تێدا نیە، بوێری تێدا نیە؟ من بوێری بە بەمانای سادە باس ناکەم ،بوێری لەلای رۆشنبیرانی کوردستان کێشەیەکی زۆر گەورەیە. رۆشنبیران هەن بیروڕای زۆر جوانیان هەیە، بەڵام ئامادە نین بینووسن، جاری وا هەیە ئامادە نین بگێڕنەوە . تاک و تەرا هەن هەست بە بەرپرسێتی ناکەن، بیرو بۆچونێک دەخەنە روو و کێشە و گرفت دروست دەکەن، کە ئەمەش جیاوازیەکی زۆری هەیە لەگەڵ بوێری رۆشنبیران بۆ چارەسەری کێشەی ولاتەکەیان .



بەستەڵەکی فکری نەتەوەیی ،لەناو کوردستاندا ،دوای راپەڕین بەبڕوای من یەکێکی

دیکەیە لەو مەترسیانەی کە وردە وردە خەریکەبەسەر فەرهەنگماندا زاڵ دەبێ. لای زۆر لەو کەسانەی کە لەراگەیاندنەکان و لە بواری لێکۆڵینەوەدا کار دەکەن دەزانن زۆرجارهەیە حەز دەکەن بڵێن ( لە هەولێر تورکمان نیەو کاکە ئەوانە رەچەڵەکیان نیە، ئەوانە تورکیا دروستی کردون)!. لە کاتێکدا دیاردەیەک هەیە لە هەولێردا کۆمەڵێک هەن بە تورکی قسە دەکەن. خەڵکێکی دیکە هەیە حەز دەکا بڵێ (عەینکاوە هەموویان کۆنە هەولێرین و کوردیشن بەڵام ئاینیان جیاوازە. لە کۆیە ئاشوری نین کوردن، لە سلێمانی هەر کوردی کوردن) !.ئەوە چ لەسەر بیری نەتەوەییمان زیاد دەکات؟ لە کاتێکدا کە ئێمە میللەتێکین بەدرێژایی مێژوو چەوساوینەوە. بەداخەوە ئەوبۆچوونە تەنیا لەلای دەسەڵاتی سیاسی نیە، جاری وا هەیە دەسەڵاتی سیاسی لەبەر بەرژەوەندی حزبیان، هەندێ دەستپێشخەری دەکات کە رۆشنبیرانی کوردستان ئەوانەی لە بواری لێکۆڵینەوە کار دەکەن ،بەجێدەهێڵێ.

لە بیری نەتەوایەتی ئێمەدا مەسەلەی کوردستانیەتی هەیە. ئێمە میللەتێکی چوارپارچەین، هەر یەک لە ئێمە خاوەنی ئەو کوردستانە گەورەین کە چوار پارچەیە، بەڵام تاکو ئێستا لە ساغکردنەوەی کێشەی نێوان پارچەکانی کوردستان — کە راستە رۆشنبیران دروستیان نەکردووە، بەڵام ئێستا رۆشنبیرانی کوردستانی تێیدا دەسووتێن — دیراساتی ئەوتۆ نابینرێ کە شیاو بێ. خەڵکێک نیە خوێ ماندوو بکات و ئەو مەسەلەیە ساغ بکاتەوە کە بەشێکە لە بیری نەتەوایەتی ئێمە. هۆی چییە ئێمە و حزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران تێکناگەین! هۆی چیە ئێمەو یەکەکە تێک ناگەین! هەر هەمان هۆشە کە لێرە رێگەی داوە لە کوردستانی سەربەخۆدا دابەشکردن دروست ببێ. لەوانەیە من وەکو لایەنگری حزبێک،بە حەقی خۆمی بزانم هەرچی چاکەیە بۆ حزبەکەم بڵێم، بەڵام ئەوە وەکو حەقی منە، ئەرکی رۆشنبیری من نیە.من پێم وایە لەو بابەتەش دا ئۆباڵێکی یەکجار زۆر ،نەک لە ناو بزووتنەوەی سیاسی، بەڵکو لەناو خەڵکی کوردستان، کە تا ئێستا سەرگەردانە وتێناگات کێشە نەتەوەییە پارچەییەکانی ئێمە — مەبەستم چوارپارچەییەکەیە — چیە؟ ئەوا دەکەوێتە ئەستۆی رۆشنبیرانی کوردستان.

بابەتێکی دیکە ، ئەمڕۆ جێگای باسە و دەبێ گفتوگۆی لەسەر بکرێ؛ ئەویش بەکارهێنانی ئایینی ئیسلامە و تێکەڵ کردنیەتی لەگەڵ روانگای تایبەتی بۆ چارەسەرکردنی کێشەی کوردستان.ئەوە پاڵەپەستۆیەکی گەورەیە بۆ پێشنیار کردنی بەدیلێک، کە بە ئازارو بەربەرەکانیەوە دەیەوێ بیری خۆی بڵاو بکاتەوە. لەوەشدا لاسایی کردنەوە بە ئاشکرا پێیانەوەدیارە کە هیچ پەیوەندی بە کورد و ئایینی ئیسلامەوە نیە. ئەمەش جێی باسە بەهەردوو لایەنی چاک و خراپیەوە. تا ئێستا لەسەر هەرلایەک بە رۆشنبیری کورد دەڵێی کاکە رایەکەت هەبێ، وەڵام دەداتەوە؛ ئیسلامیەکان تیرۆرم دەکەن!

کاکەبۆ تیرۆرت دەکەن؟. هیواداریین لە بیری لاسایی کردنەوەدا، کە لە وڵاتانی دیکەدا بووە بە ئازار بۆیەخەریکەبە دەوردانێکی نێودەوڵەتی چارەسەری بکەن،لێرە لە کوردستانێک کە کۆمەڵگەی نێودەوڵەتی دەیپارێزێ ، ئەم دیاردەیە سەر هەڵنەدات. خۆ ئەگەر سەرهەڵنەدات ئەوە جۆرێکە لە رەسەنایەتی. لاسایی کردنەوە لە فکری سیاسی ئیسلامیدا هەیە، هەر وەک چۆن لاسایی کردنەوە لەبیری شیوعی دا هەبوو. بیری شیوعی دەیتوانی رەسەن بێت یان لاسایی کەرەوە بێت. بەلاسای ١٠٨

کردنەوەکەی ئازارێکی زۆری بە ڕۆشنبیریی ئێمە گەیاند.

ئێستا ڕێک بیری ئیسلامی جۆرێک لە ئاستەنگی تێدا هەیە، بە هەموو بوارەکانیەوە، لاسایی کردنەوە دەبیندرێ و ئازاری ڕۆشنبیریمان دەدات. کارم بە سیاسەت نیە، کە ئەمەش جێگای گفتوگۆیەدەکەوێتە سەر ڕۆشنبیرانی سیاسی ئیسلامی وبەشێکی زۆری دێتەوە سەر ڕۆشنبیرانێ کە پەیوەندیان بە هیچ تەیارێکی سیاسی ئیسلامی و نەتەوەییەوە نیە و سەربەخۆن.بەڵام ئەوەی کە دەکرێ ئێمە ئاماژەی بۆ بکەین ،لە کوردستاندا دەبێ هەموومان شپرزەبین بەوەی کەوا لەسەردەمی پێشکەوتندا هۆکاری وامان هەبێ دژی پێشکەوتن بوەستێ. بێگومان ئەگەر لە وڵاتێکدا بواین کە بەربەرەکانیەکان تەنیا بە قسە کردن بوایە، کارێکی یەکجار خۆش دەبوو. ئەمەش کێشەیەکە ڕەگەزەکانی لەناومیللەتی خۆمانەدایە؛ هەر لە بیری سیاسی ناو کۆمەڵگاکەمانە، ئینجا سەرچاوەکەی یەکێک لە مارکسیزم دەیهێنێ ،ئەویدیکە لە بیری نەتەوەیی دێنێ کە کورد بە درێژایی مێژووی خۆی پێی تێکۆشاوە ، یەکێک لە ئایینی ئیسلام دەیهێنێ ،کەیفی خۆیەتی گرنگ ئەوەیە ئاستەنگ نەبێ. کە ئاستەنگ بوو ئەوە خراپیەکەی دەگەڕێتەوە بۆ هەموو میللەتەکەمان.

ئەم دنیایەی دەمانپارێزێ ،لێیدەوێین کە وڵاتێکی شارستانی و سیستەمێکی دیموکراتیمان هەبێ، پاراستنی لانی کەمی مافەکانی مرۆڤمان هەبێ. ئەو وڵاتەی ناوێ کە لە پایتەختەکەیدا بە توێلکە شووتی لە ئافرەتان بدرێ. مایەی قێز لێبوونەوەیە کە هاوولاتی ئافرەتی کورد لەدەرەوەی وڵات بێنەوەو لەناو بازاڕی شارەکانیان، بەشوتی و پێڵاو بە فیتە دوایان بکەون. ئەمە دەربڕینی ڕۆشنبیریی سەقەتی ئێمەیە، ئەمە خاڵی بوون و بەتاڵ بوونی شوێنی ڕۆشنبیرانە لە ژیانی فەرهەنگی وڵاتێکدا، کە بەجێیان هێشتووە بۆ حزبەکان، کە ئەوانیش دژایەتیەکەیان ڕۆشنبیری نیە و بگرە بەربەرەکانیەکانیان بۆ کورسییە.

دیاردەیەکی دیکە لەناو ڕۆشنبیرانی ئێمەدا هەیە، کە لەوانەیە دژبەیەک بێت لەگەڵ ئەوەی تائێستا دەمگووت. لەگەڵ دوورەپەرێزی، لەگەڵ بێلایەنی بەرامبەر مەسەلەی وڵاتەکەی ،لەگەڵ ترسنۆکی و کەم بوێری، ڕۆشنبیری ئێمە هەڵچوونیشی هەیە. گرفتێکی دیکەی ناو ڕۆشنبیریمان گوێ لەیەک نەگرتن و گفتوگۆ نەکردنە لەسەر کێشەکان، کە ئەمەش وەکو نەریت، نەریتێکی پاشکەوتووە .

ئەگەر مەبدەئی سەرەکی لای هەر میللەتێک ئەوە بێ ،لە دوا دوای ئەم سەدەیەدا، بەرژەوەندی ئەو میللەتە لە کوێ بێ، مەبدەئەکان لەوێ چارەسەر بکرێن و لەوێ دەردەبردرێن، ئەوە بەرژەوەندی میللی هیچ کاتێک خراپە نیە، تەنانەت ئەگەر لەگەڵ بەرژەوەندی میللەتانی دەوروبەریشدا دژ بێت. بەداخەوە ئێمە درەنگ لەوە گەیشتین کە بەرژەوەندی میللی بە مەبدەئی موجەڕەد دانارێژرێ، هەر بۆیە زۆر جار لە پێشدا لەناو بزووتنەوەی ڕزگاریخوازی کوردستاندا، بەرژەوەندی میللی بە قوربانی مەبدەئە موجەڕەدەکان دەکرا، کە لەدەرەوە لە بەرژەوەندی وڵاتانی دیکەدا بوو. ئێستا ئەگەر لە کوردستاندا بگەڕێینەوە بۆ مەبدەئە نەتەوەییەکانمان ، دەبێ لە پێناوی پاراستنی ئەم تەجرەبەیە و پێشکەوتنی کۆمەڵی کوردەواریدا، کام هەنگاو لەبار بێت ،
١٠٩ مەبدەئەکان لەوێ دابڕێژینەوە، دوور لە هەڵچوونی سیاسی، بە پشوویەکی زانستی و مەنتیقی ،گفتوگۆی لەسەر بکرێت، تابزانین لە چ کارێکدا دەتوانین بەشدار بێن.( مەبەستم پەیوەندی نێوان پارتی و یەکێتی نیە ،لەوێ مساوەمە دەکرێ پێک دێن یان

پێک نایەن ،لەکەس ناپرسرێ)، بەڵام لە بواری رۆشنبیریدا شتێکی دیکەیە.نموونەیەک لە فکری ئیسلامی سیاسی دێنمەوە؛ئایا شێخێکی دۆڵەمەندی کەنداوی عەرەب باشتر لە کوردێکێ هەژار سیستەمە کۆمەڵایەتیەکەی دادەرێژێ؟ لەوێ پارە دێ ولێرە بەرەنگاری فەرهەنگی پێ دەکرێ! کەچی تازە پێشکەوتووترینیان لە وڵاتانی کەنداو نیازی وایە لە ساڵی )٢٠٠٥(دا ئافرەت مافی دەنگدانی هەبێ، تاکو ئێستاکە رێگەیان نەداوە هیچ حزبێکی سیاسی لەناویاندا هەبێ، تاکو ئێستا رێگە بە ئەکادیمیەک نادەن لە زانکۆکانی خۆیاندا رای هەبێ ودیراساتی باش لەسەر پێکهاتەی کۆمەڵایەتی خۆیان بکات بۆچارەسەری کێشەکانیان . لەبەدبەختی ئێمە هەندێ لە رەگوریشەکانی فکر ئیسلامی سیاسی لە کوردستان دەچنەوە ئەوێ. رۆشنبیرانی ئێمە دەبێ یارمەتی کێشەی میللەتەکەیان بدەن و لێی حاڵی بن، مادام چارەنووسی ئێمە بەدەست حزبە سیاسیەکانەوەیە، کاتێک کێشە دەکەوێتە ناو حزبە سیاسیەکان دەبێ بزانن کە ئەو مەبدەئانەی کە هەڵیان گرتووە، کام حزب و لەکوێ هەڵەی تێدا دەکات، نەک لە پێناوی ئەو حزبە، بەڵکو لە پێناو ئەو بەڵایەی لە کوردستان دا هەیەو ناهێڵێ ئێمە هەبین ،وەکو وڵاتێک بەسەربەخۆیی بژین.لەشەڕی ناوخۆییدا هەر تۆپێک کە دەتەقێ، هەر ئارپیجیەک کە دەوەشێندرێ بەشی خواردنی گەرمکێکی هەولێر لە رۆژێکدا دەسوتێنێ. ئێمە لە پێشکەوتنی رۆشنبیریمان لە کوردستاندا ناتوانین پشتمان بە فەرهەنگی سیاسی باو ببەستین.

ئێمە لە قۆناغێکدا دەژین کە وردە وردە رۆشنبیریی نەتەوەیی بچووک دەبێتەوە و لەلایەکی دیکە گەورە دەبێ بەکاروەرگرتن لە رۆشنبیریی جیهانی و پێشکەوتنی وڵاتانی دیکە. لەو رووەشەوە رۆشنبیران لە ئەستۆیاندایە کە لەو مەسەلەیە تێبگەن، چونکە ئێستا چەمکێک هەیە دەڵێ ؛دەبێ بەرەنگاری بکەین لەبەردەم هێرشی بەجیهانی بووندا. کەناکرێ، ئەگەر بمانەوێ ئەو تاقیکردنەوە فەشەلە توشی خۆمان بکەین، جگە لە ئازاردانی میللەتەکەمان هیچی دیکە نارنینەوە. مەبەستم ئەوە نیە کە بەجارێک دەرگاکان بکەینەوەو فەرهەنگی خۆمان بسرینەوەو هیچ بۆ خۆمان نەهێڵینەوە. بەڵام ئەوە کێشەیەکەو رەگی ئیجابی زۆر گەورەی لە فەرهەنگدا ــ بە هەموو بەشەکانیەوە ــ هەیە. لەوەدا دەبینم کە بەناوی نەتەوەپەروەری و پاراستنی رۆشنبیریی کوردی، بەناوی پاراستنی زمانی کوردی دەیانەوێ لە بەرامبەریدا هەڵوێست وەربگیرێ. من پێموایە، ئەوەیان لافیتەکەی هەرچی بێت، جۆرێکی دیکەیە لە خۆنیشاندانی پاشکەوتن لە کوردستاندا لەبەرامبەر پێشکەوتنی کۆمەڵی کوردەواریدا.

ئێمە تەقالیدی زۆر درێومان لەلا دروست بووە بۆ بەرەنگار بوونەوە کە ئەگەر بێین هەڵیانسەنگێنین ،زیانێکی زۆری هەیە بۆ رۆشنبیری میللەتەکەمان. لەکوردستاندا فکرێکی دیکە هەست پێ دەکرێ. ئەویش دەڵێ خۆ هەموو نەخشەیەک سیاسیەکان دایدەرێژن، جاوایە کارکردن بۆ چییە؟! من دەڵێم ئێمە لەسەردەمێکدا دەژین کە سیاسیەکان زوو یان درەنگ بەجۆرێک کۆتاییان پێ دێت ،جا ئەم کۆتاییە مەرج نیە دەسەڵاتیان لێ وەربگیرێتەوە، بەڵام دەوریان لە ناو کۆمەڵدا کۆتایی پێ دێت . جا ئەوانە چ حزب بن یان کەسایەتی. لەناو میللەتانی دیکەدا سەرکردە سیاسیەکان هەموو شتێک دادەرێژن، بە پێچەوانەوە، روناکبیری ئەو وڵاتەیە کە هێڵ بۆ ژیانی

سیاسییەکانیش دەکێشێت.

لە کوردستاندا رۆلی رۆشنبیران دەبێ لە بنیاتی کۆمەڵدا لە رۆلی سیاسییەکان یەکجار گەورەتر بێت.لە رووی دەروونیەوە زۆر لەبارە کە ئێستا لە کوردستاندا گفتوگۆ لە بواری رۆشنبیری بچەسپێندرێ، رێگەنەدرێ هۆکاری توندوتیژی تێبکەوێ، چونکە ئێمە لەگەڵ میللەتانی دراوسێمان لە بوارێکی ئەستەمداین.ئێستا قۆناغ قۆناغی گفتوگۆیە، قۆناغ قۆناغی لێکترحاڵی بوونە، قۆناغی بەردەوامی خیلافەکانە. پێویستە رۆشنبیران بواری گفتوگۆ زیاتر لە ناو فەرهەنگی میللەتەکەمان بچەسپێنین و بپارێزین.

لەکۆتاییدا ئەوەی دەمەوێ سەرنجی بۆ رابکێشم ، نەبوونی ئینتمایە. مەبەستم ئینتماکردن بۆ حزب نیە، بەڵکو ئینتمایە بۆ دەسەڵاتی میللی.بەرای من ئەو رۆشنبیرە زۆر غەدر لە خۆی دەکات، کاتێک بیەوێ پرۆژەیەک پێشکەش بکات بەلام دەسەلاتێکی لە پشت نەبێت. جا ئەم دەسەلاتە چ لە دەزگاتایبەتییەکاندا خۆی ببینێتەوە، یان لە دەزگا حکومیەکان و حزبیەکاندا خۆی ببینێتەوە، ئەوە فەرق ناکات، گرنگ ئەوەیە کە تۆ میکانیزمێکت کەوتۆتە بەردەست کە بتوانی کاریگەرەیەکە بکەی، ئەمە رای زۆربەی کەڵە روناکبیرانی دنیاشە.

دەسەلات و رۆشنبیری پەیوەندیەکی گرنگیان بەیەکەوە هەیە، کە ئەگەر لێک دابران بگاتە ئەو رادەیە، دوور نیە مەترسی ئەوەی کە ئێستا لە ئەفغانستان و چەند ولاتێک دەبینرێ، لە ولاتی ئێمەشداقەرێنە پەیدا بکات.

* * *

رەئوف حەسەن:

## ئەرکی خۆتان بەمل ئێمە دامەدەن

زۆر سوپاس بۆ بەرێز سەرۆ قادر بۆ ئەو دەروازەیەی کردیەوە. رەنگە من لە نیوەی باسەکەی زیاتر ، بە پێچەوانەی ئەوەوە بۆی بچم .لە خاڵی یەکەمەوە دەست پێدەکەم ، ئەویش مەسەلەی ترسە. پێموایە زۆر بە پێچەوانەوەیە،رۆشنبیران قەت ترسیان لە هیچ شتێک نیە، بەڵکو سیاسیەکان ترسیان لە هەموو شتێک هەیە، لە پێگەی خۆیان دەترسن نەکا رۆشنبیرێک جێگەیان بگرێتەوە .لەبەرئەوە نەخشەیەک هەیە لە زۆر شوێنی کوردستاندا پەیرەو دەکرێ ئەویش چۆن رۆشنبیران سوک و ریسوا بکرێن، بە نەخشە کۆمەڵێک رۆشنبیر ریسوا کراون وهەر بەناو ئێستا دەتوانم دەیان رۆشنبیرتان پێ بڵێم کە لە رۆژنامەکاندا سوک کراون وجنیو بە خۆیان بە دایک و باوکیان دراوە. ئەم نەخشەیە بەراستی هەموو لە سیاسەت و لە حزبەکانیشەوە بەرەو رویان کراوەتەوە بۆ ئەوەی باس هەر باسی خۆیان بێ وباسی رۆشنبیری نەکرێ .ئەمە خاڵێک، خاڵی دووەم مەسەلەی داهێنان رۆشنبیریی یا فەرهەنگی کوردی لە دوای راپەرین بەو شێوەیە ویران نەبووە کە باسیکرد؛ داهێنان هەیە

وشتی فکری باشیش هەیە. گرفتێکمان ئەوەیە پێش راپەڕین هەرچی نووسین هەبوو بە میللەت دەگەیشت، بەڵام دوای راپەڕین هیچی پێناگا. گۆڤارێک دەردەکەی ئەو پەڕی ١٠٠٠ دانە، ئەو هەزار دانەش ٧٠٠ دانەی ناخوێندرێتەوە لە مەکتەبەکاندا بۆ لێپرسراوەکان دەچی. لە بازاڕ چ گۆڤارێک چ کتێبێک هەیە لە ٢٠ نوسخە زیاتری لێ بفرۆشێت؟ بەڵام کاتی خۆی ئێمە هەر لە سەردەمی بەعسدا لەبەغدا بە ٢٠ هەزارو ٥٠ هەزار کتێب و گۆڤارمان دەردەکرد ،هەمووی دەگەیشتە دورترین کوێرە دێ. شەو تا بەیانی لێپرسراوە گەورەکان بە دیارەیانەوە تا بەیانی دادەنیشتن ودەیانخوێندەوە. ئێستا لە چەرخی سەتەلایت و مانگی دەستکردا هیچ شتێک بە کەس ناگات ،کتێبەکەتی پێشکەش دەکەی دەیباتەوە ماڵەوە بۆ خۆی تا بیخوێنێتەوە، رۆژنامەو گۆڤارەکەی پێشکەش دەکەی تا بیخوێنێتەوە.

بەراستی ئێستا داهێنان هەیە و تەحەداش هەیە .لە هەمان کاتدا خاڵێکی زۆر بنەڕەتی هەیە کە کاک سەرۆ قادر زۆر پێی لەسەرداگرت ،ئەویش مەسەلەی دەسەڵاتە. هەڵبەت ئەگەر ئەو نەبوایە مەجالی ئەم باسە نەدەڕەخسا، ئەمەش گرفتێکی یەکجار گەورەیە، نامەوێ بچمە ناویەوە، بەڵام یەک شت هەیە ؛سەرتاپای تەعریفەکانی دنیاکە بۆ رۆشنبیر کراوە تاکو ئەمڕۆ ،هەموویان تەئکید لەسەر ئەوە دەکەن کە دەبێ دژی دەسەڵات بێ، دەبێ رەخنە لە دەسەڵات بگرێ لایەنگری دەسەڵات نەبێ، کە لاگیری کرد دەبێتە بەشێک لە دەسەڵات.بەتایبەتی لە کوردستانی ئێمەدا کە کۆمەڵگای مەدەنی ،من بە تەمای نیم و کوڕەکەشم بە تەمای نابێ دروست بێ، رەنگە لە دوای ئەو دروست بێ. کەمەڵگای مەدەنی ئەوەنیە حزب دەزگایەکت بۆ دابنێ پارەو مەسرەفت بکات .لە کۆمەڵگای مەدەنیدا دەزگاکان، خۆیان خۆیان بەرهەم دێنن، دەسەڵاتی خۆیان هەیە .ئەم دەسەڵاتە خۆی نوێدەکاتەوە ،خۆی دروست دەکا ،خۆی هەیمەنە دەکا. ئەم دامودەزگایانە هەر لە گوڵانەوە هەتا سەردەم و ئەوانەی کە حزب دروستیان دەکا و بەرهەمەکانیان لە پێناو حزب دایە . من لەگەڵ ئەوە دانیم چەپ و راست نەماوە لە دنیا، کاکە ئەو موشکیلەیەی کە ئێستا دەیبینی، هەموو دنیا ریفۆرم دەکا، وەک لە ئێران ریفۆرمیست وپارێزگار هەیە ،بە تەئکید چەپ و راستن، کاتۆلیک یا پرۆتستان هەیە ئەمەش هەر چەپ و راستە، چەپ و راست لە دنیا کۆتایی مێژوو نیە، کێشەکان هەمووی وەکو خۆی ماوەتەوە. بەبرادەریکیان گوت توخوا شەیتان بە لەعنەت بکە گوتی ؛نایکەم .گوتیان: بۆ نایکەی؟ گوتی ئەو شەڕەی کە خوا بۆ خۆی پێیناکری بۆ بە منی دەکا. کاکە حزب، یان دەسەڵات، یان حکومەت کۆمەڵێ یاسای داناوە کۆمەڵێ شتی بە پیرۆز گرتووە بەتایبەتی مەسەلەی ئاین و هەندێ مەسائلی ئافرەت، ئێستا ئەو مشکلەیە بۆبەسەر ئێمەیدا دەدەی کە خۆت ، یاساکانت، هەموو پشتگیری لەو کۆنەپەرستییە دەکا.

لەگەڵ ئەمەشدا ئەوەی کە رۆشنبیران کردوویانە ،بەدەیان کتێب بەردەوام دەردەچێ ،کتێبی پێشکەوتنخواز ،باسی ئافرەت، باسی سیاسەت، باسی هەموو شتەکانە دەردەچێ و داکۆکییەکی زۆریش دەکرێ لە پێشکەوتنخوازی . بۆ ئەرکی خۆت و حزبەکەت دەدەی بەسەر شانی ئێمە کە دەنگمان بە کەسیش ناگا.

* * *

کەریم شەریف قرەچەتانی:

## ترسی رۆشنبیران. ترسی کۆمەڵە

من یەک دوو تێبینی بچوک باس دەکەم، خۆزگە کاک سەرۆ پێناسەیەکی فەرهەنگی بکردبایە تا بمانزانیبایە ئەو رۆشنبیرەی ئەو باسی دەکات کێیە؟ بۆ نموونە ئێستا لەو سێ زانکۆیەی کوردستان ساڵانە هەزاران قوتابی دەردەچن، بەڵام لەو هەزارەهایە رۆشنبیریش نین بەو مەفهومەی بۆرۆشنبیر دانراوە. زۆربەی لەزانستێکدا شتێک فێربووە، ئایا ئێمە دەتوانین ئەوە بە پێوەر دانێین، کاک سەرۆ! بە بڕوای من تەنگژەی رۆشنبیر هەیە . دەبوایە پێناسەیەکی بۆ بکرابایە.

ئەو، هەموو مەسئولیەتەکەی خستە سەر رۆشنبیران، وەکو رۆشنبیر دەسەڵاتێکی گەورەی لەلایەنی ئابووری و راگەیاندنەوە لە دەستدا بێ ولە هەموو لایەکەوە کەمتەر خەمی کردبێ. ئەو رۆشنبیرەی ئەو باسی دەکا و دەڵێ هەندێکیان ترسنۆکن ، ئێمە لەگەڵیدا رێکدەکەوین، بەڵام ئەوەی ، باسی دەکا ئاکامە ،خۆزگەباسی هۆیەکانیشی بکردبایە. من وەک رۆشنبیرێ بۆ ترسنۆکم بۆ جورئەتم نیە؟ خۆزگە باسی ئەوەی بکردبایە کە لە خێزانەوە کە یەکەم دامەزراوی کۆمەڵایەتیە بۆ دروستکردنی رۆشنبیری دەست پێدەکات. هەموو خێزانەکانمان چەوسێنەرن و دەمان تۆقێنن و جورئەتی ئەوەمان پێنادەن کە سەر بەرز کەینەوە، دایک و باوکمان زۆر عادات و تقالیدی کۆمەڵایەتی دواکەوتوو هەیە کە بەراستی هەرچی جورئەت و داهێنان هەیە دەیکوژێ. دەڵێ لە شوێنێکدا گەورە دانیشت، بچوک نابێ قسە بکا، زۆر شتمان هەیە گیانی جورئەت و رووبەڕووبونەوەو گفتوگۆ لە بنەمای رۆشنبیرییە هەمووی دەکوژێ.

ئینجا دێینە قوتابخانە لەوێش مامۆستاکان رێک وەکوو باوکی دووەمن، بە هەمان شێوە دەچەوسێننەوەو قوتابی ناوێری قسە بکا .دەگەیە زانکۆ، لە زانکۆکەش کوتەک بە سەریانەوەیە و مناقشەت لەگەڵ ناکا .وا فێربووە. پێناسەی زۆر کەسی بە حساب رۆشنبیر، هەمووی دەبنە مرۆڤی سست و لاواز و ترسنۆک.ئینجا سیستەمە سیاسیەکەش لەو لاوە بوەستێ کە کاک سەرۆ ئاماژەی پێکرد کە هەندێک لەگەڵ دەسەڵاتدان و هەندێکیان لەدژین. کاردانەوەی هەموو مرۆڤێک لە رووی دەروونییەوە کە ترسنۆک بێت، دیاردەیەکی دەروونیە کەوا کۆمەڵ دروستی دەکا، هۆکاری تایبەتی هەیە .

خۆزگە ئامارەی بەوە بکرابایە ،رۆشنبیری ئێمە چەندین توانای هەیە کە بەسەربەستی قسە بکاو پاشکۆی حزبەکان نەبێ. رۆشنبیر گەر سکی برسی بوو، ناچار بەدوای پارووە نانێک دەگەڕێ. کە بە دوای ئەوەشدا گەڕا ،دەچێتە دەزگایەکی حزبیەوە. ئەوەی دیکەش کە لە دوورەوە وەستاون ،لەبەر ئەوەی پێی قبوڵ ناکرێ بچێتە ناو حزبێکەوە،ناچار کاردانەوەیەکی هەڵچوانەی دەبێ.

ئێمە هەتا ئێستا لە کۆمەڵگای کوردەواریدا فەلسەفەو ئایدۆلۆژیەکی تایبەتمان نیە کە وەکو دەستور و بنەماو چوارچێوەیەکی مەرجەعی ،لەسەری بڕۆین. ئێستا

ولآتێکی وەکو ئەمەریکا باس دەکرێ فەلسەفەیەکی پراگماتیکی خۆی هەیە، یەکێتی سۆڤیەتی فەلسەفەیەکی تایبەت بە خۆی هەبوو، دەوڵەتێکی ئیسلامی فەلسەفەیەکی تایبەت بە خۆی هەیە کە ئەو فەلەسەفەیە رەنگ دەداتەوە لە دەستور، لە خێزان ،لە قوتابخانە ،لە پرۆگرام .ئەو کەسە ئیتر کەوتە ناو فەلسەفە، راست یان هەڵە بێ ،قاڵبێک دروست دەکا ، بەڵام ئێمە هەتا ئێستاش وەک باسی کرا ،ئەو هەموو حزبانەی لە کوردستان هەنە، هەر یەکەو ئایدیۆلۆژیەکی هەیە.

* * *

ئازا جەسیب قەرەداغی:

**فەرهەنگی توندوتیژییە**

پێموایە ،لە بنەڕەتدا پرسی رۆشنبیری پرسێکی زۆر فراوانە، لەبەر ئەوەی بەرفراوانی هەموو توێژانێ دەچنە ناو پانتایی دەستەواژەی رۆشنبیریەوە. بەو رادەیە کە ئیتر پرسەکە بۆ خۆشی گەورە و فراوان بێ، ناشکرێت دەستەواژەی رۆشنبیری یان مەودای رۆشنبیر و رۆشنبیریی تەنیا لە قاڵب و ئاقاری نوسەران و ئەدیب و شاعیران و ئەوانەدا کۆ بکرێتەوە، بەڵکو زۆر لەوە فراوانتر دەبێ.

بە نسبەت پێکهاتەی کۆمەلایەتیەوە،خودی ئەو بابەتەی کاک سەرۆ پێشکەشی کرد ،ناچاری کردبوو خۆی بدات لە زۆر بابەتی چارەنووسساز و گرنگ کە هەموویان رۆڵی خۆیان دەبینن لە پێکهاتی کۆمەڵگاکەماندا . بە تەسەوری من دەکرێ پرسی رۆشنبیریی و رۆشنبیران یەکسان بکرێت بە پرسی مافەکانی مرۆڤ و ئازادیەکانی تاکەکەس. هەرکاتێکیش مەسەلەکانی مافی مرۆڤ و ئازادیەکانی تاکەکەس پێوەری خۆیان لە ناو کۆمەڵگادا دیتەوە، ئەو وەختەش دەتوانین باس لەوە بکەین کە چۆن رۆشنبیریی و رۆشنبیران دەتوانن لە پرسی کۆمەڵگاکەیاندا رۆڵی پۆزەتیڤی خۆیان ببینن. رۆشنبیران بۆ ئەوەی بتوانن ئەو رۆڵەی کە داوا و ئیشارەتی پێدەکرێ، ببینن، بە بۆچوونی من پێویستیان بە دەوڵەتی یاساو دامەزراوەکانی کۆمەڵگەی مەدەنی هەیە .سەرەنجام پێویستیان بە هوشیارییەکی گشتی مافەکانی مرۆڤە لەسەر ئاستی کۆمەڵگاکە، بۆ ئەوەی ئەوانیش بتوانن بەشداری لە درووستکردنی هەموو رەهەندەکانی ئەو کۆمەڵگایە بکەن. رەهەندەکانی سیاسی وئابوری و کۆمەلایەتی و رەهەندەکانی دیکە کە کۆمەڵگا پێویستی پێیەتی، بەداخەوە ئەوەی ئێستا هەیە و ئەوەی باوە،هوشیاری و رۆشنبیریەکی ترساندنە ،هوشیاری و تێگەیشتنی توقاندن و تەرهیب و تەرغیبە ،مل پێ کەچکردن و زەلیل کردنە، هوشیاری توندوتیژییە.

لێرە لە جیاتی هەبوونی رۆشنبیریی مافی مرۆڤ ،رۆشنبیریی توندوتیژی رۆڵی سەرەکی دەبینێ. ئەوەش لەسەر ئاستی هەر دوو ئیدارەکە، لەسەر ئاستی حزبەکان، لەسەر ئاستی کۆمەڵگاکە کەلە تەشکیلەی عەشایەری و میلشیات و چەکداری و ئەوانە خۆیان دەبیننەوە، هەموو ئەمانەرۆڵیان یان رۆشنبیرییان ، یان ئەوەی پێی هەڵدەستن بریتیە لە رۆشنبیرکردنی تاکەکانی کۆمەڵ بە رۆشنبیریی توندوتیژی

نەک رۆشنبیریی مافی مرۆڤ .لێرەدا رۆشنبیران ئەرکیانە تێبکۆشن، بەڵێ ئەو تێکۆشانەش بوونە و ئەو تێکۆشانەش دەبێت پرنسیپی خۆیان هەبێ . دەبێ چاو لە دەوروبەری خۆمان بکەین، رۆشنبیرانی عەرەب لە بەرانبەر توندوتیژی ئیسلامی سیاسیدا ئێستا چی دەکەن و چ هوشیارییەک بڵاو دەکەنەوە. ئەوانە هیچ دەوڵەتێکیشیان لە پشتەوە نیە بەڵکو خۆیان خاوەنی ئەو جورئەتەن کە بچنە ئەو مەیدانەی جەنگەوە.

دەربارەی چەپ وراست ،من پێم وایە ،ئەوە بە ئایدیۆلۆژی کردنە، کەوا ئەکات لە نەتیجە بڵێین نەماوە، چونکە ئەساسەن والێکراوە چەپەکان واتا مارکسیەکان کە سۆڤێت نەما واتا مارکسیەت نەما، لەبەر ئەوە چەپیش نەما. من پێمواییە ئەو مەسەلەیە وا تەفسیر ناکرێ بەقەدەر ئەوەندەی چەپ وراست ململانێی پرسی گۆڕانکاری و پرسی مانەوەیە .واتا موحافەزەکاریە ئینجا ئەوە بە ئایدیۆلۆژی ببێ یان نەبێ کێشەیەکی ئەوتۆ نیە و قەزەیەکەش لێکیان جیا ناکاتەوە. دەشێ هەر لەوکاتەدا کە تۆ بۆ نمونە پ.د.کە دەکرێ بخەیتە چەپەوە مادام داوای گۆڕانکاری دەکات، بەلام کاتێک کە چەق بەستوی ئیتر ئەو وەختە خۆی دەچێتە راستەوە .ئەوە پەیوەندی بە ئایدیۆلۆژی بوونی هیچ کام لە لایەنەکانەوە نیە. باسێ لە مەسەلەی جیهانگەرایی کرا، کەسێک نیە لە دژی بەجیهانی بوون وەستا بێتەوە چونکە ئەوە بە زەرورەت زاندراوە.

* * *

عەبدولسەلام بەرواری:

## سیاسیەکان ترسنۆک نین

ئەوەی من دەمویست لێرە باسی بکەم یەک خاڵ بوو ،ئەو ئیشارەتانەی لە لای کاک سەرۆش هات لای برادەرانیش هات ،پەیوەندی نێوان سیاسەتمەدار و رۆشنبیر، من لەگەڵ کاک «کەریم شەریف قەرەچەتانی»م .ئێمە پێشەکی پێویستە بەلای کەمیەوە لەسەر خەتی گشتی پێناسەدانی رۆشنبیر کۆک بین تاکو بزانین باسی کێ دەکەین، ئەو کاتە دەزانین ئەوە چ رۆڵی لەسەرەوە.ئایا رۆڵەکەی گێڕاوە یان نەیگێڕاوە. بۆیە ئەمە یەکێکە لە تەوەرەکان .رەنگە بە گشتی بڵێین کاک سەرۆ زۆر شتی خستە بەرچاو پێویستە ئێمە بەردەوام بین تێیدا ،رەنگە دابەشیان بکەین بۆ چەند تەوەرێک، لەم تەوەرانە وردە وردە تەرکیز بکەینە سەریەک تەوەر .رەنگە سودی هەبێت ئەوە وەکو پێشنیاریش بۆ ئێوە.

دابەشکردنی دنیا یان کۆمەڵگەی کوردستانی ئێستا بۆ سیاسەتمەدار و رۆشنبیر، من بە حەقیقەتی نازانم .ئەم شتەم لە ئەوروپا زۆر جار دیتوە و زۆر جار داخیلی مناقشات بوومە لەگەڵ زۆر برادەر لەوێ .بۆ من مفاجەئەیە تەسەور بکەم لێرەش هەمان دابەشکردن دەکرێت. لای من هەمووخوێندەوارێک رۆشنبیر نیە، لە لای من هەموو نووسەر وهەموو ئەدیبی چاک و شاعیریش مەرج نیەرۆشنبیر بیت،یان رۆشنبیر تەنیا زمانزانێکی باش بێت یان خاوەنی بڕوانامە بێت. هەڵبەت رۆشنبیر

هەر لەوانەوە دێت، بەڵام ئێمە بۆ سیفەتی رۆشنبیر یان هەتا خوێندەوارێک یان هەڵگرتنی بیروباوەڕێک لە کابرایەک وەرگرین کە لە گەنجایەتی خۆی هەستی کرد بە شتێک لەناو ئەو کۆمەڵگایە، لەوانەیە لەسەر زۆر مەسەلە تەنازولی کردبێ، ، رێگایەکی زۆر سەختی وەرگرت کە ئایندەکەی دیار نەبوو ،زۆر خەسارەتی دیت و لەوێ جێگایەکی دۆزیەوە، لە ناو دەزگایەکی سیاسی رۆڵێکی گێرا، ئەمە ناچێتە سیاسەت بە مەفهومی درۆ کردن و فێڵکردن لە جەماوەر . لە کوردستان سیاسەت واتا خەبات، پێتان بڵێم سیاسەت واتا هەوڵ بدەن لە حزبێکی سیاسی رۆڵێکی بەرزترت هەبێ تاکو تۆ بتوانی ئیمتیازاتیش وەرگری و رۆڵێکیش بگێرێ لە ناو حزبەکەدا، چ عەیبی تێدایە؟ ئەمە مانای ئەوەنیە فکر یان ئایدیۆلۆژی لەدەست بدات.

ئەوەی من تێیدەگەم ئێمە باسی کوردستانی ئاینده دەکەین .ئێمە باسی کوردستان پاش ئازاد بوون دەکەین . لەو کۆمەڵگەیە بە حەقیقەت ئەو دابەشکردنە نیە. سەرۆک کۆماری پێشووی ئەلمان باشترین موفەکیر بوو لەروی دەوری تەخریبی فیزیا و کیمیا لەسەرژینگە. دەبینی لە ئەمەریکای لاتینیش وەکو خۆمانن ، ئیتر تکا دەکەم ئێمە لەوەدا تۆزێک زیاتر بیر بکەینەوە، گوناهە ئێمە [سیاسیەکان]بە رۆشنبیر نەزانن، گوناهە قەبوڵ نەکەن ئێمە باسی ئەو شتە بکەین ئەوەی ئەوە (٢٠) ساڵە ئیشی تێدادەکەین. ئێمە رووبەرووی گرفتی کۆمەڵایەتی دەبینەوە، ئێمە کێشەکانی سیاسی موناقەشە دەکەین، ئێمە رووبەرووی قوتابخانە فیکریەکان دەبینەوە. رۆشنبیری من نازانم چیە ئەگەر هەوڵ نەبێ ،تێگەیشتنی کۆمەڵگای خۆت وهەوڵ نەبێ پێی بگەیەنی، فاکتەرەکانی ئەم کۆمەڵگایە دەجولێنن رۆڵت هەبێ. ئەو کەسەی کە ئەو رۆڵەی هەیە لەو گۆڕانکاریەی ئیجتماعی نابەسترێتەوە لە مەجالی سیاسیدا.

لەم زەمانەی ئێمەی تێیدا دەژین ئەو رۆشنبیرەی کە لە دەزگا سیاسیەکان نزیکە بە موچەخۆرە دادەندرێ. ئەوە توانای هەیە هێزی هەیە، لە خەڵکی دی زانیاری پتری پێیە ،بڕیاری باشتر وەردەگرێت ،بیرکردنەوەی باشترە.

* * *

د. شێرزاد نەجار:

## رۆشنبیری تێکەڵ(عضوی)پێویستە

ئیستنتاجم کرد کە کۆمەڵگای کوردی لە ئەزمەیەکدایە،ئەوە لەسەر ئەوە مناقەشەمان نابیت، بەڵام وا ئیستنتاجیشم کرد کە رۆشنبیری کورد دیسان لەقەیران دایە، واتە دووقەیرانمان هەیە قەیرانی کۆمەڵگای کوردی وقەیرانی رۆشنبیری کوردی، کەی دەتوانین لەم قەیرانە دەربچین،قەیرانی سەرەکی هی رۆشنبیری کوردیە، بەگوێرەی بۆچوونی من دوو هۆکار هەیە؛ هۆکاری سەرەکی نامۆیی رۆشنبیری کوردیە و بەتایبەتی گرفتی پێوەندی رۆشنبیری کوردی لەگەڵ دەسەڵات، وە دووەمین شت رۆشنبیری کورد ،نەیتوانی ببێتە توێژێکی رۆشنبیری ١١٦

ئەوتۆ کەبتوانێ کاریگەر بێت لەناو گۆڕانکارییەکاندا . واتە پرۆسێسی ئەوان پرۆسێسەکە پەیوەندی بەرۆشنگەرییەوە هەیە .واتا کۆمەڵگای ئێمە پێویستی بە رۆشگەرییە، کۆمەڵگای ئەوروپی بە رۆشنگەری پێشکەوت و ئێمەش پێویستمانە بەو رۆشنگەرییەیە. ئەو رۆشنگەرییە کێ دەیکات؟ رۆشنبیری کوردی دەیکات، ئەو ئەرکە ئەرکێکی زۆر گەورەیە، تحدیاتیشی هەیە. یەکێک لەو تەحدیانە نەبوونی دیموکراسیە، نەخوێندەواری ناو کۆمەڵ ئەمانە هەموو دەتوانم بڵێم رێگرن لە پێش کاری رۆشنبیردا، پێویستە رۆشنبیران بجوڵێن وچالاک بن چونکە بەرەنگارییەکی زۆر پێویستەکە روحی مقاوەمەتی تێدا بێت. تەمەشای بزووتنەوە گۆڕانکارییەکان بکەن بە تایبەتی لەسەدەی نۆزدەو بیستەمدا ،سەرکردایەتی ئەو بزووتنەوانە لەدەست رۆشنبیران دابوو، شۆڕشی ئەمەریکی و شۆڕشی ئۆکتۆبەریش رۆشنبیران کردیان. لێرەدا مقوەلەکی **(ماوتسی تونگ)** دێتەوە بیرم کە دەڵێ :**(بەبێ بەشداری رۆشنبیر سەرکەوتن بەدەست نایەت)**،واتا نابێ رۆشنبیر رۆڵی تەماشاکار ببینێ و لەگەڵ خواستی هاووڵاتی ئاسایی تێکەڵ بێت. خەباتگێڕ لە مانای خەبات ناگات ئەگەر لەناو پرۆسەی شۆڕشگێڕی دانەبێت. واتا ناتوانین پێی بڵێین ئەوە مرۆڤێکی خەباتگێڕە ئەگەر لەناو پرۆسەی خەباتگێڕیدا نەبێت. لێرەدا زۆر گرنگە مفهومەکەی (ئەنتۆنیۆ گرامشی) باسی کردبوو کە پێی دەوترێت رۆشنبیری عضوی (رۆشنبیری تێکەڵ) پێویستمانە بۆ کۆمەڵگاکەمان، چونکە تەنیا ئەو رۆشنبیرە دەتوانێت تفاعل بکات لەگەڵ خواست و گرفتەکانی جەماوەر، کەواتە ئێمە گرفتمان چیە؟ لە دوای رۆشنبیری نموونەیی دەگەڕێین، ئەو نموونەیەش بەرای من رۆشنبیری شۆڕشگێڕو تێکەڵە. هەڵبەت رۆشنبیران دەشکەونە بەردەم چەوسانەوە، و ئەو چەوساندنەوەیە لە کۆمەڵگای ئێمەدا هەیە و لەناو دەزگا رۆشنبیرییەکانیشدا ،لەوانیشدا زانکۆ، جالێرەدا پێویستەچارەسەریمان هەبێت ، ئەویش بە رۆشنبیری تێکەڵ دەکرێت.

* * *

حەمەکەریم هەورامی:

**لە نێوان بابان و سۆران سەرگەردانین**

ئەو بابەتانەی لەم کۆڕەدا هەموویان شایستەی لێکۆڵینەوەن، من چەند سەرنجێکی سەرپێیم هەیە هەرچەند خۆی لە کۆتایی گوتارەکان یا شتەکانی هەموو بەسەرکردنەوەو هەمووی هێنانەوە .یەکێ لەم سەرنجانە دەڵێ **(رۆشنبیری کورد لە بارودۆخێکی شلۆق دایە کە شانازیی پێوە ناکات)**. من دەڵێم کاک سەرۆ ئەی لە حکومەتی سۆران**(٧٣)** رۆژنامەو گۆڤار دەردەچن، لە حکومەتی بابانیش ببوورن ئەم تەعبیرە بەکاردەهێنم ،رەنگە ئەوەندە دەربچن و زۆرتریش، ئەگەر ئەمانە بەراورد بکرێن لەگەڵ وڵاتێکی عەرەبیدا کە سەدان ساڵە دەوڵەتە رەنگە هینی کوردەکە زۆرتر بێت ، کە وابێ ئێستا بۆ لە بارودۆخێکی شلۆق داین؟ دووەم گوتی **(رۆشنبیری کورد لەگەڵ واقیعیژیاندا تەعامول ناکات )** کاک سەرۆ ئەرکی رۆشنبیر بەرهەم دانە ،بەرهەمی فیکری دەوڵەمەندکردنی کتێبخانەی کوردیە، بەرزکردنەوەی فیکری کوردیە، نەک کەوتنە شوێنی ئەم و ئەو .هەروەها گۆشەگیری، من پێم وایە

رۆشنبیری راستەقینە، ئەدیبی راستەقینە ئەوەیە گۆشەگیر بێت ،لە گۆڕەپانی خۆیدا خۆی و کتێبەکەی بگەڕێ بە شوێن راستی و ئەو فاکتەرانە کە دەیەوێ چارەسەریان بکات، ئەو هەموو کتێبانەی دنیا بە گۆشەگیری بەرهەم هاتووە نەک بەگەڕان بە شوێن ئەم و ئەو یان هاتنە دەرەوەو لە کۆڕان ئامادەبوون ، من پێم وایە گۆشەگیری بەرهەم باشتر دەداتە دەست تا ناگۆشەگیری، نمونەش زۆرە بۆ ئێمە لەناو خۆماندا. با نمونەیەک بێنمەوە، مامۆستا عەزیز گەردی لە هەمووومان بەرهەمی زۆرترێکە لە هەموومان بەرهەمەکانیشی بە پێزو بەقوەت و توانان، پیاوی گۆشەگیرە، برۆ شەوو رۆژ خەریکی کتێبەکان و خەریکی نووسینە بە شوێن حەقیقەتدا دەگەڕێت.گوتی پێویستە لەسەر رۆشنبیری کورد کە شتێک بەرهەم بێنێ کە تایبەت بێت بەگەلی کوردەوە، ئەمە شتێکی راستە، بەڵام گلەیی لێکردن گلەییەکە ئەوە بوو کە رێی راست باش نەزەر پێناکەن، کاک سەرۆ تۆ بۆ ئێمە بسەلمێنەو بە ئێمە بلێ ئێمە کوردین لە کوێوە هاتوین کە هاتوین لە کوێ راوەستاوین ئەو تەپ و تۆزەی کە سەدان ساڵە بەسەر ئێمە دەکرێت ئەوەمان لەسەر لابەن لە موقعێکی راست و دروستدا دامان بنێن ئەو وەختە ئێمەش هەوڵ دەدەین کە فەرهەنگی رۆشنبیری کوردی خۆمان بە پێزو بە بەرەکەت بکەین، چونکە هەر گەلێک رۆشنبیری تایبەتی خۆی هەیە بە رۆشنبیریەکەیەوە دەناسرێت لەناو گەلاندا. خۆ ئەمە دەکەوێتە سەر ئەستۆی دەسەلات، ناکەوێتە سەر ئەستۆی رۆشنبیران، پێش هەموو شتێ دەکەوێتە سەر پەروەردە لە هەر وڵاتێکدا، لە وڵاتی ئێمەدا حاڵی حازر ئەوانەی کە سەرە گوریسی گەورەی پەروەردەیان بەدەستەوەیە ناتوانن جیاوازی لە نێوان قانەقەوچەو حەردو حەلاڵیان بکەن.

گوتی زمانی یەکگرتووی ئەدەبی کوردی یان زمانی یەکگرتوومان نیە، شێوە زارمان زۆرە، شێوەزار لە هەموو دنیا هەیە کاکە، بەڵام زمانی یەکگرتووی ئەدەبی کوردی وا دروست دەبێت، من پێم جوان نەبوو ئەم قسەیە لە تەلەڤزیۆندا بکرێت لەناو خۆماندا دەیکەن قەیدیناکە،بەڵام ئێستا سەدان خەڵک هەیە کە پێیان دەڵێی کاکە وەرە بە کوردی بنووسە دەڵێ ئەوەتانێ گوتیان ئێمە زمانی ئەدەبی یەکگرتووی کوردیمان نیە تۆ تەکلیفی چی لەمن دەکەی من بە کوردی بنوسم، ئاوامان پێ دەڵێن .رەنگبێ ئەو حەقیقەتە راست بێت، بەڵام گوتنی بۆ جەماوەری خەڵکی ئێمە کە تازە لە شوێنێکەوە هەڵوەشاونەتەوە دەیانەوێ برۆن بۆ شوێنێکی دی، جوان نیە. ئێمە توانای یەکتری قەبوڵ کردنمان نیە پشوومان تەنگە وای فەرموو، راستە، بەڵام ئێمە ئەوەی هەین هەست دەکەین لە کەلەپوورمان لە چیرۆکەکانی بەر ئاگردانمانەوە، هەتا ئێستا هەر راودوو دەنرێین هەر برۆکردنە هەر تەعریب و تەتریک کردنە هەر هەموو ئەو شتانەیە، ئیدی لەکوێ هێوری و لەکوێ دەمار نەرمی لەمن دەست دەخەی؟ من ئەوەی هەستم کراوەتەوە هەر راونراوم، ئەوەیش داپیرەم چیرۆکی بۆ خوێندومەتەوە هەر باسی راونان بووە.

* * *

عەبدولخالق سەرسام:

## بچنە سەر چیا!

تا ئێستا ئێمە لەنێو قاوغی ئەدەب و شیعر دەرنەچووین ئێستا پێویستمان بەوە هەیە ئێمە باسی فیکر

بکەین، باسی ئەوە بکەین کە ئێمەش وەکو میللەتێک بیردەکەینەوە کەواتە هەین .پێشەکی لێرەدا من نمونەیەکی زۆر ساکار هەیە حەزم لێیە بیزانن وەکو لەکاتی خۆی خوێندومەوە بەس مانایەکی زۆر دەدا ،دەڵێ ؛گوندێک هەبوو لە دۆڵێکدا وایاندەزانی بەس ئەو گوندە هەیەو ئەو دۆڵەش هەیە لە دنیایێ .هیچیتریشیان نەدەزانی ئەگەر یەکێ ویستبای بچێتە سەرچیاکە قودسیەتی مەوزوعەکەی تێک دەداو لە سێدارەیان دەدا ، رۆژێکیان گەنجێکیان بەسەر چیاکە کەوت و دیتی چیای دی هەیە هاتەوە گوتی کاکە جیهانی دی هەیە، ئەمیان کوشت، پاش دەها ساڵ گرانی هات خەڵکەکە گوتیان کاکە یەکێکمان هەبوو گوتی خەڵک و جیهانی دی هەیەئێمە نیوەمان لەبرسان مردین با بچین بزانین جیهانی دی لەپشتەوە هەیە، قەشەکان لە بەرامبەریان راوەستان و گوتیان ئەوە کوفرە. ئێمە بیر لەوەش بکەینەوە بەهەر حاڵ نیوەیان بەسەر چیاکە کەوتن دیتیان جیهانی دی هەیە چونە ئەو دیوە ،نانیان خوارد ژیان و ژیانەوەیان گرتەوە شوێنی ئاستی خۆی، جا ئەوەی لێرەدا دێت قودسیەتی بیرورا لەلای ئێمە بەردەوامە. لە قودسیەتی ئایینەوە دێت، قودسیەتەکە بە ویراسەت حزبەکان وەریانگرت رەش و سپی هیچ رەنگێکی دیکە نیە، کەچی دوانزدە رەنگ هەیەو بەسەدان رەنگیش هەیە یەک رەنگە ،تۆ دەتوانی هارمۆنیەتی لەناو دروست بکەی ئەوە لەلای کورد هەتا ئێستا کاکڵە نەبووە ،مافی مرۆڤ چرکەیەکە، بۆ ئێوارە تۆ سپی بی بۆ سبەی شەو رەش بی .ئەوە لەلای مە بڤەیە، چونکە بە کاسەلێسی و مسائیلی وا لە قەڵەم دەدرێ، بەڵام نازانن ژیان هەمووی لە گۆرانکاری دایە، کەواتە حزبەکان فکر بەرێوەدەبەن، چونکە لەگەڵ ئەو رۆژنامەیە ئەگەر نەگونجا ئەو ماددەیە قەدەغەیە ئەگەر بکاتن حزبێک لە حزبەکان بۆی هەیە شەرێک دروست بێ لەبەینی وی ویەکتردا . کەواتە ئەو بڤەیەش دروست بێ کەواتە هەر رۆشنبیرێکیش ناتوانرێت کۆمەڵێک جمایەی بۆ دابنێین، ئێمە گەیشتینە ئاسانێک کە لێرەدا بڵێم هەتا قودسیەتی بیرورا بەجۆرێکی وا توندوتیژ بێت ئێمە ناگەین بەهیچ.

*　　*　　*

د.شكريه رەسول:

## ئافرەتتان لەبیر نیە

بەداخەوە، ئەوانەی تا ئێستا قسەیان کرد هیچ ئاوڕێکیان لەئافرەت نەدایەوە،کەچی مەسەلەیەکی گەورەی جیهانە.جارێکی دیکە جێگای داخە لە کوردستانی ئەمڕۆدا لە ناو هەموو حزبەکاندا ، تەنگژە، تەنگژەی ئافرەتە.تەنانەت ئەوە لەناو پەرلەمانیشدا رەنگی داوەتەوە،لەوێدا لەدوای چەند پیــاوەوە ئافــرەتێک هەیە؟جــالەبەر ئەوە، ئاوڕدانەوە لە ئافرەت، ئاوڕدانەوەیە لە رۆشنبیریی کۆمەڵ.گرنگیدان بە ئافرەت لە هەر کۆمەڵگایەکدا، لە بەرژەوەندی کۆمەڵەکەشدایە چونکە چاکتر چاو دەکەنەوە. کەچی ئەمڕۆ لە کوردستاندا بەشێوەیەکی ناشارستانی مامەڵە لەگەڵ ئافرەتدا دەکرێ، لوتی دەبڕدرێ،ئەتک دەکرێ ،کەچی نە کەس قسە دەکات و نە شوێنێکیش هەیە شکایەتی مافی مرۆڤی لێ بکرێ.

سەیری زیندانەکان بکەن،بزانن ئافرەتان چەند کێشەیان هەیە.لە ناو بازاڕدا سوکایەتی بە ئافرەت دەکەن لەسەر جل لەبەرکردن.کێ لەوە بەرپرسە؟پێویستە بە جدی ئاوڕێک لە واقیعی رۆشنبیری وڵاتەکەمان بدرێتەوە.

*　　*　　*

د. رەشاد میران:

## رۆشنبیر مرۆڤێکی گەورەیە

من لە مانای دووره پەرێزیەوە دەست پێدەکەم، رۆشنبیر با لە حزبێکی سیاسیشدا نەبێت،بەڵام بیر لە کۆمەڵگا دەکاتەوە.ئەوە خۆی لە خۆیدا ئیلتزامێکە،دەور بینینە لە چالاکی کۆمەڵایەتی.بە مارکسیشیان دەگووت؛ تۆدووره پەرێزی چونکە نایەیتە ناو خەڵک، لەوەڵامدا گوتی من لە هەمووتان چالاکترم چونکە بیر لە کۆمەڵ دەکەمەوە. ئەگەر مەبەست سیاسەت کردن بێت، لەوانەیە رۆشنبیر تواناو وەختی ئەوەی هەبێ کە چالاکی کۆمەڵایەتی هەیە بیکات.چونکە ئەو نوخبەیە، کاری ئیمزا کۆکردنەوە نیە.ئەو نایە خۆنیشاندان و دروشم بکێشێ.

ئیتهامی هەندێکی کردبوو کە خۆ بەزل دەزانن و دورەپەرێزن ،نەخێر خۆ بە گەورە دەزانن نەک زل. بەڵێ رۆشنبیر گەورەیەو پێویستە گەورەبێ، بەڵام نەکسەرکردەیەک بێت بەڵکو مواقفی خۆی هەبێت یا ئەسبابەکانی وەجیە بن، پێویستە متمانە بە رۆشنبیری بدرێ لێی دڵنیابن کە ئەوەی دەیکا راستە تاقی نەکرێتەوە وەشتی جەماوەری پێنەکرێ ،هی رۆژانە کە داوا لە جەماوەر دەکرێ، ببوورن زۆر روح زلانە قسە ناکەم، بەڵام بەراستی رۆشنبیر هەقە گەورەبێ.

*　　*　　*

د. فەرهاد پیربال:

## فەرهەنگ دژی بە جیهانی بوونە!

بە راستی پێویستە لە جیاتی ئەو هەموو کۆڕە جۆراوجۆرانە نەک جار بەجار ،بەشی هەرەزۆری کۆڕەکان لەسەر ئەو جۆرەگرفتە قوڵ و گرنگانە بێ کە پێویستە. باسی زمان و فەرهەنگی کوردی کرا کە ئەو گرنگی دانە زۆرە ،ئەوە تێگەیاندین کە دژ دێتەوە لەگەڵ مەسەلەی بەجیهانی بوون. بەجیهانی بوون پرسیارێکی سیاسیە پێش هەموو شتێک پەیوەندی بە مەسەلەی کەلەپوور و زمان و فەرهەنگ ئەو شتانەوە نیە . بەتایبەتی ئێمە میللەتێکین کە تاکوئێستا بنیادی کەلتورو ناسنامەی نەتەوەیی خۆمانمان بنیادنەناوە، واتا من زۆرم پێ سەیرە ئەو گرنگیە زۆرە بەمەسەلەی بەجیهانی بوون دەدرێ لەم چەند ماوەی ئەخیری لەلایەن رۆژنامەکان و نوسەرانەوە. ئاخر من قۆڕیتانم نەدیوە چۆن باسی عەولەمە بکەم: کفریم نەدیتووە، شانەدەر کێ دیتوویەتی؟ ئاکرێ بۆ لە خەمی ئاکرێ نابێن یانەیەکی لێبێ! ئەو رۆشنبیرە گەورەیە لە ئاکرێ جێیەکیان نیە کۆببنەوە، پێم وابێ تەقلیدێکی زۆر موباشری ئەو صحافەو مەحافانەیەکە خصوصی دێ لە بۆ دەزگاکانی راگەیاندن. لە بارەی مەسەلەی دەسەلات و رۆشنبیر، کاک سەرۆ باسی ئەورووپای کرد، من پێم وایە دەبوایە ئاگاشی لەوە بێ کە تێگەیشتنی ئەورووپای رۆژئاوا بۆ مەسەلەی پەیوەندی نێوان دەسەلات و رۆشنبیر جیاوازە لەگەڵ ئەو پەیوەندیەی کە لێرەدا لە کوردستان هەیە . ئێمە ناتوانین ئەورووپا بکەینە نموونە و لە حاڵەتێک خۆمان واقیعیەتێکی دیکەمان هەبێ. واتە وەکو ئەوەیە تۆ دەست و پەلت بەسترابێتەوە بتەوێ جوولەیەکی ئازادی بکەی، واتا ئەم حسابە دەبێ لە یەکتر جیاواز بێ، ئەورووپا هێلانە بۆ رۆشنبیر خۆش دەکا تا هێلکەی جوان بکا، لێرە دەسەلات بەپێچەوانەی ئەورووپایە، لێرە دەسەلات جیقنەی دەکا، رۆشنبیر دەبێ بچی پاکی بکاتەوە. حساباتەکان جیاوازن لەگەڵ یەکتری، کەواتا ناتوانی ئەو داوایە لەورۆشنبیرانی ئێرە بکەی. کاک سەرۆ ئیشارەتی بەوەدا کە زەمینە لەبارە! من پرسیار دەکەم چۆن لەبارە کاک سەرۆ، لە کوێ لەبارە؟ کەی لەبارە؟ پرسیار لە محەمەد عارف دەکەم بزانم گەلەرییەکانی فەرەنسا کێ دایمەزراند؟ ڤان کوخ دایمەزراند؟ پرسیار لە د. مەعروف خەزنەدارو، د. دلێر شاوەیس ود. رەشاد میران دەکەم، مەکتەبەی نیشتمانی پاشایەتی لە پترسبۆرگ داستایۆفسکی داینا؟ لە ئیتالیا گرامشی داینا؟ هەموو ئەو دەزگا گەورانە رۆشنبیر دروستی ناکا، من گوناهم چیە ئەو هەمووبارە قورسەم دەکەوێتە سەرشان؟دەبێ دەسەلات زەمینە خۆش بکا ئینجا من بێم کاری تێدا بکەم.

* * *

بارزان مەلا خالد:

## بگەڕێنەوە ئەلف و بێ

تێبینیم لەسەر قسەکانی کاک سەرۆ نیە ،تێبینیم بە گشتی لەسەر قسەکانی هەموومانە، خەریکە ئێمە لێرە دوو سەنگەر دروست دەکەین، سەنگەری رۆشنبیری و سەنگەری دەسەڵات، خۆتان دەزانن لە هەموو دنیادا خۆ هەر رۆشنبیرانن دەسەڵات دەگرنە دەست. من ئەوەی تێبینیم هەبوو لەسەر مەسەلەی ترس و دەسەڵات بوو کە برای بەڕێزم رەئوف حەسەن خستیە روو ،ئەویش وای نیشاندا کە سیاسیەکان هەمووی ترسنۆکن ،بەشێوەیەکی رەهاش قسەی کرد. پێم وایە ئەلف و بێی دیموکراتیەتیش ئەوەیە کە هەقی خەڵکی دیکە زەوت نەکەی. سیاسیەکان ترسنۆک نین، سیاسیەکان بەدرێژایی سەد ساڵ لە مێژووی هاوچەرخی گەلی کورد پێشەنگی خەبات بوونە، پێ بەپێ هاتوون و ئەگەر کەم و کورتیەکیش بووبێ دەتوانین پتر ئۆباڵەکەی بخەینە سەر رۆشنبیران، چونکە ئەگەر ئاوڕێک لە مێژووی خۆمان بدەینەوە دەبینین ئەو شۆڕشانەی بەرپا بوونە ،لە کوردستانی عێراق باس دەکەم ،رۆشنبیران وەک پێویست رۆڵی خۆیان نەبینیووە. بەپێ هاتونەتە ناو شۆڕش ماوە ماوە ئیدارەیان کردووە، ماونەتەوە پاش ماوەیەک یان تەسلیم بە دوژمن بوونەوە یان لێیان داوەو هەڵاتوون و چوونەتە دەرەوە. ئەگەر رۆشنبیران گیانی مقاومەتیان بوویا و ململانێیەکی دڵسۆزانەیان لەگەڵ سیاسیەکان بکردبایە، رەنگە ئێستا سەرکردەی زۆربەی هەرە زۆری حزبە سیاسیەکان ئەو رۆشنبیرانە بن کە ئێمە لێرە باسیان لێوە دەکەین. مەسەلەی ئەوەش کە کاک رەئوف گوتی :حزبەکان یاسا دادەنێن، نەخێر برای بەڕێز پەرلەمانی کوردستان یاسا دادەنێ، هەموو دنیاش بەبێ یاسا ناتوانێ ژیان بەڕێوەبەرێ، یاسایەکانی پەرلەمانی کوردستانیش کە دایناوە سودی لە یاساکانی عێراق و میسرو دەوڵەتانی دراوسێ وەرگرتووە، پێشم وایە پڕ بە پیستی قۆناغی ئێستان، و ئەو پەرلەمانەش پەرلەمانێکی شەرعیە و یاساکانیش هەمووی لە جێی خۆیانن. کە باسی ئاین دەکا دیسان مەسەلەی ئاین و ژن و پشتگیری ئێمە وەکو حزب هەموو لایەکمان دەزانین حزبێکی عەلمانین، بەڵام هەموو وڵاتێکیش سەرەتا کە شتێک دەبێ دەڵێ ئایینی دەوڵەت فلانەیە، ئێستاش کلینتۆن و ئەو گەورە پیاوانەی دنیا رێوشوێنی ئایینی خۆیان بەڕێوە دەبەن. ئێمە خۆمان هەر یەکێک لە خۆمان لە ناخەوە جۆرێک دیکتاتۆریمان هەیە بەرامبەر بە ئافرەت وناهێڵین خوشکەکانمان بخوێنن، ناهێڵین بێنە دەرێ و وەک پیاوەکان ئازادی تەواویان هەبێ، ئیسلام هەقی چیە ؟

برای گەورەم مامۆستا کەریم هەورامی باسی شتێکی کرد، باسی نیشانەی بە مامۆستای خۆشەویست عەزیز گەردی دا دەڵێ گۆشەگیرە، من پێموایە ئەمەش هەڵەیە،عەزیزی گەردی گۆشەگیر نیەو گۆشەگیر ئەو مرۆڤەیە بەرهەمی نەبێ، بە پێچەوانەوە مامۆستا عەزیز گەردی لەگەڵ هەموومان دەژی وقەتیش گۆشەگیر نیە، ئەمە یەک، دوو باسی حکومەتی بابان و سۆرانی کرد، بەداخەوە ئەمەشی دواکەوتوویە لە رۆشنبیری کوردی، قەت دوو حکومەت نیە لە کوردستان پێ بڵێین

بابان و سۆران و من پێم وایە ئەمە هەڵەیەکی مێژوییە مەسەلەکە دەوروژێندرێ پاشان حکومەتی کوردستان لێرە چۆنە و چۆن هەڵبژێردرا هەموو لایەکمان دەزانین بەزۆربەی زۆری دەنگی پەرلەمانی کوردستان هەڵبژێردرا. شەرعیەتی وەرگرت، ئێمە هەمان تەجرەبەمان هەبوو کە چوینە شەقلاوە ئێمەیان لێرە دەرکرد قەت حکومەتمان دانەنا، بەڵکو شتێکمان لەوێ دروست کرد بەناوی کوتلەی وەزاری ئەوە مێژوو شاهیدە، پێموایە هەڵەیەکی مێژووییەو هەق وانیە ئەو زاراوانە دابنێین.

* * *

محەمەد عارف:

**هونەرتان لە بیر نەچێ**

حەزدەکەم لە روانگەی هونەریەوە قسەبکەم، کە دەڵێی رۆشنبیر یاخود رۆشنبیریی بێگومان لایەنێکی هەرە گرنگ هونەرە .هونەری نیگار کێشان و پەیکەر تاشی و گرافیک و سیرامیک لەبەر ئەوە حەز دەکەم کە ئەو لایەنانە هەموو بەیەکەوە بەپێوەندی زۆر پتەوەوە بەیەکەوە بەستراونەتەوە حەز دەکەم لەدوا رۆژیشدا کە تیشکێک بخرێتە سەر ئەم لایەنانە. بێگومان دیاردەیەکی جیهانیە کە پاش هەر شۆرشێک سستیەک بەریا دەبێت لەجولانەوەی هونەری و رۆشنبیریدا، بۆ نمونە پاش شۆرشی ئۆکتۆبەر ئەو بەرهەمە گرینگانەی نەمرانەی وەکو داستایۆفسکی و پۆشکین و لێرمنتۆف و هەروەها لە مۆسیقا وەکو چایکۆڤسکی و کۆسۆکۆڤ و گلینکا لە شاعیرەکان وەکو گوتم پۆشکین و ئەوانە بەڵام بەدائیلی هەبوو. بۆنمونە راستە دوایی پاش ئەوەی کە هەزم کراوە ئەو شتانەی لە باوەش گیرا بۆ نمونە (یەفتینشینکۆ) پەیدابوو (مەزنیتێسکی) و (شۆلۆف هۆبلا) لە رۆمان و لە چیرۆک لە مۆسیقا (شۆستۆکۆڤیچ) هەروەها (خاکیۆ تۆریان)، بەڵام ئەو شتەی کە جێی مەترسیە ئەوەیە کە ئەو شتانە لە دڵ و دەروونەوە بە پشتگیری هەموو رۆشنبیرو هونەرمەندان و تیۆریستەکان کە قۆناغەکە زۆر بکێشی. هەروەها ئەوەشم پێخۆشە کە پتر لە هەڵبژاردەی کۆمەڵگای کوردی کە پتر داوەت بکرێن و کۆرەکە فراوانتر بن .

**رەفیق نوری**: بە کورتی دەڵێم بەراستی زۆربەی بیرورایانەی کە خرانەروو پەیوەندیەکی راستەوخۆی بە کۆرەکەی کاک سەرۆوە نەبوو. من تێبینی ئەوەم کردووەکە لە کۆرەکانی رۆشنبیران لە هەولێر ئەو کەسەی قسە دەکات بیر ناکاتەوە بابەتی کۆرەکە چییە، و چ بەداواداچوونێکی هەیە.

* * *

د. مارف خەزنەدار:

## دەبێ دەسەڵات بەدوای رۆشنبیردا بگەڕێ

(رۆشنبیری) مان هەیە یان (رۆشنبیریی دەسەڵات)؟ بابەتی سەرەکی ئەوە بوو، وابزانم پێناسەی رۆشنبیریی بۆ ئەو نوخبەیەیە پێویست ناکات، ئەو نوخبە هەموو رۆشنبیرو هونەرمەندی داهێنەرو گەورەن، کاک سەرۆ ویستی بگاتە ئەنجامێکی سەرەکی، کۆمەڵە خاڵێکی دەست نیشان کرد، مەوزوعی سەرەکی ئافرەتەو فنونی تەشکیلی نیە، بەڵکو مەوزوعی سەرەکی داهێنانی عەقلی رۆشنبیرە،

گەلێ شت وروژێندرا، من لەدوا قسەی دەست پێدەکەم کە پەیوەندی لەنێوان دەسەڵات و رۆشنبیرهەبێ، ئەم پەیوەندیە بۆ ئەو چەند ساڵەی دوایی تاکید دەکەم دەبوو چۆن بێت، پێش ئەوە رۆشنبیر رەنگە دوو ئەرکی هەبێت، بەشێکیان داهێنەرانەیە، ئەوەی شیعر دەنوسێت رۆمان دەنووسێت چیرۆک دەنووسێت، یان لە مۆسیقا هارمۆنی دادەنێ، ئەمەیان بەرادان نیە ،هیچ دەسەڵاتێک نیە ئەمری پێ بکات، پێی بلێ وابکە وا مەکە . شتێکی زاتیە پێش ئەوەی بیر بکاتەوە بۆ خەڵکی دیکەی دەکا، بۆ خۆی دەکا، هی وا هەیە چوار پێنج جار شیعرەکە دەخوێنێتەوە،هەر بۆخۆی ئینجا دوای دەبێتە شتێکی گشتی دەدرێتە شەخسی دووەم .ئەوەیان پێم وایە ئێمە ناتوانین قسەی لەسەر بکەین، و ئەگەر ئەو کوردەی کە ئەو داهێنانەی کردووە ،من پێم وایە لە ئاستێک (کالا بەقەد بالایە) قەت بەدوا نەکەوتووە. شیعری جوان هەیە رۆمانی باشیش نووسراوەتەوە و کەمە لەبەرئەوەی ناتوانێ و پارەی نیە چاپی بکات. بەلام نوقتەی ئەساسیەکە ئەوەی ئێمە مقوماتی ثقافی بوونی قەومیمان تا ئێستا نیە، بەمەعنای کەلیمە، زۆر مێژوویان نووسیوەتەوە، بەلام مێژووی ئەکادیمی میللەتی کورد لەسەرەتاوە تا ئەمرۆ نیمانە، مێژووی ئەدەبی کوردیمان نیە، فەرهەنگی کوردی مەبەستم قاموسە نیمانە، ئینسیکلۆپیدیای کوردیمان نیە. ئەمانە هەمووی مقوماتی دەوڵەتە. نموونە زۆرە دەتوانم بیهێنمەوە ،لەو میللەتانەی کە لەسەرەتای سەدەی بیستەمەوە خەریکبوون پێش ئەوەبن بە نەتەوە پێش ئەوەی ببن بە میللەت ئەم کەرەستانەیان ئامادە دەکرد. ئینجا نزیکبوونەوەکە چۆنە، رۆشنبیر ناچێتە لای دەسەلات، دەسەلات دەبێ بچێتە لای رۆشنبیر، ئێستاش دوور نیە. لە ساڵی ١٩٦٠ خراوەتە روو لە بەرلین لە لەندەن لە مۆسکۆ لە پاریس هەمووی ،زۆریش نەبوون ئەو وەختە، گوتومانەو گوتومانەتەوە .تا ئێستاش وەکو کۆڕی زانیاریش دانرا لە ١٩٧٠ ئەویش نەیکرد ـــ مەبەستم ئەوەی بەغدایە ـــ. جا دوا قسەم ئەوەیە دەسەلات بۆ ئەم شتە ئەساسیانە دەبێ بچێتە لای خەڵک دەبێ بچێتە لای رۆشنبیر.

* * *

**سەرۆ قادر:** بەختەوەرم بەوەی هەموو لایەک بەوپەڕی سنگفراوانیەوە گفتوگۆکانتان قبوڵ کرد. ئێستاش بۆ پتر روونکردنەوە هەوڵ دەدەم هەندێک لەو دیدو بۆچوونانەم کە لەلایەن ئێوە گفتوگۆی لەسەر کرا دوویات بکەمەوە. بەر لە هەموو شتێک پێم خۆشبوو لەم سیمینارەدا هیچ مەسەلەیەکی سیاسی نەکرێتەوە، بەڵکو تەنیا باس لە رۆشنبیریی و رۆڵی رۆشنبیران لە قۆناغی گۆڕانکاری و پەیامی رۆشنبیران لە بەرامبەر کۆمەڵگاو دەسەڵاتی نیشتماندا بکەین،چونکە ئێمە ئامانجمان باسکردنی لایەنی سیاسی نیە من کۆمەڵێک بیرورام هێنا کەهەمووومان بەگشت جیاوازی و دیدو بۆچوونمان دەهەنبەر مەسەلەکاندا. جا بە حوکمی ئەوەی من رۆشنبیرێکم لە رۆشنبیرانی ناو دەسەڵات ،رەنگە ئەو موناعاتانەم نەبێ کە رۆشنبیرانی دیکە هەیانە.

لێرەدا باسم لەو هێڵە گشتیانە کرد کە لە دەرەوەی توانای تاکە کەسن. ویستم بەپێی ئەقل پێداشکانی خۆم باسێک لە ئاستەنگەکانی ناو باری رۆشنبیریی کوردستان بکەم کە ماوەی ئەم (٨)ساڵەی دوای راپەڕین کە حکومەتێکی میللی هەیە ئەو حکومەتە لە ناوەرۆکدا دەوڵەتە. بمانەوێ و نەمانەوێ رۆشنبیرانی ئێمە ئەندازیاری بیناکردنی رۆشنبیریی ئەم وڵاتەن، گرنگ بووژاندنەوەی وڵاتەکە، بەرەو پێشەوە بردنی باری رۆشنبیرییە. دەستەبەرکردنی ئەم کارەی رۆشنبیرەکانن، ئەویش ئێوەن،جا لەوەدا چ حزبێک قازانج دەکات یان زەرەرمەند دەبێت ؟ ئەوە کێشەی میللەت نیە. حەزدەکەم ئەوەش روون بکەمەوەکاتێک لە دانیشتنێکدا گفتوگۆ دەکرێت بەمانای ئەوە نیە یەک بە یەکێ بسەلمێنێت .ئەم بیرو رِایانەی ئێوە هەموویان جوانن بە دژبەیەکیشیانەوە، هەر ئەوەش رەنگە جوانەکانی رۆشنبیریی کوردی دروست دەکات، بەڵام ئەوەی گرنگە باس بکرێ: **ئایا رۆشنبیرانی کورد کەوتونەتە لێکۆڵینەوەو وردبوونەوە لە ئەرکەکانی خۆیان یان نا.؟**

ئەوەی کاک رەئوف حەسەن باسی کرد، وەکو رای ئەو رێزم بۆی هەیە. ترس بەشێکە لە چۆنیەتی پێکهاتەی مرۆڤ لە کۆمەڵگای ئێمە. منیش باسی ترسی رۆشنبیرانم کرد ،هەروەها باسی هەڵویستی تاک و تەرای نابەرپرسیارانەی هەندێک لەو رۆشنبیرانەم کرد کە بەبێ لێوردبوونەوە بە ناو دەکەون.

رایەک هەیە پێمیوایە رۆشنبیر دەبێ دژی دەسەڵات بێت. من بەهەڵەی دەزانم . رۆشنبیر لەگەڵ دەسەڵات دابێت ،بەو مانایە نیەکە نێگەتیف بێت، یان رۆشنبیری حزبی بێت و ببێتە دەهۆڵ ژەن. ئەوە کاری پروپاگەندەی سیاسیەکانی هەر حزبێکە. رۆشنبیر فەرهەنگ و کەلتوری میللەتێک پشتیوانی لێ دەکات و لەوێشدا نەخشەکان دادەنرێن، ئەی کێ ئەم کارە دەکات ؟رۆشنبیرانی کوردستان هەر خۆیانن. من پێمـوایە ئەوەش جێگای گفتوگۆیە. وا دەزانم ئەگەر بڵێین پێش راپەڕین بارودۆخ باشتر بوو لە دوای راپەڕین ،شەرمە بەتایبەتی لە گەیاندنی پەیامی رۆشنبیران. ئێمە مافی خۆمانە تا ئەو شوێنەی دەمانەوێ دەسەڵاتی حوکمڕانی کوردستان رەخنەکوژ بکەین، بەڵام ئەوپەڕی بێ ئینسافیە دەست بۆ سەر دەستکەوتەکانی میللەتەکەمان درێژ بکەین کە ئەویش ئازادیە.کەی پەیامی رۆشنبیران بەر لەراپەڕین وەکودوای راپەڕینە؟ بەر لە راپەڕین چیرۆکنووسێک دەبوا چاوی خۆی کوێر بکات تا چیرۆکێک بنووسێ و لەوێدا باسی فەلەستین بکات تاکو خوێنەر تێبگات مەبەستی

کوردستانە. کەی ئەرکی ئەوکات و ئەمڕۆ وەکو یەک وایە؟ ئەمڕۆ ئەرکی رۆشنبیر ،بووژاندنەوەی رۆشنبیریی و کەلتوری کوردە، ئێستاش کە لێرە دانیشتووین لەنێو ئەو هەموو مامۆستاو رۆشنبیرە گەورانە، بەپێویستم نەزانی باس لە پێناسەی رۆشنبیر بکەم، چونکە ئێمە باس لە رۆشنبیرییەک دەکەین کە دارماوە ،چۆن بنیادی بنێینەوە؟ میللەتەکەمان خامۆشە، کپە، پاشکەوتووە، پارەشی پێ بدەی نازانێت چۆن بژیت، لە کاتێکدا بێ دەرامەتە، بێ ئەمنیەتە راستە، بەلام بەم بارووددۆخەی ئێستا دەرامەت و ئەمنیەتیش هەبێت نازانێ چۆن بژیت. ئەمە کارەساتێکی زۆر گەورەیە.

زۆر راستە،رۆشنبیرانی کوردستان سەرچاوەو کتێبیان بەدەست ناگات ، رەنگە ئەگەر بکەوینە لێتوێژینەوە لە ئاستەنگ و گرفتەکانی بەردەم رۆشنبیران، ئەوە یەکێک لە گرفتەکان بێت.

سەبارەت بە چەپ و راست، مەبەستم تێڕوانینی چەپ و راستی نێو باری رۆشنبیری بوو، ئەگینا بە درێژایی ژیان چەپ و راست هەردەمێنێ. ئەمە جێگای لێوردبوونەوەیەو گفتوگۆی دەوێ.

کاک رەئوف حەسەن دەڵێ ئەرکەکە بە شانی ئێمە<رۆشنبیران> دادەدەی. ئەگەر بۆ هەڵبژاردنی حزب پێیان گوتی ،ئەوە هیچ ئەرکێک قبوڵ مەکە، بەلام وەک رۆشنبیرێک لەنێو باری رۆشنبیریدا ئەرکەکانت چین؟ رۆشنبیر بە درێژایی ژیانی دەبێ رەخنەگربێت، بەلام دیارە ناکرێ لەم دانیشتنەدا باسی جیاوازی نێوان دژایەتیکردن و رەخنەگرتن بکەین.

«گابریل گارسیا مارکیز» لە ساڵی ١٩٨٥ داوەتی گۆرباچۆفی قبوڵ کرد . زۆرلە رۆشنبیرانی ناوداری دنیا دەنگیان هەڵبڕی وگوتیان نەدەبوا بچیت، بەلام کاتێک گوتەکەی گۆرباچۆف و قسەکانی مارکیزمان خوێندەوە،< **ئەوکاتە لە شاخ بووین**> تێگەیشتین کە قۆناغ قۆناغێکی نوێیە، قۆناغێکە دەسەلاتی سیاسی ناتوانێ ولات بەڕێوە بەرێت، ئەگەر دەسەلاتی رۆشنبیریی رێک نەخات وهاوکاری نەکات. ئەم رێکخستنەش لەلایەن رۆشنبیرانەوە بە مانایی مەرایی و کلکەسووتە بۆ هیچ حزبێک نیە، هەروەهاش بە حزبی بوونی رۆشنبیرێک بە مانای دەرچوون لە جوغزی رۆشنبیریی نیە. رۆشنبیریی زانیاریە کەسێک نیە توانای سەندنەوەی هەبێت.

باسکردن لە سەلبیاتی دەسەلات ،بابەتێکی دیکەیە کە کاک کەریم شەریف قەرەچەتانی ئامازەی پێکرد. من لێرەدا بۆم دەرکەوت رۆشنبیرانی کورد لەناو خۆشیان لە تێگەیشتنەکاندا ،یەکگرتوو نین ،جا ئەگەر ئەوە حاڵ و باری رۆشنبیران لە ولاتێکی پاشکەوتوودا بێت، ئەدی دەبێ بۆ وەرگرتنی دەسەلاتی سیاسی لەم ولاتەدا، سیاسیەکان چ دەستاوێژێک هەبێت دەستی بۆ نەبەن؟! ئەمەش لێتوێژینەوەی دەوێ، لێتوێژینەوەش هی ئەو کەسانەیە کە بیر دەکەنەوە.

باس لە گۆشەگیری رۆشنبیران کرا. هەرگیز گۆشەگیری رۆشنبیر بە مانای تێکەلاوی وەرنەگیرێ. باس لە دکتۆر عەزیز گەردی کرا ،ئەو باشترین نموونەی رۆشنبیری کاریگەرە. ئێمە کە باسمان لە گۆشەگیری کرد مەبەستمان ئەوەیە چەندە لە ئەرکی رۆشنبیریی خۆی دوورکەوتۆتەوە. لەم قسەیەشمدا بۆ ئەوەم نیە حزبەکەم کە سوود لە رۆشنبیران ببینێت. ئەواحزب و ئەو کەسایەتیە سیاسیەی بیەوێ فێڵ لە رۆشنبیران بکات گەورەترین سزای تووشی خۆی دەکات، یان ئەگەر بیەوێ رۆشنبیران بۆ هەنگاوێک رۆشنبیران بە سەهو بەرێت ئەوە بە دڵنیاییەوە سزاکەی

لەلای رۆشنبیران ئەوە دەبێت کە بە گەمژەی دەزانن. من هەرگیز ئومێدی ئەوە ناخوازم حزبەکەم هەوڵی لەمجۆرە بدات. مەبەست لە گۆشەگیربوون ئەوەیە رۆشنبیر خۆی بەدوور بگرێت خۆی بە بێگانەبزانێت لەو دەسەلاتەی رۆژانە وڵاتەکەی بەڕێوە دەبات. بۆیەش پاش چەند ساڵێک سیمای شارەکانمان ئەوتۆ دەگۆڕین کە نیشاندەری ئاستی رۆشنبیریی ئێمەیە، ئەویش شێوەیەکە هیچ کەسێک لە ئێمە حەزی لێ ناکات. لە کۆتایی سەدەی بیستەم خەریکە رەوتی پاشکەوتن بە سەر پێشکەوتندا زاڵ بێت.

مەبەستم لە زمانی یەکگرتوو، کێشەیەکە هەیەو لێکۆڵینەوەو قسەکردنی دەوێ، رێگەچارەی دەوێ کەوا چۆن ئەم دوو شێوەزارەلێک حاڵی بن و تێکەڵ بن. ئەگینا مەبەست ئەوە نیە دوو زاراوە دوو حکومەتمان لە یەک وڵاتدا بۆ دروست بکات .ئەم دابڕانە سیاسییە لە ئاکامەکانی شەڕی ناوخۆ دروست بووە، رەنگە لە داهاتوودا پێک بێنەوە. هەر ئەو کۆمەڵگا نێودەوڵەتیەی کە ئێرە دەپارێزێ، شوێنەکەی هێندە پێگرنگە، نەدەهێڵێ ببێتە ئەفغانستان، نەدەهێڵێ وەکو رواندای لێبێت، وە نەدەشهێڵێ بەبیری پاشکەوتووانە بەڕێوە بچین.من لێرەدا مەبەستم ئەوە بوو کەوا بڵێم فەرهەنگی ئێمە ئالۆزییەکی زۆری بەخۆیەوە گرتووەو جێگای قسەکردن و لێکحاڵی بوونە.من باسی ئەوەم نەکردووە کە بەرەی کوردستانی بەرەڵایی بوو ،بەڵکو گوتم دەسەلاتی بەرەی کوردستانی دەسەلاتێکی تێکەڵ و بەرەڵڵابوو.بەرەڵاش بە چەمکە تەسکەکەی نا، بەڵکو دەسەلات لە مقەری حزبەکان و کۆڵان و ماڵەکان بوو، لە هەمان کاتدا دەسەلاتی شۆڕشگێڕیش بوو، ئینجا چونکە دابەشکردنی دەسەلات هەبوو، ئەوا یەکی نەدەگرت، کەواتە سیستەمی دەسەلاتی بەرەی کوردستانی سەرکەوتوو نەبوو، هەروەک چۆن دەسەلاتی ففتی بە ففتی سەرکەوتو نەبوو.

من مەبەستم لە ئازادی ئەوە نەبووە کە چەند خەڵک دەتوانێ بە ئازادی، یان دەزگایەک بە ئازادی قسە بکات نەخێر، مقەسیش هەیەو سانسۆریش هەیە، کەواتە ترسەکە گشتییە، کەم بوێرییەکە گشتیە.

دەربارەی پەیوەندی رۆشنبیری و دەسەلات، من پێم وایە دەبێ هاریکاریەکی زۆر هەبێ، چونکە ئەو هاریکاریە گرنگە، لەکاتی خۆیدا رۆشنبیران هاوکاری دەزگاکانی رژیمی داگیرکاریان دەکرد، چۆن دەبێ ئێستا هاوکای لەگەڵ حکومەتێکی شۆڕشگێڕدا نەکەن و وا تێبگەن ئازادییان زەوت کراوە؟ نەخێر ئەم وڵاتە هی خۆمانە، دەبێ کارە رۆشنبیریەکانمان لەوێ بکرێ، ئەمەش پشووی درێژی دەوێ.

من لەگەڵ قسەکانی د. رەشاد میران دام کە دەڵێ ئەرکی رۆشنبیر لە جیهانی سێیەمدا جیاوازیەکی زۆری هەیە لەگەڵ ژیانی رۆژئاوادا . هەڵبەت لەیەک پەیامدا یەکدەگرنەوە، ئەو پەیامەش خۆشکردن و ئامادەکردنی رووحی میللەت بۆ ئەوەی کە تەحەدا بکات. میللەتێک کەرۆشنبیرەکانی خامۆش بن، بۆ خۆی هیچ ئیرادەیکی نامێنێ، ئەگەر ئازادیشی هەبێ لەدەستی دەدات، چونکە میللەتێکی چاوبەستراو ناتوانێ ئایندەیەکی گەش بۆ خۆی دروست بکات.

ئەم بابەتەی کە باسمان کرد هەموو کەموکوڕی ناو رۆشنبیریی ئێمەیە، جا رۆشنبیران بیانەوێ یان نەیانەوێ یەکەمین ریزی پێشەوەی ناو میللەتی ئێمەن کە پەنجەیان بۆ درێژ دەکرێ.

# گرفتی پەیوەندی لەنێوان ڕۆشنبیر و دەسەڵاتدا

د.شێرزاد نەجار[ مامۆستای زانکۆ]

هەڵبەت ڕۆشنبیر و فەرهەنگ پێناسەی جۆراوجۆری هەیە. فەرهەنگ بریتیە لە گردبوونەوەی داهێنان بەپێی بنیادنانی شارستانیەتە یەک بەدوای یەکەکان؛ واتا بەشداری لەبوارێکدا نیە، بەڵکو سەرجەم بوارەکانی ئەپستمۆلۆژیا دەگرێتەوە لە (سیاسەت، ئابووری، فەلسەفە، ئیدارە، ڕۆشنبیری، ئەدەب و هونەر)وهتد.ئینجا لە فەرهەنگدا دوو چەمک هەیە یەکیان تایبەتی و ئەوی دیکەیان گشتیە: هزروانان پێیانوایە دەبێ لەنێو فەرهەنگدا پسپۆڕیش هەبێ کە دەکاتە ڕۆشنبیریی تایبەتی، ڕۆشنبیریی گشتیش واتا سەرجەم بوارەکانی ژیان و پەیوەست بەژیان.

باشە ئەگەر ئەوە پێناسەیەکی فەرهەنگ بێت، ئەدی ڕۆشنبیر کێیە؟ هزروانی گەورەی ئەڵمانیا، **ماکس ڤیبەر (کۆمەڵناس)** دەڵێ: **ڕۆشنبیر ئەو کەسانەیە کە تواناو حەزی تایبەتیان هەیەو دەتوانن بەرهەمی ڕۆشنبیریی بەهادار پێشکەش مرۆڤ بکات.** هەروەها **«ڕۆبێرتۆ مێشێل»** هزروانی کۆمەڵناسی ئیتاڵی دەڵێ: **ڕۆشنبیران ئەو کەسانەن کە توانای ئەپستمۆلۆژیای بابەتیان هەیەو دەتوانن لەڕێگای ئەو ئەپستمۆلۆژیایەدا رامانیان هەبێت دەربارەی بارودۆخی کۆمەڵ و دیدو بۆچوونیان هەبێت سەبارەت بە گۆڕانکاری لەو کۆمەڵگایەدا**. هەمدیس **«پارنسس»** هزروانی مەزنی ئەمەریکایی دەڵێ: **ڕۆشنبیران ئەوانەن کە پسپۆڕیان لەبواری ڕۆشنبیریدا هەیە**. هەروەها هزروانی میسری **«سەعدەدین ئیبراهیم»** پێی وایە ڕۆشنبیر هزروانەو دەڵێ: **ئەو هزروانە زانیاری گشتی یا تایبەتی هەبێت و بایەخ بە ڕۆشنبیری و ئەو لایەنانەی دەرەوەی کاری پسپۆڕی خۆی بدات**. جا بەگوێرەی ئەو پێناسانە مرۆی ڕۆشنبیر ئەو کەسەیە کە خاوەن مەعریفەیە، مەعریفەیەکی ڕۆشنبیری هەیە هەر ئەو مەعریفەیەش وا دەکات ڕۆشنبیر بتوانێ ڕوانینێکی گشتی و فراوان و ڕەخنەگرانەی بۆ لایەنە نێگەتیڤەکانی کۆمەڵ و کۆمەڵگا هەبێت. **بەڵام بەپێی چەمکی گرامشی ڕۆشنبیر بەتەنیا ئەوە نیە خاوەنی ڕۆشنبیریی و ئەپستمۆلۆژیا بێت، بەڵکو پێویستە ڕۆشنبیر ڕۆشنبیرێکی ئۆرگانیکی و ڕەخنەگر بێت. کەواتە گرامشی مەرجی بۆ ڕۆشنبیر هەیە و دەیەوێ ڕۆشنبیر ئاوێتەی جەماوەر بێت. یانی موعاناتی جەماوەر لەسەر شانی ڕۆشنبیر بێت و ڕۆشنبیر لە هزرو بۆچوونی خۆیدا موعاناتی خەڵک**

دەربڕێت.

**کارڵ مانهایم**،زانای ئەڵمانی بەڕەگەز ئینگلیز ،لە کتێبە بەناوبانگەکەی **(ئایدۆلۆژیاو تۆپیاویەت)** دەڵێ: **ڕۆشنبیر ئەرکێکی تایبەتی هەیە؛ ئەویش تەفسیرێکی تایبەتی و نوێ بۆ دنیا بکات، واتا بۆ کۆمەڵگاو بزاڤی مێژوو.** لێرەدا دوای ئەم دەستنیشانکردنە پێویستیمان بە ناساندنی دەسەڵاتیشە.

دەسەڵات واتا دەسەڵاتی سیاسی. دەسەڵاتی سیاسیش مانای پەیوەندی نێوان هاووڵاتی و دەسەڵات دەگەیێنێ. کە گوتمان دەسەڵاتی سیاسی ،یانی هێز. لێرەدا گرفتەکە دەست پێدەکات. ڕۆشنبیر بۆچوونێکی دیکەی هەیەو دەسەڵاتی سیاسیش بۆچوونێکی دیکە. جا ئایا ئەم لایەنانە بۆچوونی یەکتری قبووڵ دەکەن؟

لێرەدا جیاوازی و دژە بۆچوون لەنێوان ڕۆشنبیر و دەسەڵات دروست دەبێت .لەهەمان کاتیشدا جۆرێک هاریکاری و پەیوەندی بە یەکەوە بوونیش هەیە. دەسەڵات هەمیشە کە سەیری خۆی دەکات وەکو سەرکردەیەک٦٣ لەخۆی دەڕوانێ، ناتوانێ وەک هاووڵاتیەکی ئاسایی سەیری خۆی بکات، خۆی بە بەرپرسی کۆمەڵ و دەسەڵات دەزانێت. لە هەمان کاتیشدا ڕۆشنبیر، بەتایبەتیش ڕۆشنبیری ئۆرگانیکی (بەپێی چەمکی گرامشیانە) ئەویش خۆی وەکو سەرکردەیەک سەیر دەکات ،بەتایبەتی لە گۆڕانکاری کۆمەڵدا، وا دەزانێ بەهای خۆی هەیە،وەک پیاوێکی سیاسی سەیری سەنگی خۆی دەکات و وەزنی خۆی هەیە. زۆر کەڕەتیش ڕۆشنبیران خۆیان لە سیاسەتمەداران لە پێشتر دەزانن. ئەی کەواتا چۆن ئەم گرفتە چارەسەر دەکرێ و ڕاستی گرفتەکە لە کوێدایە؟

ئایا ئەم پەیوەندیەی نێوان ڕۆشنبیر و دەسەڵاتی سیاسی هەمیشە تەعبیر لە بۆ چوونی جیا دەکات، یاخود جار بە جاریش تەعبیر لە گونجان دەکات؟ ڕۆڵی ڕاستەقینەی ڕۆشنبیر لەم گرفتەدا چیە؟ لەو بوارەدا ڕۆشنبیر دەتوانێ چی بکات؟ جا ململانێیەکە لەنێوان هەردوو لایەنی هاوکێشەکە بەردەوامە، ناتوانین بڵێین ململانێ نیە. زۆر کەڕەت ململانێیەکە دێتە بەر چاوان و دەبینرێت. ئەو ململانێیە لە سەردەمی نازیەکان و فاشیستەکاندا ڕوون و ئاشکرابوو. هەندێ جاریش ململانێیەکە شێوەیەکی شاراوە بەخۆوە دەگرێت و دیار نیە، بەڵام ململانێیەکە لە ناخی سیاسەتمەداران و ڕۆشنبیراندا هەیە. ئێستا کێشەی ئێمە بریتیە لە تێگەیشتنێکی دروست دەهەنبەر ئەو گرفتەدا.

لێرەدا دوو نۆڕین سەبارەت بە تێگەیشتن بۆ ئەم گرفتە هەیە: بۆچوونێک هەیە دەڵێ پێویستە ڕۆشنبیران لە ئیدارەی کۆمەڵگادا بەشداربن، واتا بەشداری سیاسەت بکەن بۆ بە عەقلانیکردنی بڕیارەکانی دامودەزگاکانی حکومەت.واتا بە بەشداربوونی ڕۆشنبیر لە دامودەزگای سیاسی بڕیارەکانیان بەرەو عەقلانیەت دەڕوات و بۆشایی نێوان ڕۆشنبیر و دەسەڵات کەمتر دەبێتەوە. کەواتە ئەم بۆچوونە هەوڵێکی ئیجابیانەیە بۆ چارەسەرکردنی گرفتی نێوان ڕۆشنبیر و دەسەڵات. بەڵام بۆچوونەکەی دیکە پێیوایە؛ شوێنی ڕاستەقینەی ڕۆشنبیر لە لایەن زۆرینەی خەڵکە، واتا لەگەڵ ڕای گشتی هاولاتیان بێت و بەرامبەر دەسەڵات بێت. یاخود زیاتر لەسەر ئەوە پێ دادەگرن ئەگەر دەسەڵات داخوازی و داواکانی هاولاتیانی جێبەجێکرد ،ئەوکاتە ئاساییە ڕۆشنبیر لەگەڵ دەسەڵاتدا بێت.

**بەڵام گرفتێکی دیکەمان هەیە ئەویش ئەوەیە، کە ئایا رۆشنبیران بەرەیەکی یەکگرتووی رێکوپێکن؟** چەندە لاگیری لە بۆچوونی یەکەم دەکەن و چەندیش لە بۆچوونی دووەم؟ ئەوەیش یەکێک لە کێشەکانی نێوان رۆشنبیرانە کە ناتوانن هاو هەڵوێست بن، چونکە رۆشنبیران کۆمەڵێک کەسی کۆمەڵایەتی ،بەیەکەوە گونجاو و لێک نزیک نین. هەر رۆشنبیرە و بنەمای کۆمەڵایەتی تایبەت بە خۆی هەیە و ئەمەش کار دەکاتە سەر بیرباوەڕی. کەواتا لە بەرامبەر دەسەڵاتی سیاسیدا ناتوانن هەڵوێستێکی یەکگرتوویان هەبێت لە نێوان ئەم دوو بۆچوونەی باسمان کرد ،سرەنگە بۆچوونی دیکەش هەبن.

هەڵبەت هەردەم کۆمەڵێک لە رۆشنبیران پەیوەندی و هاریکاریان لەگەڵ دەسەڵاتدا هەیە، پێشیان وایە ئەگەر ئەم پەیوەندییەیان لەگەڵ دەسەڵاتدا نەبێت ئەوە ناتوانن هیچ چالاکیەکی کۆمەڵایەتی ئەنجام بدەن، ئەمانەش پتر توێژە تەکنۆکراتەکەن کە پسپۆریان لە زانستێکی دەستنیشانکراودا هەیە، ئەمانەش بەبێ هاوکاری و پشتیوانی دەسەڵات ناتوانن هیچ بەشداریەکیان لەپێشکەوتنی کۆمەڵدا هەبێت، کۆمەڵەیەک رۆشنبیری دیکەمان هەن کە تێکەڵ بەدەسەڵات نابن، بەڵکو هەڵوێستێکی رەخنەگرانەیان بەرانبەر دەسەڵات هەیە، ئەو هەڵوێستەش پتر لەسەر جۆرو چۆنیەتی سروشتی ئەم دەسەڵاتە سیاسیەیە، بۆ نموونە ئەگەر رۆشنبیر لەبەرانبەر دەسەڵاتێکی بێگانە هەڵوێستی وەرگرت ،هەڵبەت ئەم هەڵوێستە هەڵوێستێکی دوژمنکارانەی گەرەکە. هەمدیس ئەو دەسەڵاتەی بۆ حوکمڕانی پەنا بباتە بەر توندوتیژی و هێز دەبێ رۆشنبیر هەڵوێستێکی دژایەتی بەرانبەر وەرگرێ، ناکرێ هەڵوێستێکی دیکەی هەبێ.

هەڵوێستی دژایەتی رۆشنبیران لەگەڵ دەسەڵاتدا ،بێگومان بۆشایی نێوان رۆشنبیران و دەسەڵات بەرفراوان دەکات، هەروەها ململانێیەکی توند لەنێوان هەردوولادا دروست دەکات.

ئەو دەسەڵاتەی کە بەجۆرێک لەجۆرەکان لەسەر بنەمای شەرعیەت دامەزراوە و تا ئەندازەیەکی بەرچاو خواستی هاووڵاتیانی جێبەجێ دەکات ،کارێکی ئاساییە رۆشنبیر لەگەڵیداتێکەڵ بێت و پشتیوانی لێبکات و هاوکاری بکات ،لە پێناوی پێشخستنی کۆمەڵگادا ،لەسەرجەم بوارەکانی سیاسی و ئابووری و کۆمەڵایەتی و دامەزراندنی دامودەزگای حکومەتدا ،کە لەسەر بنەمای تواناو لێوەشاوەیی بێت. ئەمەش لە پێناوی ئەوەی رۆشنبیریەکی هاوچەرخانە بڵاوبێتەوە، ئەم هەڵوێستە کە چەشنێک شەرعیەتی تێدایە، بۆشایی نێوان دەسەڵات و رۆشنبیر کەم دەکاتەوە. ئەمەش کارێکی پێویستە لە قۆناغەکانی گۆڕانکاریدا، بەڵام لەم چەشنە هاوبەشیکردنەدا مەرج هەیە، کە دەبێ رۆشنبیر لە بڕیار دەرکردندا بەشداری هەبێت. ئەمەش وادەکات رۆشنبیر رۆڵی هەبێت لەدەرکردنی بریاری سیاسیدا. جا بۆ ئەم مەبەستە کارەکە وا دەخوازێ کە جموجۆڵی رۆشنبیران بزاڤێکی بە کۆمەڵ بێت، تاکو دەسەڵات بزانێت چاک لەگەڵیاندا رێک بکەوێت. ئەگەر رۆشنبیران وەک تیمێک لەنێو دامودەزگاکانی حکومەت کاریان کرد، ئەوە بێگومان دەتوانن کار لەدەرکردنی بڕیارە ئیداری و سیاسی و کۆمەڵایەتیەکان بکەن، بەرەو باشترکردنی باری کۆمەڵ.

مەرجێکی دیکە بۆ بەشداری رۆشنبیر ئەوەیە ،کە دەبێ دەسەڵاتی سیاسی رێزی

مافە بنەڕەتیەکانی مرۆڤ بگرێت، بەمافی رۆشنبیرانیشەوە. کەواتا ئەگەر هەر جۆرە چەوسانەوەیەک بەسەر مرۆڤەوە هەبوو، نابێ نەمێنێت ئەوساکە رۆشنبیر دەتوانێ رۆڵی کاریگەرانەی خۆی بگێڕێت.

لێرەدا نابێ ئەو بۆچوونەش لەبیر بکەین کە دەڵێ دەبێ رۆشنبیر لەگەڵ زۆربەی جەماوەردا بێت. ئەم هەڵوێستەش راستە، چونکەئەگەر رۆشنبیر لەگەڵ خەڵک نەبێت ئەی لەگەڵ دەسەلات بێت؟ لە حاڵەتێکیش دەسەلات هاوولاتیان دەچەوسێنێتەوە! ئەوە ناکرێت، چونکە لەسەر رۆشنبیرانی راستەقینە پێویستە بزانێت هاوولاتی چۆن دەژی، موعاناتی چیە، گیروگرفتەکانیان چیە؟ ئەگەر رۆشنبیر لەگەڵ ئەوانەدا نەژی، ئەوە دەتوانین بڵێین ئەو رۆشنبیرە رۆشنبیرێکی راستەقینە نیە، لێرەدا سێ خاڵ هەن دەبێ بایەخیان پێ بدرێت.

**یەکەمیان:** هەڵوێستی سیاسی رۆشنبیر بەندە بە هەست و نەستی هاوولاتیانەوە. کەواتە هاوولاتی رۆڵێکی بنەڕەتی هەیە لەجۆرو چۆنیەتی پێکهاتنی هزری رۆشنبیردا.

**دووەمیان:** مەبەست لەکارکردنی رۆشنبیر چیە؟ ئایا مەبەست ئەوەیە زانست لە پێناوی زانست بێ و هونەر لە پێناوی هونەر بێت بەتەنیا؟ یان زانست و هونەر لە خزمەتی کۆمەڵدا بێت؟!

**سێیەمیان:** پێویستە پەیوەندییەکی هەمیشەیی لەنێوان هاوولاتی و رۆشنبیردا هەبێت.

جێبەجێکردنی ئەم خاڵانە وا دەکات جۆرێک پەیوەندی لەنێوان رۆشنبیر و دەسەلات پەیدا ببێت، بەلام ئەم پەیوەندییە پەیوەندیی راستەوخۆی بەجۆرو چۆنیەتی سروشتی دەسەلاتەوە هەیە، جا بۆیە هەمیشە ئەم مەسەلە لێی بکۆڵدرێتەوەو لەسەر واقیعی کۆمەڵگادا بونیاد بکرێت.

هەروەها پەیوەندی رۆشنبیر و سیاسەت و دەسەلات مەبەستی لە پشتەوەدا هەیە، هەروا لە خت و خۆڕایی نیە، چونکە خۆ بەدەستەوەدانی رۆشنبیر لەبەرانبەر دەسەلاتدا وا دەکات رۆشنبیر بکەوێتە ژێر کۆنترۆڵەوە و هەوڵ بدات پاساو بۆ هزری دەسەلات بدۆزێتەوە هەرچەندی ئەم هزرە لەگەڵ دیدوبۆچوونی خۆشیدا جیاواز بێت.

هزری دەسەلاتدار مافی خۆیەتی بەهەر دەستاوێژێک رۆشنبیران بۆ لای خۆی رابکێشێ و باوەڕیان پێ بێنێت، بەلام هزروان و رۆشنبیران دەبێ ئاگاداربن لەو بابەتانە، بەمەرجێک لەمەرجە هەرە سەرەکیەکانی رۆشنبیر ئەوەیە بتوانێ لەبەرەی جەماوەر دابێت و تەعبیر لە خواست و ویستیان بکات، چونکە کاری رۆشنبیر کۆمەڵگاو تەناقوزاتی کۆمەڵگایە. مادامەکی دەسەلاتیش لەنێو کۆمەڵگادایە کەواتا رۆشنبیر و دەسەلات لەمەیدانی کۆمەڵگادا یەکتر دەدۆزنەوە و یەکتر دەبینن، جا رەنگە هەندێ کەڕەت ئەم یەکتر دیتنە نێگەتیف بێت یاخود پۆزەتیف بێت.

هەڵبەت دەسەلات دەربڕی سیاسەتە، سیاسەتیش دەربڕی دەسەلاتی حوکمڕانانە، حوکمڕانەکانیش بۆچوونی تایبەتی خۆیان هەیە بۆ ئیدارەی کۆمەڵ. هەروەها رۆشنبیریش بۆچوونی تایبەتی خۆی هەیە بۆ گۆڕانکاری کۆمەڵگا. لێرەدا دەپرسین ئەم یەکتر دیتنەی دەسەلات و رۆشنبیر لەناو کۆمەڵگادا چۆن دەبێت؟

بەڕاستی دەبێ لێرەدا هەندێک وشەی سیاسەتیش روون بکەینەوە، چونکە زۆر کەڕەت لە لێکدانەوەی مانایدا زوڵمیا لە وشەکە کردووە، سیاسەت دەربڕی زۆرداری و سەرزەنشت نیە، بەپێچەوانەوە سیاسەت بەمانا راستەقینەکەی واتای کارکردن لە پێناوی بنیادنانی کۆمەڵگایەکی باشتر دەگەیەنێت، ئەرستۆتالیس و چەندین هزروانی دیکە ئەمەیان گوتووە، تاکو ماکیاڤیلیش باس لەوە دەکات کە سیاسەت بۆ پێکهێنانی کۆمەڵگایەکی باشە.

واتا پەیوەندی رۆشنبیری و دەسەلات لە ئایدیۆلۆژیایە، لە شەرعیەتی دەسەلاتە، لە ئامانجەکانی دەسەلاتە، لێرەدا رۆشنبیر پێگەی دەکەوێتە نێوان دەسەلات و کۆمەڵ، ئینجا رۆشنبیری و سیاسەت دەبنە یەک شت و تەعبیر لەیەک مەسەلە دەکەن. حاڵەتی یەکەم پێی دەگوترێ رۆشنبیری دەسەلات، حاڵەتی دووەم پێی دەگوترێ رۆشنبیری سیاسی. بەپێی مێژووی سیاسی رۆشنبیر بەم دوو چەمکە رۆڵی گەورەیان بینیوە، بەلام مەسەلەکە ترسناکە چونکە ئەگەری ئەوە هەیە لەم دوو حاڵەتەدا رۆشنبیر خەسڵەتە سروشتیەکانی خۆی ون بکات و بۆشایی لەنێوان رۆشنبیرو کۆمەڵگا دروست بێت. مەترسیەکەش ئەوەیە کە رۆشنبیر خەسڵەتەکانی خۆی بزرکرد دەبێتە زوڕناژەنێکی سیاسی بۆ دەسەلات، یانی تەعبیر لە هێزو توانای دەوڵەت دەکات.

زۆر جاریش رۆشنبیر کە لەدەسەلات نزیک دەبێتەوە هەوڵ دەدات دەسەلاتێکی دیکتاتۆرانە پیادە بکات، ئەوەش لەبەر ئەوەی تەناقوزات لەگەڵ سیستەمی کۆندا هەیەو بەمجۆرە دەیەوێ رێگاکەی خۆی تەخت بکات. جا هەوڵدەدات تەرکیز لەسەر دەسەلات بکات بۆ چارەسەرکردنی تەناقوزات. ئەمەش زۆربەی جار لەو کاتانە دەبێت کە دەسەلات لەرێگای شۆڕشگێڕانەوە بەدەست دێت و دەبینی ولات ئارامی تێدا نەماوە و ئاسایش جێگیر نەبووە، کە ئەمەش نەبوو شەرعیەتێکی جێگیر نیە، شەرعیەت وەرگرتنیش کاتی پێویست دەبێ.

ئەگەر سەرنجێکی مێژوو بدەین ،ئەم رووکارانە لەهەردوو شۆڕشی فەرەنساو رووسیا بەرچاون .جا پێویستە رۆشنبیران لەمەدا پەلە بکەن و بەشێوەیەکی دیموکراسیانە دامو دەزگاکان دابمەزرێنن، بەلام خاڵێکی دیکەش هەیە دەبێ لێوەی بدوێین جا ئەگەر ئەم رۆڵە درایە رۆشنبیران، رۆشنبیران وا مەزندە دەکەن هەر ئەوان شایانی حوکمڕانین، چونکە زانست و زانیاریان هەیەو لێرەدا دووچاری وەهمی حوکمڕانیکردن دەبن، پێیان وایە بەهێزی ئەوان کۆمەڵگا بەرەو پێشەوە دەچێت، جا **یەکێک لەرەخنەکانی «باکۆنین» بەرانبەر «مارکس» ئەوە بوو کە دەڵێ: (مارکس دەیویست و هەوڵی دەدا حکومەتێک لەزاناو رۆشنبیر دابمەزرێنێت).**

رۆشنبیر جۆرە پەیڤینێکی هەیە کە بریتیە لە قسەکردن، کە قسەی کرد واتا دەسەلاتی هەیە، چونکە قسەکردن کار لە هەست و نەستی هاوولاتی دەکات، هەروەها دەتوانێ بەشێوەیەک لەشێوەکان، بۆچوون و دیدی خۆی بەسەر جەماوەردا بسەپێنێ و وای لێ بکات ململانێ لەگەڵ دەسەلاتدا دەست پێ بکات.

کەواتا پێویستە دەسەلات هەوڵبدات رۆشنبیران بخاتە بازنەی نزیک دەسەلات و ئەویش بەمەرجێک بۆ بەعەقلانیکردنی بڕیار،رۆشنبیر رۆڵی پێبدرێت، بەلام **ئەگەر دەسەلات هەوڵیدا رۆشنبیر لەخۆی نزیک بخاتەوە بەو مەبەستەی لەناو دەسەلاتدا**

**بیتوێنێتەوە، ئەوە دەم کوتکردنی ڕۆشنبیرەو مەترسیەکی گەورەی بەسەر دەسەڵات و کۆمەڵگاوە هەیە. لێرەدا قسەکەی «فۆڵتێر»سان دێتەوە یاد کە دەڵێ: لە رادا لەگەڵتا جیاوازم، بەڵام ئامادەم لەپێناوی رای تۆدا سەرم ببەخشم. کەچی دەسەڵات ڕێک پێچەوانەی ئەم گوتەیەی «فۆڵتێر» دەجوڵێتەوە و دەڵێ، لەگەڵتا جیاوازم، بەڵام ئەگەر رای خۆت بڵێی ئامادەم سەرت پەڵدەم.**

ئەگەر دەسەڵات ڕۆشنبیری بۆ لای خۆی راکێشاو دەسەڵاتی پێنەدا، واتا کوشتی. دیارە لەسەر دەسەڵاتیش پێویستە بتوانێ تەعبیر لە دیدو بۆچوونی زۆربەی هاوولاتیان بکات و لەزۆر بواری حوکمڕانیدا راپرسیان پێ بکات ئەویش لەرێگای هەڵبژاردنەوە.

ئەو پەیوەندیەی کە لەنێوان رۆشنبیرو دەسەڵات دروست دەبێ ،رەوا نیە کار بکاتە سەر پەیوەندی رۆشنبیری و سیاسەت، چونکە رۆشنبیری لەنێو سیستەمی کۆمەڵایەتیدا تەنها لقێکە، هەروەها سیاسەتیش بەهەمان شێوە و سیستەمی ئابووری و خێزان و.. هتد. سیستەمی رۆشنبیری و سیاسی دوو سیستەمی جێگیرن لەناو کۆمەڵگادا کارتێکردنیان بەسەر یەکترەوە هەیەو هەریەکەشیان سەربەخۆن.

رۆشنبیر کە بەشداری دەسەڵات دەکات پێویستە جۆرە هاوسەنگیەک لەنێوان گۆڕانکاری فەرهەنگ و سیاسەت و کۆمەل لەلایەک و فەرمانبەرێتی خۆی لەلایەکی دیکەوە رابگرێت. واتا پێویست ناکات رۆشنبیر ببێتە وتاربێژی بۆنەکان و زوڕناژەنی سیاسەت، دەبێ فەرمانی خۆی جێبەجێ بکات، فەرمانی رۆشنبیر ریسواکردنی ئەو واقیعەیە ئەگەر دواکەوتوو بوو. هەروەها داوای گۆڕانکاری بکات.

ئەرکی بنەڕەتی رۆشنبیر ئەوەیە بەشداری لە گۆڕانکاریە بنەڕەتیەکانی کۆمەڵگادا بکات. **ئەو دەسەڵاتەی کە رۆشنبیر هەیەتی، بەپێی روانینی «فۆکۆ» پێیدەگوترێ دەسەڵاتی ئەپستمۆلۆژیا**، ئەویش بریتیە لە ئەفکارو بیروباوەڕ. هەر ئەو هزرو بیروباوەڕانەش لەنێو جەماوەر دەبێتە هێزێکی مادی، ئەو هێزەش لەمێژووی میللەتاندا دەستنیشانی کاروانی شۆڕشە فیکریەکانی کردووە . واتا جەماوەر لەرێگای هزری هزروانان بوونەتە هێزێکی مادی، کەواتە دەسەڵاتی رۆشنبیر کە مەعریفەیە دەسەڵاتێکە بەرانبەر دەسەڵاتی سیاسی. واتا دەسەڵاتی رۆشنبیر دەسەڵاتێکی رامان نیە، بەڵکو مادیەو دەبێ بێتە ناو جەماوەر و رۆڵی خۆی ببینێت، چونکە خەباتی شۆڕشگێڕانە لەبنکەیەکی تیۆریەوە سەرهەڵدەدات، کە رۆشنبیران نەخشەکەی بۆ دادەڕێژن .دیارە ئێمەش ناتوانین مێژوو دابمەزرێنین، بەڵکو جەماوەر دایدەنێت، ئەوەش پەیوەندی بە ئەفکارەوە هەیە، چونکە فیکر خەڵک هان دەدات و کۆمەڵ هان دەدات، فیکریش بەرهەمی رۆشنبیرە کە دەسەڵاتی مەعریفی هەیە، بەڵام رۆشنبیر لە کۆمەڵگا دواکەوتووەکاندا لەتەنگژەیەکی گەورەدا دەژی، رۆشنبیر وا هەست دەکات لە ئەنجامی فیکرەکەی بۆتە کەسێکی لاواز لەنێو کۆمەڵ، چونکە ئیرادەی کارو کردەوەی نەماوە. جا بۆ ئەوەی رۆشنبیر ئەو ئیرادەیەی خۆی دەسکەوێتەوە پیویستە لەگەڵ جەماوەردا بێت و لەگەڵ شۆڕشدا بێت، شۆڕشیش دەرئەنجامەکەی گۆڕانکاریە. جا رۆشنبیر دەبێ لەنێو بزاڤی گۆڕانکاریدا بێت ئینجا دەتوانێت ئیرادەی خۆی بدۆزێتەوەو رۆڵی خۆی ببینێت. پەیوەندی رۆشنبیر و دەسەڵاتیش پەیوەستە بە ناواخنی دەسەڵاتەوە، ئەگەر دەسەڵات ئامانجی گۆڕانکاری

بێت ئەوە رۆشنبیر ئەرکی خۆی رادەپەڕێنێت و پەیوەندییەکە ئیجابیانە دەبێت، بەڵام ئەگەر دەسەڵات و رۆشنبیر پەیوەندییەکی نێگەتیڤیان هەبێت ئەودەم کۆمەڵیش بەرەو دوواوە دەگەڕێتەوە چونکە رۆشنبیران رۆڵی خۆیان نابینن.

بەرگریکردن لە رۆشنبیران لەبەر ئەوەیە رۆشنبیران هەمیشە نارەزاییان دژی زۆرداری دەربڕیوەو بەتایبەتیش دژی ئیستبدادی سیاسی. مەبەستم لە رۆشنبیری ئۆرگانیکیە. بێگومان ئیستبدادی سیاسی ئەگەر لەگەڵ ئیستبدادی ئایدیۆلۆژی بێت یەکجار مەترسیدارە، **هەروەک «جۆرج تەرابیشی» دەڵێ: ئیستیبدادی ئایدیۆلۆژی خراپترە لە ئیستیبدادی سیاسی**.

رۆشنبیران داوای دیموکراسی دەکەن، دیارە ئەمەش بەتەنیا بەس نیە، چونکە فیکری دیموکراتی لیبرالی تا ئێستا خۆی لە چوارچێوەی دەسەڵات و دەوڵەت دا مۆڵداوە و جۆرە توندوتیژیەک بەرانبەر رۆشنبیران هەیە. پێویستە لەبەرچاو بگیرێ، ئەو فشارەی ژێراوژێرە دەبێ ئاشکرا بکرێت و روونی بکەنەوە، تاکو هاوولاتی و رۆشنبیران لەو مەترسیە رزگار بکرێن. بەدڵنیاییەوە ئەم سەرکوتکردنە رەوشت و ئاکاری کردۆتە بیانوو، ئەو سەرکوتکردنە زۆر لایەنی گرتۆتەوە و زۆر شوێنان بەکار دەهێنن لەوانە مزگەوت. جا دەسەڵات ئەرکێکی بەرپرسانەو پیرۆزیان دەهەنبەر ئەم لایەنەدا لە ئەستۆ دایە.

# داهێنان لە چەمکی دەروونزانیەوە

کەریم شەریف قەرەچەتانی [مامۆستای زانکۆ]

بەپێی ڕوانین لەمیانەی دەروونزانیەوە و بەچەمکێکی زانستیانە باسی [داهێنان] دەکەین، کە ئەم بابەتەش بابەتێکی گرنگە، داهێنان ئەو پرۆسە عەقلیەیە کە بەکۆمەڵێ توانای جیا جیا وەکو ڕەوانی و ڕەسەنایەتی و تازەگەری و کۆمەڵی توانستی دیکەش، لە ئەنجامدا بەرهەمێکی تازەو نوێ دێتە ئاراوە کەسودی بۆ کۆمەڵ هەبێ، ئەمە بە داهێنان ناودەبرێ.

زۆر تیۆری لێکۆڵینەوە هەیە دەربارەی داهێنەران و داهێنان، ئیتر چ لە بواری ئەدەبی و هونەریدا یان لە بواری زانستی دابێ. ئەمانە لە دوو تەوەرەدا کۆدەبنەوە؛ یەکەمیان ئەو بۆچونانەن کەکەسی داهێنەر بەکەسێکی خاوەن گرفت لەقەڵەم دەدەن، ئەوانەی کە لە پرۆسەی داهێناندا، بەرهەمی ئەدەبی و هونەری و زانستی تازەیان دەبێ، ئەوانە کەسایەتیەکی نەخۆشیان هەیە. ئەو کەسایەتیە نەخۆشە وا دەکات لە ئەنجامدا بەرهەمێکی نوێ بێننەکایەوە، ئەمەش پتر دەگەڕێتەوە بۆ قوتابخانەی شیکردنەوەی دەروونی کە (فرۆید) هاوکارەکانیەتی، کە دوایی لێی جیابوونەوە وەکو (کریتشمەر) ئەم زانایانە کەسی داهێنەر بەنەخۆش لەقەڵەم دەدەن، هەروەها هەندێکی دیکە دەڵێن داهێنان زادەی حاڵەتێکی نەخۆشی نیە بەڵکو حاڵەتێکی (سایکۆلۆژیە)، ئەمەش دوو لقی لێ بۆتەوە؛ یەکێکیان ئەوانەن کەسەر بە ڕێبازی سۆسیالیستین، لەلای ئەوان پرۆسەی داهێنان وەکو هەموو پرۆسە عەقلیەکانی دیکە، ڕەنگدانەوەی مێشک و کۆ ئەندامی دەماری ناوەندیە و هەموو کەسێک لە توانایدایە داهێنان بکات. ئەو کەسەش کەسی دەروون ساغەو نەخۆش نیە، وەکو لە تەوەرەی یەکەمدا زاناکان و فەیلەسوفەکان ئاماژەی پێدەکەن نەخۆشە. لەبەشی دووەمدا ئەوانەن کەسەر بە وڵاتانی ڕۆژئاوان وەکو (بەریتانیاو ئەمەریکا) زیرەکی گرێ دەدەن بەداهێنانەوە. ئەوان دەڵێن ئەوانەی زیرەک و بلیمەتن ئەوان داهێنەرن، بەڵام لە ئەمەریکا زیرەکی جیا دەکەنەوە لە داهێنان واتە مەرج نیە کەسانی زیرەک وداهێنەر بن، بەڵکو داهێنان دیاردەیەکی (سایکۆلۆژیە) کۆمەڵێ توانستی تایبەتی خۆی هەیە، کە لە دوایدا باسی دەکەین.



دێینە سەر باسی گرنگی داهێنان. بێگومان لە پەنجاکانی ئەم سەدەیە بەدواوە

گـرنگیــەکی زۆر درا بە مــەســەلەی داهێنان، ئەمــەش بەپلەی ســەرەکی بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە کە داهێنان لوتکەی بیرکردنەوەیە واتە ئەوپەڕی بیرکردنەوەیە،کە داهێنانی تێدا بێت بەرهەمی تازەیە. لەلایەکی دیکەش سەرچاوەی پێشکەوتنی هەموو گەل و نەتەوەکانەو هیچ وڵاتێک، گەلێک و نەتەوەیەک، پێش ناکەوێ، ئەگەر سود لەبەهرەو توانستی تاکەکانی نەبات.کەواتا داهێنان پرۆسەیەکە کە دەبێتە هۆی پێشخستنی کۆمەڵ و دەبێ بە بەردی بناغەی شارستانیەت.

ئەوەی پتر داهێنانی بەرەو پێشەوە برد ئەوە بوو یەکەمجار لە سۆڤیەت لە ساڵی (١٩٥٧)دا یەکەمین مانگی دەستکرد نێردرایە ئاسمان و ئەمەش بووە هۆی ئەوەی ترسێکی زۆر بکەوێتە دڵی وڵاتە یەکگرتوەکانی ئەمەریکا.

کـۆنگرێسی ئەمەریکی ئەوکاتە یەکسەر داوایان لە هەموو زاناو مامۆستاو شارەزایان کرد، کەبێن دیراسەی ئەو حاڵەتە بکەن، هۆکاری چیە ئێمە دوا کەوتووین؟! هۆی چیە یەکێتی سۆڤیەت توانی بەو داهێنانە گەورەیە لە بواری داگیر کردنی بۆشایی ئاسماندا ئەو سەرکەوتنە بەدەست بهێنێ، کەدوای ئەوەی ئەو هەموو زانایە، چەندەها کۆنگرەو کۆنفراس و سیمناریان سازکرد، گەیشتنە ئەو بڕوایەی کە هۆی سەرەکی دواکەوتنی پەروەردەو فێرکردنە لە وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا.

ئەو کاتە لە پەنجاکان پرۆسەی پەروەردە لە وڵاتە یەکگرتوەکانی ئەمەریکا، پتر پشتی بە کۆمەڵێ شێوازی وانە گوتنەوە دەبەست کە پتر دەرخ کردن بوو. واتە قوتابیەکانی ئەمەریکا ئەو زانیاریانەی وەریاندەگرت، دەرخیان دەکرد و دواتر دەیانگەڕاندەوە، ئەمە قەت نەدەبووە هۆی داهێنان، داهێنان واتا دروستکردن و رێگە چارەی تازە، بەرهەم هێنانی بیروڕای تازە. ئەو پرۆسەو رێبازەی ئەو کاتەی ئەمەریکا وای کرد کە ببێتە هۆی فەشەلی وڵاتە یەکگرتوەکانی ئەمەریکا، ئەمانە وایان کرد کە لەرەگ و ریشەوە گۆڕانکاریەکی سەرتاسەری لەپرۆسەی پەروەردەو دامەزراوەکانی خوێندندا بکرێ، هەر لە باخچەی ساوایان و سەرەتاییەوە تا ناوەندی و ئامۆژگاو زانکۆ و خوێندنی بالا. دوای ئەم گۆڕانکاریانەش بەماوەیەکی کەم توانیان بگەنە ئاستی ململانێ لەگەڵ یەکێتی سۆڤیەتی پێشوو.

ئەمە مەسەلەی گرنگی داهێنانە ئەم بابەتەش لەزۆربەی وڵاتانی پێشکەوتوو گفتوگۆی زۆری لەسەرە بۆ ئەوەی سوود لەبەهرە توانستی تاکەکان وەربگیردرێت.

**تیۆرەکانی داهێنان:** داهێنان وەکو دیاردەیەکی دەروونی جێگای مشت و مڕی زۆربەی دەروونزانەکان بووە، تاکو ئێستاش رێبازێک یان قوتابخانەیەکی سەرتاسەری نیە کە داهێنان لێک بداتەوە، بەڵکو کۆمەڵێک بۆچوون و قوتابخانە و شێواز هەیە. یەکێک لەوانە کە سەرنجی هەموو کەسێکی بەلای خۆیدا راکێشاوە، **(لێکدانەوەی قوتابخانەی شیتەڵ کردنەوەی دەروونی)**یە کە لە پێش هەمووشیانەوە دامەزرێنەرەکەی (فرۆید)ـە.

بابزانین فرۆیدو ئەوانەی کە تەوەرەی یەکەمن ،چۆن سەیری کەسی داهێنەری وەکو شاعیرێک، نوسەرێک ،هونەرمەندێک، زانایەک دەکەن.

(فرۆید) لە رێگەی کۆمەڵی زاراوەوە ،کەسی داهێنەر لێک دەداتەوە و دەیگەڕێنێتەوە سەردەمی (منداڵی)، دەڵێ: **کەسی داهێنەر ئەو کەسەیە کە لەقۆناغی منداڵیدا**

**کۆمەڵێ گرفتی دەروونی تووش بووە، هەروەها تووشی کۆمەڵێ کێشەو ململانێی دەروونی بووە و نەیتوانیوە لەو ململانێ دەروونیانە خۆی رزگار بکات، ناچار پاڵی پێوەناوە لە نەستدا لە (لاشعور)دا خەفەی کردووە. بەڵام ئەوشتە کپ کراو و خەفە کراوانە بەردەوام لەکەمیندان، لەبەر ئەوەی کەنایەوێ ئەو شتانە (محرماتن) پتر پەیوەندیان بە دوو غەریزە یان چەمکی زاتیەوە هەیە کەفرۆید باسیان دەکات ئەویش (سێکس)و (دەستدرێژیە) .ئەم دوانەش دوو پێداویستی (فسیولۆجین) کە پتر لە هەموو پێداویستیەکانی دیکە دەکەونە بەرهێرشی دابو نەریتی کۆمەلایەتی. کەسی داهێنەریش لەبەر ئەوەی ئەوشتە خەفەکراوانەی لاماوەتەوە لەرێگای نەستەوە (لاشعور) پاشماوەیەک لە رێگای میکانیزمێکی دەروونیەوە، کە پێی دەڵێن (سەرخستنی) رێچکەی ئەو شتە خەفەکراوانەی لاماوەتەوە. لە رێگای کۆمەڵی هێماو رەمزەوە کە کۆمەڵەکە لێی قبوڵ دەکات ئیتر لە رێگای شیعرێک یان چیرۆک یان پەیکەرێک یان پارچەیە مۆسیقا یان لەرێگای هەرشتێکەوە بێ، دەیگۆرێ بۆ شتێکی داهێنەرانە، ئەمەش لەبەر ئەوەی ئەگەر واقیعیانە شت خەفەکراوەکان بهێنێتە دەرەوە دەکەوێتە بەرهەڕەشەی دوو سیستەمەکەی کەسایەتی کە (فرۆید) باسی دەکات، ئەویش (من و منی باڵا)یە. ناچار دەبێ فرت و فێڵ بکات .بۆ نموونە یەکێک لەو داهێنەرانە ئەگەر غەریزەی جنسی هەبێ ناتوانێ ئەو حەزو غەریزە سێکسیەی تێر بکات، ناچار لەرێگای پەیکەرێکی رووتەوە کە کۆمەڵ لێی قبوڵ دەکات، ئەو حەزو ئارەزووی تێردەکات، کە ئەویش خاڵیکردنەوەی ئەو شتە خەفەکراوانەی (نەست)ـە.**

کەواتا لە بۆچونی (فرۆید)دا، نەست هۆکارێکە کە لەرێگای میکانیزمی (سەرخستنەوە) دەکرێ بەبەرهەمێکی ئەدەبی، هونەری، زانستی. **(یۆنگ)**یش یەکێکە لەو زانایانەی قوتابخانەی شیکردنەوەی دەروونی، بەڵام دوایی لە فرۆید جیا بۆوەو بۆچوونی تایبەتی خۆی هەیەو دوو جۆر نەستی (لاشعور) داناوە، ئەویش لاشعوری تاک و لاشعوری کۆ، جا ئەگەر لای فرۆید لاشعوری تاکایەتی سەرچاوەی داهێنان بێت ئەوە لای یۆنگ لاشعوری کۆ سەرچاوەی داهێنانە.

لاشعوری کۆ بریتیە لەسەرجەم شارەزایی و پسپۆری داب و نەریت و ئایین و..... هتد، کە بەدرێژایی مێژوو نەوە دوای نەوە ماونەتەوە و ئەمەش کۆنەستی دروست دەکات، واتا (لاشعوری جەمعی) جا لەبەر ئەوە پێی وایە توانایەکی دەروونی لای هەموو کەسێک هەیەو هەریەکەو بەجۆرێک گوزارشتی لێدەکات. یۆنگ دەڵێ ئەم هێزە دەروونیە بەشێکی کەوا ڕووەو کۆمەڵە ،بۆلای ناوەوەی تاکەکە دەکشێتەوە، لەرێگای هەستەوە دەری دەبڕێ . زۆر جار لەپڕێکدا رێگا چارە بۆ کێشەیەک دەدۆزێتەوە بەبێ ئەوەی زانیاریشی دەهەبنەر کۆبکاتەوە،.کۆنەستیش هەموو ئەو بابەتانەن کە مرۆڤایەتی پێیدا تێپەڕیوەو لە کۆنەستی مرۆڤ هەیە جا بەهۆی ئەو وزە دەروونیە کە مرۆڤ هەیەتی دەبێتە هۆی سەرهەڵدان و وروژاندنی ئەو کۆنەستیەو لە رێگای خستنەوە سەریش پێچەوانە دەکرێتەوەوە بۆ جیهانی دەرەوەو لەبەرهەمێکی ئەدەبی یاهونەری رەنگ دەداتەوە.

**یۆنگ کەسایەتی مرۆڤ دەکاتە دووبەش: هەندێکیان کۆمەلایەتین و حەز دەکەن تێکەڵ بن، هەندێکیشیان گۆشەگیرو دوورە پەرێزن. هەریەکێک لەم دوو تەوەرەیشی کردووە بەچوار بەشەوە، دەڵێ هەندێکیان هەستەوەرن، و ئەوانەن کە لە رێگای هەستەوەرەکانیانەوە دیاردە کۆمەلایەتی و سروشتیەکان هەست پێدەکەن و لێکیان**

**دەدەنەوە. هەندێکی دیکەیان هەستەوەر نین، بەڵکو ئیلهامین، واتا لە ڕێگای ئەو ئیلهامەوە دیاردەکانی دەرەوە لێک دەدەنەوە ئەوەش ئەوەش بەسەر کەسایەتییەکەیدا زاڵە، هەندێکی دیکەیان کەسانی هەڵچوون، لە ڕێگای هەڵچوون و سۆزەوە دیاردە کۆمەڵایەتییەکانی دەرەوە لێک دەدەنەوە، بەشی دوایشیان هزروانن. ئەو کەسانەش لە ڕێگای عەقڵ و مەنتیق و تێگەیشتنەوە دیاردەکان لێک دەدەنەوە.**

ئینجا یۆنگ پێی وایە ئەو کەسانەی لایەنی هەستوەری و ئیلهامی بەسەریاندا زاڵە، لەبواری ئەدەب و هونەردا داهێنەر دەبن، بەڵام ئەوانەی عەقڵ بەسەریاندا زاڵە لە بواری زانستدا داهێنەردەبن.

هەروەها (**ئەدلەر**)مان هەیە ئەویش خاوەنی قوتابخانەی لێکۆڵینەوەی دەروونزانیە، ئەگەر فرۆید لە ڕێگای نەستی تاکەوەو یۆنگ لە ڕێگای کۆنەستەوە لەباری دەروونی مرۆڤیان کۆڵیوەتەوە، ئەوا ئەدلەر پێی وایە ئەو کەسەی داهێنەرە لە ئەنجامی گرێی دەروونی هەست بەکەمکردنەوەیە،کە ئەو هەستە وایان لێدەکات لە بوارێکدا قەرەبووی بکەنەوە، ئەو هەستەش ڕەنگە هەندێک کەرەت لە کەموکورتی جەستەییدا بێت، یاخود کارتێکردنی ژینگەو دەوروبەر بە کەسێک دەڵێن دەبەنگی، تێناگەی و.... هتد، هەست بە کەمیکردن دەکات، لەبەرئەوەی ئەم هەستە دەبێتە هۆکارێکی گرنگ بۆ ئەوەی لە بوارێکدا قەرەبووی بکاتەوە.

**بافلۆف** مان هەیە، بافلۆف ئەو زانایەیە کە لە سۆڤیەت پاداشتی نۆبلی وەرگرت. بافلۆف کەسایەتی مرۆڤ بە دوو سیستەم لێک دەداتەوە؛ ناوی سیستەمی یەکەمی ناوە سیستەمی ئاماژەی هەستی، سیستەمی دووەمیشی ناوی ناوە سیستەمی ئاماژەی لەفزی.

بافلۆف دەڵێ مێشکی مرۆڤ دوو دەزگایە، بنەمایەکی فەسلەجی بۆ داناوە. بەشی ژێرەوەی مێشک ئەوە بەرپرسە لەبواری داهێنانی ئەدەب و هونەردا، بەشی سەرەوەشی کە توێکڵی دەماغ و بەشی سەرەوەی مێشکە ئەمەش سەرچاوەی فسیۆلۆژیە بنەمای فەسلەجیە بۆ داهێنەر لەبواری ماتماتیک و زانستەکانی دیکەدا، کەواتا دەڵێ ئەو کەسەی بەشی ژێرەوەی مێشیکی لە ژیاندا زاڵ بێت ئەوە لەبواری ئەدەب و هونەردا داهێنەر دەبێت چونکە هەڵچوون و سۆز لەوێدا زاڵە، بەڵام ئەگەر بەشی سەرەوەی مێشکی گەشەی پتر بوو ئەوە کەسەکە لە بواری زانستیدا داهێنەر دەبێت.

کەواتا بافلۆف مرۆڤ دەکا بەسێ سیستەم ؛ دەڵێ زۆربەی خەڵکەکە ئەوەیە کە هەردوو بەشەکەی مێشکی وەکو یەکە تەنیا ڕێژەیەکی کەم نەبێت کەلە سەرەوەدا ئاماژەمان پێداو هەر ئەوانەش دەبنە داهێنەر.

تیۆری دیکەمان هەیە بەنێوی تیۆری ئیلهام ، ئەوانە پێیان وایە داهێنان چرکەیەکە لە چرکەکانی ژیان و داهێنانەکە لە دەرەوەدایە واتە تەفسیرێکی میتافیزیکی بۆ دەکەن، ئەفلاتون یەکێکە لەو کەسانەو دەڵێ داهێنان هێزێکی دەرەکیەو بۆ مرۆڤ دێ و داهێنانی پێ دروست دەکات.

دیارە نمونەش لەو بارەوە زۆرەو خەڵکانێک هەن دەڵێن ئێمە داهێنانمان لەسەر شەقام، لە حەمام و.... هتد، بۆ دێت.

ئەوانە بڕوایان بە تیۆری ئیلهام هەیە.بەڵام قوتابخانەی سلوکی پێیان وایە هەر کەسێک لە کۆمەڵ دەکرێ داهێنەر بێت،.داهێنەرانی قوتابخانەی سلوکی دەڵێن (١٠) منداڵی ساغمان بدەنێ چیتان دەوێ ئەوەتان بۆ دەردەچوێنین (تاوانکار، زانا، نووسەر، مۆسیقاژەن و....هتد)، گرنگ خۆم ژینگەیەکی بۆ دروست بکەم. ئەوانە هیچ بڕوایان بە کەسایەتی نیە، بەڵکو تەنیا بڕوایان بە ژینگە هەیە،بەڵام **گیلکۆت** کۆمەڵێک توانای داناوەو دەڵێ ئەم توانا عەقڵیانە بنەمای داهێنان و داهێنەرانن، چونکە خەڵکی داهێنەر بەبێ ئەم توانستە عەقڵیانە نابێت.

یەکێک لەوانە **رەسەنایەتیە**، مەبەستی لەرەسەنایەتی چیە؟ دەڵێ کەسانێک هەن توانایان هەیە لەکاتێکی دیاریکراودا کۆمەڵێک ئەفکاری تازەت پێشکەش بکەن، بۆ نموونە لەکاتی پێنج خولەکدا ماوەی بۆ دابنێ تا رێگا چارەی کێشەیەکت بۆ بدۆزێتەوە، کۆمەڵێک چارەسەرت دەداتێ.

گیلکۆت دەڵێ مرۆڤ دوو جۆر هزرکردنەوەی هەیە، یەکیانی ناوناوە بیرکردنەوەی وەکو یەک و ئەوی دیکەشی ناوناوە بیرکردنەوەی جیا، مەبەستی ئەوەیە ئەو کەسانەی دابونەریتی کۆمەڵایەتی عەقلیانی لغاو کردووە وەک ئەوە وایە لە کونی بیرەوە سەیری ئاسمان بکەن و یەک وەڵامیان هەیەو خۆی ماندو ناکات بەدوای رێگا چارەدا، بەڵام ئەوەی جۆری دووەمن دەڵێ کێشەیەکی دەخەینە بەردەست لەیەک کات (١٠-١٢) رێگا چارەت پێشکەش دەکات، دەڵێ ئەوانە دەبنە کەسانی راهێنەر.

**هەستیاری:** گیلکۆت پێی وایە ئەوانەی داهێنەرن هەمیشە هەستیارن؛ لەکارێکی بچووک رەنگە دەیان خاڵ بدۆزنەوە کە کەسێکی ئاسایی هەستیان پێ ناکات.

**توانای نەرمی نواندن:** لە کاتی کێشەیەک ئەگەر بەوجۆرە فیکرەی داینا چارەسەر نەبوو ئەوە بۆ فیکرەیەکی دیکە دەگوازێتەوە، واتا جمودی نیە، پێی وایە خەڵکی داهێنەر دەبێ ئەم توانستەی تێدا بێ.

**توانای لێکدانەوە:** گیلکۆت دەڵێ مرۆڤی داهێنەر لە گەڵ ئەوەشدا کە دەبێ توانای لێکدانەوەی هەبێت،دەبێ توانای بنیادنانیشی هەبێت .

**قوتابخانەیەکی دیکەمان هەیە، ئەویش رەوتی مرۆڤایەتیەو یەکێک لەوانە جان جاک رۆسۆیە کە دەڵێ: مرۆڤ سروشتێکی خێرخوازانەیەو پێیان وایە داهێنان لێکدانەوەو دەستەبەرکردنی خواستەکانی زاتە.**

قوتابخانەی سۆڤیەتی پێشوو ئەوانەی لەگەڵ بافلۆفیشدا جیاوازن، ئەوان بڕوایان بەوە هەیە هەموو کەسێک توانای داهێنانی هەیە. گرنگ ئەوەیە دەوڵەت و کۆمەڵناس و مامۆستاو دایک و باوک ئەو دەرفەتە بڕەخسێنن.. جا لە هەر بوارێکدا بێت و هێندەی هەیە بوارەکەی بدۆزرێتەوەو دەستاوێژەکانی بۆ دەستەبەر بکرێت.

ئێستابا بزانین قۆناغەکانی داهێنان چین؟ زۆر کەرەت لە داهێنەران دەپرسن چۆن ئەم داهێنانە هاتەکایەوە؟

لە وەڵامدا دەڵێن خۆشمان نازانین، هەیە دەڵێ زانیاریمان کۆکردەوەو بەم حاڵەتانەدا رۆیشتین ، بەڵام **(دالاس)**ی زانا فیکرەیەکی داناوەو دەڵێ: **داهێنان بەچوار قۆناغدا تێدەپەڕێت و ئەمەش لای زۆربەی دەروونزانان قەبوڵە.**

**قۆناغی یەکەم قۆناغی خۆ ئامادەکردنە،** چونکە کەسی داهێنەر لەخت و خۆڕایی نابێتە داهێنەر، بۆ هەر بوارێک دەبێ ماندووبوون و شەونخونی زۆر بکێشێ، کەواتا قۆناغی یەکەم کۆکردنەوەی زانیاریە لەو بوارەی خۆی.

**قۆناغی دووەم پێی دەڵێن قۆناغی لە باوەشگرتن،** ئەم قۆناغە بەوە دەچوێنن (چۆن مریشک لەسەر هێلکە کڕ دەکەوێ) بە واتای کڕکەوتن لەسەر ئەو زانیاریانەی لە قۆناغی خۆ ئامادەکردندا کۆی کردوونەتەوە. جا ئەم قۆناغە مرۆڤی داهێنەر لە نێوخۆیدا دووچاری ململانێیەکی زۆر دەبێت، ڕەنگە نەگاتە هیچ ئەنجامێک، چونکە ئەگەری ئەوەهەیە زانیاری لاوەکی کۆ کردبێتەوەو شتە بنەڕەتیەکانی لە بیرکردبێت. لەم قۆناغەشدا هیچ بە هیچ ناکات، بەڵام گۆڕانکاری لە نێو عەقڵدا دروست دەبێت.

**قۆناغی سێیەم قۆناغی ئیلهامە،** هەست، لەم قۆناغەدا ئەو چرکەیەیە کە داهێنانەکەت بۆ دێت، دەبێ ئەوە لە بەرچاو بگرین کە ئەمەش دەرئەنجامی قۆناغی یەکەم و دووەمە. **سیزار** دەڵێ: **کەرەستەکان لە قۆناغی دووەم لە ناوەوەیەو تەوەمژاویەو لە قۆناغی سێیەم دەیهێنێتە دەرەوەو ئاشکرای دەکات.**

**قۆناغی چوارەمیش، قۆناغی پیاداچوونەوەیە،** چونکە ئەو شتەی کە لە دایک دەبێت ڕەنگە کەموکورتی تێدا هەبێت و پێویستی بە پاککردنەوە ڕتوش هەبێت و دەستکاری بوێت، ئەمەش لە قۆناغی چوارەمدا پێویستە.

لایەنێکی دیکەی گرنگ ئەویش داهێنان و زیرەکیە، جا قوتابخانەی بەریتانی بڕوایان بەوەیە خەڵکانی زیرەک و بەتوانا دەبنە داهێنەر، بەڵام لە ئەنجامی لێکۆڵینەوەدا دەرکەوت مەرج نیە هەموو داهێنەران خەڵکی زیرەک و بەتوانا بن.

**زیرەکی چیە..؟**

توانای عەقڵی توانایەکی گشتیە لای هەموو کەس هەیە، بە پێی پێوەر ئەگەر زیرەکی لە **(٩٠-١١٠)** بوو ئەوە مرۆڤێکی ئاساییە، ئەگەر پتر بوو بەرەو **(١٨٠)** ئەوە خاوەن مەوهیبەیە، ئەگەریش لە**(٨٠)** دابەزی ئیتر ئەوە بەرەو بەجێماوییە (تخلف عقلیە). ئەوانە دەڵێن مەرج نیە ئەگەر یەکێک زیرەکیەکەی **(١٨٠)** بوو ببێتە داهێنەر، چونکە مەرج نیە ئەو پێداویستیانەی کە پێشتر باسمان کرد بۆ ئەو کەسەی کە زیرەکیەکەی **(١٨٠)**ە دەستەبەر بێت، بەڵام بەلای کەمەوە داهێنەر دەبێت لە زیرەکیدا مام ناوەندی بێت. سەرباری ئەمەش کەسایەتی مرۆڤ پێداویستیەکی گەورەیە بۆ داهێنان. لەوانەش بڕوا بەخۆ بوون، حەزوو ئارەزوو، بیرکردنەوە، نە ترسان لە ڕەخنە.. هتد، کەواتا کەسی داهێنەر ئەو کەسەیە توانای عەقڵی هەبێت و کەسایەتیەکەی مکوم بێت، ئاستێکی مام ناوەندیشی لە زیرەکیدا هەبێت.ئەگەر ئەم سێ بنەمایە لە کەسێکدا هەبێت و ژینگەیەکی لەبار وگونجاوی بۆ دەستەبەر بکرێت ئەوا ڕەنگبێ کەسێکی داهێنەری لێ دەرچێت.

بە پێی بۆچوونی خۆم ئەگەر بمانەوێ کەسێکی داهێنەر دروستبکەین ئەوا دەبێ ژینگەیەکی لەباروگونجاو، کەشوهەوایەکی شایستەو دەرفەتی بۆ بڕەخسێنین. منداڵ لە خێزاندا ڕێزی لێبگیردرێت و ئازادی بدرێتێ و سەرکوت نەکەرێ، وەڵامی پرسیارەکانی بدرێتەوە، سوکایەتی بەرەخنەکانی نەکرێ،لایەنی کەمی پێداویستیە فسیۆلۆژیەکانی بۆ دابین بکرێ، لە قوتابخانەش بەمجۆرە بێت و پرۆگرامەکان لەو

ئاستەدابن کە گۆمی مەنگی عەقڵی بشلەقێنێ.

حەز دەکەم ئەو سەرنجە دەربڕم بەرنامەی ژیانی ئێمە لە ماڵ لە قوتابخانە گیانی داهێنان لە ڕۆڵەکانماندا دەکوژن، چونکە ئێمە لەمنداڵ ناگەین، تاکو بۆ رەخنەگرتنیش بەیەکێک دەڵێین منداڵ، ئەمەش سوکایەتیکردنە بە منداڵ.

ئەمە هەڵەیە ودەبێ پێیدا بچینەوە،پرۆگرامی خوێندن تەنیا لە بەرکردنە، منداڵ لەبەری دەکات و دوای چەند رۆژێک لەبیری دەچێتەوە، داهێنەر ئاوا دروست نابێت، داهێنەر نابێ زانیاریەکانی بلێتەوە بەڵکو دەبێ زانیاری دروست بکات. بۆ سەرکەوتنی بەسەر ئەم رووکارە نێگەتیڤەدا دەبێ بەرنامەمان هەبێت.

دەریشکەوتووە داهێنەران لەناو هەموو میللەتاندا هەن، بەڵام دەبێ بیاندۆزینەوە و پەروەردەیان بکەین و پێداویستیەکانیان بۆ دابین بکەین.

لایەنێکی دیکە کە پێویستە باسی بکەین داهێنانە لای ئەدیب و نووسەران، زۆر کەرەت دەپرسین بۆ ئێمە نووسەرێکی وەکو تولستۆی، شکسپیرمان نیەولە ناوماندا کەسایەتی وا دروست نەبووە.

ئێمە کێشەمان ژینگەیە، ئەگینا کەسانی ئێمەش کە دەچنە دەرەوە خەڵکی ئەوتۆیان لێ هەڵدەکەوێت، چونکە مرۆڤ ئەگەر لە کۆمەڵگایەکی پێشکەوتوودا ژیا داهێنەرێکی گەورە دەبێت، ئەگەریش لە وڵاتێکی دواکەوتوودا ژیا داهێنانەکەی بەقەد گەشەو پێشکەوتنی کۆمەڵایەتی وڵاتەکەی دەبێت.

بۆ نموونە ئەگەر چیرۆکنووسێک چیرۆکێک بنووسێ و چیرۆکەکەی منداڵ و ئافرەت و کرێکاری تێدا بێت ئەگەر نەزانێت هەریەک لەمانە سایکۆلۆژیەتی تایبەتی خۆی هەیە، ئەوا بێگومان ناتوانێت داهێنان دروست بکات و بە زمانی ئەوان بدوێت. هەروەها دەبێ زمانی پاراوو رەوان بێت.

لەگەڵ ئەوەشدا دەبێ شارەزاییەکی باش و گشتی لە هەموو بوارەکاندا هەبێت و بەکردەوەش لەو جیهانەدا بژییەت.

# سەرچاوە و جۆرەکانی ئەپستمۆلۆژیا لە کۆمەڵگای کوردیدا

د. رەشاد میران [مامۆستای زانکۆ]

هەڵبەت تاکو ئێستا لە کۆمەڵگای ئێمەدا بایەخدان بە سۆسیۆلۆژیاوەک زانستێکی کۆمەلایەتی سەربەخۆ پشتگوێ خرابوو، دیارە هەموو گۆڕانکارییەک و پێشڤەچوونێک پەیوەندی راستەوخۆی بە فاکتەرەکانی باری کۆمەلایەتی ئەو کۆمەڵگایەوە هەیە کە گۆڕانکاری تێدا دێتە ئەنجام، بێگومان مایەی خۆشحاڵیە کەوا خەریکە ئێمەش گرنگی بەم زانستە دەدەین.

مرۆڤ لەژیانی رۆژانەیدا دوچاری هەر گرفتێک بێت ئەوە بابەتێکی سۆسیۆلۆژییەو دەبێ لێی بکۆڵینەوەوتوێژینەوەی لەبارەوە ئەنجام بدەین،ئێمە کە کێشەکان دەبینن نایەین لە رەگەوە باسیان لێوە بکەین، بەڵکو تەنیا رووکاری دەرەوەی وەردەگرین.

بۆ نموونە ئێمە لە راگەیاندنماندا باسی بێکاری ناکەین، لە کاتێکدا بێکاری کێشەیەکی گەورەیەو رووبەڕووی کۆمەڵگای ئێمە بۆتەوە، چەندین منداڵ لەسەر ئەو شەقامانە کار دەکەن و دەرۆزە دەکەن تەنیا بۆ پەیداکردنی بژێوی رۆژانەی نەمر و نەژی، یاخود کێشەی چەکداری، هەرچەندە هەندێک پاساوی خۆی هەیە، ئەویش تەنیا بۆ هەندێک کەس ئەویش لە پلەی بەرزی بەرپرسیدان، ئەگینا پێویست نیە ئەم هەموو چەکدارە بەسەر رێگاو بانانەوە بێت، ئەو هەموو پاسەوانە، ئەو کێشەو گرفتانەی کوشتنی بەدوادا دێت هۆکارەکەی چەکدارییە، تاکەی ئەو خەڵکە چەکداربن؟!پاشان چەکداری نیشانەی نەبوونی ئارامی و ئاسایشە ئەوەشیان لەکەدارکردنی حکومەتی هەرێمی کوردستانە، پێویستە ئەم دیاردانە بۆیرانە لێک بپەستینەوە.

بەگشتی هەژاری کێشەیەکی گەورەیە کە چەندین کێشەی دیکەی لێ دەبێتەوە، ئەوانە هەموو بابەتی سۆسیۆلۆژیان کە دەبێ هەمیشە لە روانگەی ئەم زانستەوە شی بکرێتەوەو رێگەچارەیان بۆ بدۆزرێتەوە. کۆمەڵگا دیاردەیەکی گەورەی مێژوویە، چەندەها پرۆسەی جۆراوجۆری بە خۆوە گرتووە کە ناکرێ لێکیان هاوێر بکەین، هەموویان وێکرا کۆمەڵگا پێک دەهێنن، یەکێک لەو دیاردە گرنگانەی پێداویستی کۆمەڵگا، مەعریفەیە،و ناکرێ ئەپستمۆلۆژیا و کۆمەڵ لێک جیا بکەینەوە چونکە هیچیان بە بێ ئەوی دیکەیان بوونی نیە. لێرەدا هەوڵدەدەین چەمکی مەعریفە وەک

بابەتێکی سۆسیۆلۆژیا لێکبدەینەوە، بۆ ئەمەش بەشێکی گرنگی سۆسیۆلۆژیا بەنێوەی زانستی سۆسیۆلۆژیای مەعریفە تەرخانکراوە، لێکۆڵینەوەیەکی کۆمەڵایەتیانەی مەعریفە دەکات، هەوڵدەدات بنچینە کۆمەڵایەتیەکانی مەعریفە بخاتەڕوو لەهەمان کاتدا شیانبکاتەوە.

سۆسیالۆژیای مەعریفە ماوەیەکی کورتە هاتۆتە سەر شانۆی زانست، نزیکەی (٥٠) ساڵێکە ناسراوەو نەشونماو گەشەی لەسەرخۆ بووە، هەر بۆیەش نووسین و وتارو سەرچاوەی دەهەنبەردا کەمە، پتریش لەبەر ئەوەیە بابەتێکی قورسەو لەهەمان کاتیشدا ناکرێ فەرامۆش بکرێت، ئەوە بنچینەیەکی فەلسەفی و شارەزاییەکی چاکی دەوێت بۆ لێکۆڵینەوەو ئەنجامدان، لەگەڵ ئەوەشدا هزروانی ئەوتۆی لێ هەڵکەوتووە کە دیدو بۆچوون و نووسینەکانیان بۆتە سەرچاوە؛ لەوانە (ئۆگست کۆنگ) کە خۆی بە دامەزرێنەری کۆمەڵناسی دادەنێت، هەروەها کارڵ مارکس، ماکس شیلەر و کارڵ مانهایم و... هتد، ئەوانە ناوی دیارن لە بواری لێکۆڵینەوەی مەعریفەو بەستنەوەی بە واقیعی کۆمەڵایەتی.

ئێمەش لە کوردستاندا لەم بوارە خاوەنی هیچ قوتابخانەیەک نین و تائێستا پشت بە بۆچوونی خەڵکانی دیکە دەبەستین و خۆشمان نازانین سەر بەچ قوتابخانەکی کۆمەڵناسین، (بونیادگەری، مارکسی و وەزعی و... هتد). ئێمە خاوەنی کەسایەتی مەعریفەی کۆمەڵناسی خۆمان نین.

ئێستا هەوڵدەدەین لە روانگەی ماتریالیزمەوە باس لە مەعریفە بکەین، بەم پێناسەیە **(مەعریفە بریتیە لە رەنگدانەوەی واقیعی مادی لە هزرو هۆشی مرۆڤدا)**، بەڵام هزرو هۆشی مرۆڤ تەنیا ئاوێتەبوون کارلێکترکردنی واقیع و مرۆڤە.

ئەگەر چی بەم چەمکە مەعریفە شێوازێکی تاکە کەس وەردەگرێ چونکە باس باسی مرۆڤە، مرۆڤی تاک، واقیع و مرۆڤ، بەڵام هەرگیز ناوەڕۆکە کۆمەڵایەتیەکەی خۆی لە دەست نادات، ئەمەش لەوەدا دەردەکەوێ مەعریفە بریتیە لە تێکەڵبوون و کارلێکترکردنی دوو توخم،کە مرۆڤ و واقیعی مادی ـ ن. دەبێ ئێمە بیسەلمێنین کە مرۆڤ هەمیشە بوونەوەرێکی کۆمەڵایەتیە، مرۆڤی (ناکۆمەڵایەتی) (لااجتماعی) بوونی نیە، کۆمەڵ وا لە مرۆڤ دەکات بە جۆرێک لە جۆرەکان سەیری رووداوەکان بکات، هیچ کەسێک لە بوونەوە روانگەی تایبەتی خۆی نیە. هەمیشە لەژێر کارتێکردنی دەوروبەری کۆمەڵگای خۆی دایە بۆ جۆرو چۆنیەتی بیرکردنەوەو هەڵسوکەوت کردن، ئەوە لایەنێکی کۆمەڵایەتی مەعریفیە لەناو خودی مرۆڤەکە خۆیدا. ئینجا واقیعی مادی بریتیە لە دوو بەش، ئەویش سروشتی و کۆمەڵایەتی. کۆمەڵایەتی واتا ژیان لەنێو کۆمەڵگادا، سروشتیش ناکرێ بە کۆمەڵایەتی نەزانین، چونکە سروشت بۆ خەڵک و بۆ کۆمەڵە. خەڵک کاری تێدەکاو سوودی لێ دەبینێ. کەواتا زات و مەوزوعەکە، مەعریفەکە بەرهەم دەهێنن و هەردووکیان لە ناوەڕۆکی مەعریفەدا رەنگ دەدەنەوەبەڵام پابەندبوون بەلایەنی کۆمەڵایەتی مەعریفە واتا زیاتر پەیوەستبوون بە سیمای فەلسەفیەوە، بۆ زیاتر هاسانکردنی ناساندنەکە وا چاکە پێناسەیەکی دیکەی کۆمەڵایەتیانەتر بۆ مەعریفە بکەین. بەرای ئێمە مەعریفە بریتیە لە کەڵەکەبوونی زانیاری و شارەزاییەکانی مرۆڤ کە لەئەنجامی چالاکی و هەڵسوکەوت و هەڵوێستی ئەندامانی کۆمەڵگاکانی مرۆڤایەتی کە لە پرۆسەیەکی مێژوویی دوورو درێژدا وەدەستهاتوون. ئەم پێناسە پتر لە روانگەی کۆمەڵناسیەوەیە

و هەڵبەت بۆ چوونی ئایدیالیستەکان لەگەڵ ئەم پێناسەیەدا ناکۆکە، چونکە ئەوان پێیان وایە مەعریفە لە ئاسمانەوە بۆ چەند کەسانێک دابەزیوە، زانست مامەڵە لەگەڵ ئەمجۆرە بۆ چوونەدا ناکات.

دیارە نکۆڵی لەوەش ناکرێت هەندێک کەرەت ماتریالیزم و ئایدیالیزم تێکەڵی یەکتر دەبن، چونکە لە هەموو کاتاندا سنوورێکی زەق و بەرچاو لەنێوان هەر دوولادا نیە، زۆر کەرەت هەیە هزروانێک بە ماتریالیزم دەست پێدەکات و لە ئەنجامدا ئایدیالیست دەردەچێت، یاخود بە پێچەوانەوە، بۆیەش لە مێژووی فیکری مرۆڤایەتیدا هەمیشە کەسان و زانایانی لەم چەشنەمان بەرچاو دەکەوێت کە هەردوو توخم لە هزرو بیرکردنەوەیاندا هەیە.

هەروەها لە بواری سۆسیۆلۆژیای مەعریفەشدا هەمان حاڵەت هەن، لەوانە وەکو (ماکس شیلەر، یورۆکن) هەردووکیان گەیشتنە ئەو باوەڕەی مەعریفە بە واقیعێکی بێلایەن و جیاواز دابنێن. لەنێو خۆشماندا ئەم رووکارانە بەرچاون چونکە لە هەموو حاڵ و بارێکدا ناکرێ مرۆڤ ماتریالیستێکی وشک، یاخود ئایدیالیستێکی وشک بێت، هەمیشە ئەو بابەتە پەیوەندی بە فەلسەفەی گشتیەوە هەیە، هەموو کەسیش لە بواری فەلسەفەدا پسپۆر نیە. **زۆر جاریش بە دیراسەکردنی فیکری یەکێک، ئینجا دەتوانی بڕیار بدەی کەئایدیالیست یان ماتریالیستە، مامۆستا مەسعود محەمەد یەکێکە لەو هزروانانەی کە هەردوو توخمی تیدایە.**

سەرچاوەکانی مەعریفە بە گشتی کۆمەڵگایە، کۆمەڵگاو واقیعی مادی و دەورووبەر، لەناو کۆمەڵگاکانیشدا دامودەزگاو رێکخراوەی تایبەتی هەن کە هەر یەکەو بە جۆرێک چەشنە مەعریفەیەک پێشکەش بە ئەندامانی خۆی دەکات، رێکخراوو گروپەکانی ناو کۆمەڵگا ناسراون و دەزانین چین، بە تایبەتیش ئەوانەی رۆڵیان لە پێشکەشکردنی مەعریفەدا هەیە، بێگومان یەکەمین یەکەی کۆمەڵایەتی خێزانە، ئینجا دەزگاکانی دیکە وەکو دەزگای پەروەردەکردن، دەزگای ئایینی، دەزگای زانستی، هەروەها دەزگای سیاسی، دەزگا رۆشنبیریەکان، ئەوانە هەر یەکە چەشنە مەعریفەیەک پێشکەش دەکات، هەر هەموشیان تەواو کەری یەکترین، کار لێکتر دەکەن، بەڵام هەریەکە شێوەی مەعریفەی تایبەتی خۆی پێشکەش دەکات، بۆیەش مەعریفە لەم رووەوە دەکرێتە چەند بەشێکەوە.

**لە زۆربەی کۆمەڵگاکان چوار جۆر مەعریفە دەدرێتە کۆمەڵ:**

**1- مەعریفەی رەمەکی، واتا مەعریفەی گشتی.**

**2- مەعریفەی روحی، ئەوەش مەعریفەیەکی تایبەتیەو دەزگای ئایینی پێوەی هەڵدەستێت.**

**3- مەعریفەی زانستی، ئەوەش دەزگای تایبەتی خۆی هەیە.**

**4- مەعریفەی فەلسەفی.**

دیارە هەندێک بۆچوون هەن مەعریفەی سیاسیش بە مەعریفەیەک دەزانن و هەمدیس مەعریفەی سەربازی بە مەعریفەیەکی تایبەت دەزانن و... هتد،بەڵام وەکو دەبیندرێت ئەم مەعریفانە پێوەندیان بە یەکترەوە هەیە تێکهەڵکێش کراون و کار لێکتری دەکەن، وێکڕاش بەرهەمەکەیان هوشیاری کۆمەڵایەتیە لە کۆمەڵگادا.

بێگومان خێزان پێش هەموو شتێک هەڵدەستێت بە پێشکەشکردنی رۆشنبیری رەمەکی، ئەو رۆشنبیرییە پێویستەی کە دەبێ هەموو کەس هەیبێ بۆ ئەوەی بتوانێ ببێتە ئەندامێکی کۆمەڵگا وبەئاسایی بژیەت و رۆڵی خۆی ببینێ، بۆیە خێزان بە بنچینەو بناغەی رۆشنبیری دادەنرێ ئەوەش بەروونی بەراورد دەکرێ لەنێوان خێزانی خوێندەوارو خێزانی نەخوێندەوار کە چۆن دەتوانێ پەروەردەی رۆڵەکانیان بکەن و چۆن فێریان بکەن و بەرەوزانست هانیان بدەن، و هەموو چاککردنێکی رەوشی رۆشنبیری و کۆمەلآیەتی دەبێ لە چاککردنی خێزانەوەبێ، بۆ ئەوەی بەرێک و پێکی ئەندامی کۆمەڵگا ئامادەبکات.

هەروەها خێزان سەرەتایەک دادەنێ بۆ رۆشنبیری رۆحی، هەر یەکێک لە ئێمە سەرەتا لە خێزانی خۆمان فێرە نوێژ بووە، فێری مەسەلەکانی سەرەتایی ئاین بووە، ئینجا دەزگاکانی ئاینیش رۆڵی تەواوکەری خۆی بینیوە وجۆرێک لە رۆشنبیری ئاینیان داوەتە خەڵکی، کە پێی دەگوترێ رۆشنبیری رۆحی، ئەمەش پەیوەندی بەلایەنی دڵ و دەرون و رۆحەوە هەیە،و مرۆڤ لەلایەنی مادی و واقیعیەوە دەخاتە حاڵەتێکی یەقین و ئارامی رۆحیەوە. رۆشنبیری زانستیش ئەوا دەزگای زانستی هانی دەدات وەک زانکۆ و پەیمانگاکان پێش ئەوەش دەزگا پەروەردەییەکان زەمینە خۆش دەکەن بۆ وەرگرتنی رۆشنبیری زانستی لەلای ئەندامان، هەرچی رۆشنبیری فەلسەفیە، ئەگەرچی ئەمرۆ فەلسەفەش خۆی زانستێکە، بەلآم لەگەڵ ئەوەشدا تایبەتمەندی خۆی هەیە، تەواوترە، قووڵترە، فراوانترە بابەتەکەی هەمیشە بوون و نەبوون دەگرێتەوە، بابەتی ئەسڵی ژیان، ئەسڵی گەردوون و ئەسڵی بوونە، بۆیە بابەتەکەی زۆر جیاوازە لە رۆشنبیری زانستی، هەروەها بەرهەمەکانی فراوانترن،و بە پێچەوانەی زانست پرۆڤانە نیە بەڵکو بابەتەکەی تێرامان و تێفکرینە.

ئێمە لە واقیعێکدا دەژین کە هەست دەکەین، رۆشنبیریمان کەمە، یان لە ئاستی پێویست دانیە،ئەمەش لە سۆسیۆلۆژیای رۆشنبیریدا پێی دەگوترێ (گرفتی رۆشنبیری) ئەوەش پەیوەندی بە واقیعی مادی و رۆشنبیریەوە هەیە، کە هەمیشە کارلێک دەکەن، و رۆشنبیریش هەمیشە لە زیاد بوندایە ئەو هەوالآنەی ئێمە بۆ رۆشنبیریی دەدەین، گەواهی ئەو کارلێکەیە کە واقیعی مادی لەگەڵ رۆشنبیریدا هەیەتی. ئێمە ئەگەر هەست بە کەمی رۆشنبیری نەکەین، ئەوا ناتوانین زانیاری پتر وەربگرین، بۆیە هەردەم واقیعی مادی وات لێدەکات کە هەست بەکەمی رۆشنبیری بکەی، ئەویش بە خواستنی پێداویستی پتر. واقیع هەمیشە وات لێدەکات کە پێویستەکان پتر بن، ئەمەش وات لێدەکات کە رۆشنبیریت زیاد بکات، ئەمەش گۆڕانی بەدواوە دێ و کۆمەڵگا سودی لێوەردەگرێت.

بۆیە مەرجە هەرەگرنگەکانی گۆڕانی کۆمەڵگا، یەکەمین شت پێداویستیەکانی ژیانە، دووەم رۆشنبیری کەڵەکە بوو، ئەگەر ئێمەش رۆشنبیریمان لەو ئاستە دا نەبێ کە گۆڕانکاری بکەین، هەر چەندە خۆشمان بمانەوێ ئەوا هیچمان لە دەست نایەت، مەرجی دیکەش زۆرن، لەوانە پێکهاتەی کۆمەلآیەتی تا چەند رێگا دەدات گۆڕانکاری بکەیت، بۆیە گۆڕانکاری بە ئاسانی ناکرێت و زۆر جار خوێنرشتنیشی لەگەڵدا بووە.

ئەوەی لێرەدا مەبەستمانە ئەوەیە کە گۆڕانکاری بە بێ رۆشنبیری نابێ، رۆشنبیریش کۆمەڵ خۆی پێشکەشی دەکات، کەواتە دەبێ گۆڕانکاری خواستی

کۆمەڵگا بێت، ئینجا لە ڕێگای ئەو ڕۆشنبیرییەوە کۆمەڵگا دەتوانێ گۆڕان بکات.

بە توانای زۆری کۆمەڵناسانی کوردستان، تا ئێستا هەموو لایەنەکانی شی نەکراوەتەوەو لێی نەکۆڵدراوەتەوە و بەراشکاوی توێژینەوەی لەسەر نەکراوە. بۆیە بە پێویستی دەزانم کە باسی قۆناغی مێژووی کۆمەڵگای کوردستان بکەم، ئایا ئێمە لە چ قۆناغێکداین؟ ئەو سیفاتانە چین کە کۆمەڵگای کوردەواری پێی پێناسە دەکرێ؟

دەتوانین بڵێین ئەمڕۆ کۆمەڵگای کوردی بە قۆناغی وەرچەرخاندا تێدەپەڕێ، ئێمە لە قۆناغێکی چەسپاو داین بۆیە ئەگەر ورد بینەوە دەتوانین چەندەها سیما و سیفاتی جیاجیا لە ناو کۆمەڵگای کوردیدا بەدی بکەین لەیەک کاتدا، عەشایریت دەوێ، دەرەبەگیت دەوێ، سەرمایەداریت دەوێ، ڕەنگە سۆسیالیستیش هەبێ، ئەوانە هەموو لە کۆمەڵگای ئێمەدا هەن، ئەمەش سیمای گشتی هەموو قۆناغێکی وەرچەرخانە.

سیما هەرە دیارەکەی کۆمەڵگاکەمان کە بینای کۆمەڵایەتی ئێمەی لەسەر وەستاوە، باوک سالارییە. ئەمەش دیاردەیەکی زەقی رابردووە بۆمان ماوەتەوە، ئەگەرچی ئێستا روو لە کزیدایە، بەڵام کاریگەری هەرماوە. ڕەنگە ئێمە هەموومان ئەو دەمارەمان تێدا هەبێ کە لە رەفتار و هەڵسوکەوت وبیرکردنەوەماندا دیارە، لە لای ئێمە کە دەگوترێ پیاو واتا ئازا واتا دڕ، شەڕ کەر، پێمان خۆشە پیاو ئازابێ، ئەوە لە دەروونی هەموماندایە، وە دەبێ ئەوەش بزانین کە باوک سالاری تەنیا عەشایەریەت و لادێی نیە، بەڵکو خەڵکی ناو شاریشمان باوک سالارین کە ئەمەش جێگای مەترسیە و رەوشی گۆڕانکاریەکە سەختتر دەکات و تەنگژەی پتری دەخاتە بەردەم. کۆمەڵگای کوردەواری هەموو پێویستیەکانی تێدا هەیە، بۆ ئەوەی پێی بڵێین کۆمەڵگا و هەموو ئەو دەزگا و پێویستیانەش کە لە کۆمەڵگاکەماندا هەیە، لە مەودای کاری رۆشنبیری خۆیاندا رۆڵیان هەیە، جا ئەگەر ئێمە چاو بەرەوشی خێزانی کۆمەڵگاکەماندا بخشێنین، دەتوانین بڕیاریش بدەین کە دەبێ چ جۆرە رۆشنبیریەک پێشکەش بە ئەندامانی خۆیان بکەن.

ئەگەر ئێمە مەبەستمان هەر جۆرە گۆڕانکاری وپێشکەوتنێکی کۆمەڵ بێت ئەوا دەبێ لە خێزانەوە دەست پێبکەین، و مەرجیش نیە تەنیا کۆمەڵناسان ئەم کارە بکەن بەڵکو کاری دەروونناسان و هەموو کەسێک کە بیەوێ فێری چاککردنی رەوشی خێزانی ببێت، و دەبێ تیمی تایبەت و جۆراوجۆر دامەزرێنین بۆ بەسەرکردنەوەی خێزانەکان کە ئەمەش زۆر زەحمەتە، بەڵام ئەگەر وا نەکەین هەرگیز چاک نابین. ئێمە دەبێ سەرپەشتی مامەڵەی خێزان بکەین لەگەڵ منداڵەکانیدا، منداڵان چۆن پەروەردە و بەخێو دەکرێن، و ئەو تیمانە دەبێ لەکاتی بەسەرکردنەوەی خێزان راپۆرتی تایبەتی خۆیان بنووسن.

بۆ نمونە با بڵێین شاری هەولێر دابەش بکەین بەسەر چەند گەڕەکێک وهەر گەڕەکە و چەند تیمێک سەریان لێبدەن با ساڵێ جارێک یان دوو جار بێت، جائەگەر مەبەستمان چاککردن بێ دەبێ لەو هەنگاوەوە دەست پێبکەین. رۆڵی پەروەردە لە فێرکردندا لە کۆمەڵگای ئێمە سنورداره چونکه مامۆستا دەرچووی هەمان کۆمەڵگا و خێزانە، قوتابیش هاندەری ئەوتۆی لە پێش نیە بۆ خوێندن، قوتابخانەکان شێوەیان لە بەندیخانە دەچێ، هیچ شتێکی تازە و سەرنج راکێشی تێدا نیە بەتایبەتی لەسەرەتاییەکان کە بتوانێ قوتابی بۆ خۆی راکێشێ، تەنانەت هەندێ

قوتابخانه هەیە تەختەشیان نیە، ئەوە لە مێژە وایە، زستانان سۆپا نیە، هاوینان پانکە نیە مامۆستا لێدان و جوێندان بەکار دێنێ ونازانێ چۆن وانەکە بڵێتەوە هەروەها مامۆستا خۆی خەریکی کاری دیکەیە، بەهۆی کاری مامۆستایەتیەوە ناتوانێ بژی. کەواتا لەو جۆرە قوتابخانەیەدا دەبێ چ جۆرە زانست و رۆشنبیریەک پێشکەش بکرێ، ئێمە بە حیساب کۆمەڵگایەکی ئاینین، دەزگای ئایینیش کاریگەی خۆی بەسەر ئەندامی کۆمەڵگاوە هەیە، بەلام دیسان ئەو دەزگا ئایینیانەش ئەو زانیاری و رۆشنبیریەی چەندەها ساڵ بەر لە ئێستا دەڵێینەوە هەر ئەوەیە و هیچ گۆرانی تێدا نیە، کە کاریگەرتر بێ و بتوانێ خەڵک بجولێنن، تەنانەت ناتوانن خەڵک فێرکەن قەبرستانەکانیان چۆن بێ، خۆ قەبر هەر ئەوە نیە لاشەیەک بخەنە ژێر خاک و بەردێک قووچ کەنەوە، رێز گرتنی مردوو چۆن دەبێ، خۆ ئامۆژگاری هەر ئەوە نیە بلێی خەڵک مەکوژە و دزی مەکە، ئەگەر وردتر بێینە ناو کۆمەڵگا دەتوانین خزمەتی زۆرتر بە کۆمەڵگا بکەین.

دەزگای زانستی لە کۆمەڵگای ئێمەدا بریتیە لە زانکۆ و لە پەیمانگاکان، ئەوانیش بە گوێرەی پێویست نین، **بەداخەوە جارێ پێش هەموو شتێک زانست و هەژاریان بەیەکەوە نەگوتووە. (ئیبنی خەلدون) لەسەدەی چواردەهەمەوە باسی ئەو مەسەلەی کردووە و دەڵێ: (مەدەنیەت کە پیشەسازی وزانستی تێدا پێش دەکەوێ شتێکە لە دوای دابین کردنی ژیان)**، کە تۆ لە دوای پەیداکردنی نان و تێر کردنی سک بووی قەت ناتوانی پێش بکەوی لە زانست دا، ئێمە کتێبمان نیە وەکو سەرچاوە، تاقیگەکانمان کەم و کوریان هەیە، قوتابی دکتۆرا ناتوانین بنێرینە شارێک و ولاتێک، کەواتا لەسەر سەرچاوەکانی ئێرە دکتۆراکەی لاواز دەردەچێ، ماجستێرەکەش هەروا، مامۆستاش ناتوانێ خۆی بەرەو پێشەوە ببات، چونکە کتێب و سەرچاوەکان گرانن و دەگمەنن کەواتارۆشنبیریی زانستیمان لاوازە، دەزگاکانی راگەیاندن زۆر شت چاپ دەکەن، بەلام ئایا تا چەند سەرچاوەی باشیان تێدایە، بەلام هەر چۆنێ بێ چاپکردنی شتی باشە کۆر گرتن باشە، راگەیاندن رۆڵێکی باش دەبینێ لە بابەتی رۆشنبیری ئەوە دڵخۆشکەرانەیە.

دەزگای سیاسی کە خۆی لە دەزگا دەوڵەتیەکانی هەرێم و حزبەکان دەنوێنێ ئەمانە جۆرێک لە رۆشنبیری سیاسی پێشکەش دەکەن ، راگەیاندن و بلاوکراوەکانیان پتر سیاسیە و هەندێ (دۆگماتیزم) یان تێدایە، (دۆگماتیزمێکی) وشک، هەق وایە کراوەتر بێ بابەتی رۆشنبیری دی والا بکرێ، هەر ئەو دەزگا سیاسیانەش دەبێ پەیوەندی لەگەڵ دەزگاکانی زانستیدا توند و تۆڵ بکات.

هەر ئەوەندەی بڵێم لە رەوشێکداین، کە هەندێ پاساومان هەیە لە رەوشێکی (وەرچەرخان) داین بەلام ئەو پاساوانە هەرگیز رێگا بەوە نادەن لایەنی زانستی و رۆشنبیری پشتگوێ بخرێ لە کوردستاندا ودەبێ هەنگاو بنێین بۆ گۆرینی کۆمەڵ بە شێوەیەکی زانستیانە.

لە بنچینەدا کێشەی ئێمە کێشەیەکی نەتەوەیی سیاسیە، کەچی پاش نزیکەی (١٠) ساڵ راپەرین و ئازادی هێشتا هەوڵمان نەداوە بە گورج وگۆڵی و زانستیانە لایەنی نەتەوەیی خۆمان چاک بکەین. بەداخەوە ئێستاش گیانی نەتەوەیی لای ئێمە لاوازە، سیمای کۆمەڵگای ئێمە هەرگیز کوردیانە نیە، نووسینی کوردی لاوازە، رۆشنبیری عەرەبیمان زۆر گەورەیە، خراپ نیە، بەلام دەبێ ئاورێکیش لە رۆشنبیری کوردی

بدەینەوە، خەریکە وای لێهاتووە ئەوەی بیەوێ شتێک لەسەر کورد و کۆمەڵگای کوردی بنوسێ دەبێ کوردی بزانێ، بەداخەوە زۆربەی کۆمەڵناسانی سۆڤیەتی کاتی خۆی کوردیان نەدەزانی من پێم گوتن: دەبێ فێری کوردی بن ئەگەر بتانەوێ شتی راستەقینە بنووسن. جا ئەمە دەهێنمەوە بە نمونە، چونکە زۆرمان دانیشتووین دەڵێین رۆشنبیریمان عەرەبیە و کوردی نازانین.

زمان و کەلتور و کۆمەڵگاش سێ شتی لەیەک دانەبڕاون، نابێ لێک دابېرێت ئەگینا لەنگی و گرفت دروست دەبێ، پێویستە بایەخ بەلایەنی نەتەوەیی کۆمەڵگاکەمان بدەین و هیواداریـن سەرکەوین لەو ئەرکەی لەبەردەم هەمووماندا هەیە.

*ئەم نووسینانەی لەم بەشەدا هاتووە، بریتین لەو بۆچوونانەی لە سالانی ١٩٩٦ تا ١٩٩٧، لە کاتی پێویستدا، وەک سەروتار لە گۆڤاری ڕاماندا، بلاوم کردوونەوە. هەر لەخۆیاندا، جۆرێک لەو کێشەیە نیشان دەدەن کە لەوکاتدا بۆ دروست کردنی کەشێکی فەرهەنگی هەبووە. هەربۆیەش بە زنجیرەی مێژووی بلاوکرانەوەیان، دانراونەوە.*

[١]

# لەناو تەنگژەدا پەل دەکوتین

## سەرۆ قادر

کاری ڕۆشنبیریی ، لە دوای ڕاپەڕین تووشی نشووستی هات،چونکە بواری بلاوکردنەوە و پەرەپێدانی فەرهەنگی ،زۆر بەرتەنگ بووەوە. ئەمە بە پێچەوانەی کاری ڕاگەیاندن کە لەو کاتەوە تا ئێستا زۆرترین ڕۆژنامە و هەفتەنامە و مانگنامە و گۆڤار و تەلەڤزیۆن و ڕادیۆی بۆ تەرخان کراوە . هەلبەت چەندی کێشەی سیاسی زیاتر بێت، ئەوە بایەخدان بە ڕاگەیاندنیش زیاتر دەبێت، چونکە پەیوەندییەکی توندیان بە یەکتدیەوە هەیە.

کێشەی سیاسی ، پێویستیەکی هەنووکەیی بە کاری ڕۆشنبیری نەبووە، بۆیە فەرامۆشی کردووە.هەر لە کۆنیشەوە داگیرکەرانی کوردستان، زیاتر گرنگیان بە کاری ئەدەبی دەدا، چونکە کاری سیاسییان لە کوردستاندا نەدەویست. دەکرێ بووترێ ڕۆژانی دەرەوشانەوەی ئەدەبی کوردی، لەوکاتانەدا بووە کە کێشەی سیاسی نەبووە. هەر بۆیەش بەر لە ڕاپەڕین ئەدیب و ڕۆشنبیران دیار بوون، نەک ڕۆژنامەنووسان . کەچی ئێستا نووسەران بە پاشکۆش قبول ناکرێن. یەکێک لە هۆیەکانی ڕۆلپێدانی ئەدیب و ڕۆشنبیرانیش لەناو ژیانی ئیداری و سیاسیدا هەر بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە. بۆیەشە نووسەران تا ئەو ئەندازەیە زەلیل کران، تەنانەت کارە سەندیکاییەکەشیان هەلوەشێندرایەوە و ئەو یەکێتیەی لە زەمانی داگیرکاراندا هەیانبوو، لەکاتی ڕزگاریدا بە جارێک بەلاوەندرا.

ئەو قسانەمان پاساو هێنانەوە بۆ بزووتنەوەی سیاسی نییە، بگرە لەواقیعێکی تالەوە سەرچاوە دەگرێت و زیانێکی گەورەیە پرۆسەی ڕۆشنبیریی کوردی گەیاندووەو تەنگژەیەکی ڕۆشنبیریی خولقاندووە کە تێدیا دەژین. بە پاشدانی کاری ڕۆشنبیری و فەرامۆش کردنی نووسەران لە ژیانی سیاسی و کۆمەلایەتیدا، بووەتە هۆی چەقین و وەستانی فیکری و مەعنەوی لە ولاتدا. ئێستا هیچ کەس ناتوانێ حاشا بکات کە هەموومان لە پێشکەوتنی فکریدا دەستەوەستان وچەقیوین. ئەم

دیاردە درێوە یەکێکە لە کەموکورییە هەرە گەورەکانی بزووتنەوەی سیاسی کوردستان و هیچی وای لە برسێتی خەڵک کەمتر نییە. قووڵایی کارەستاتەکە لەوەدایە کە میللەتەکەمان جیا لەسکی برسی، مێشکیشی بەتاڵ کراوە.

کاردانەوەی ڕۆشنبیرانیش لەم واقیعە سەختەدا ،زیاتر بەرەنگاربوونەوەی نێگەتیڤ بووە و ئەم واقعیەیان بە بێدەنگکردنی خۆیان ڕەت کردووەتەوە. هەندێکیش ملی هەندەرانیان گرتووە. بەڵام ژمارەیان زۆر کەمە. ئەو نووسەرە سیاسیانەی بۆ ‹نان› ملیان داوەتە کاری ڕاگەیاندن، ژمارەیان زۆر کەمە،.

هەڵبەت هەموو کەس مافی خۆیەتی بچێتە ناو کاریسیاسی ، بەڵام هەرگیز سیاسیەکان شوێنی نووسەرەکانیان پێناگرێتەوە ، ئەو نووسەرە سیاسیانەش کە کاری سیاسەت دەکەن ،لە کاری ڕۆشنبیری زۆر دوور دەکەونەوە. ئەوانە بە زۆری تووشی نامۆیی دەبن و پیشەیەک بەسەر خۆیاندا دەسەپێنن کە ناتوانن داهێنانی تێدا بکەن، ئینجا بۆیە لەگەڵ ئەوەی دەشیکەن لە پاڵەوە بۆڵەیان دێت و گلەیی لە واقیعەکە دەکەن. ئەم حاڵەتە لەناو سیاسیەکاندا بە ئیزداوجیەت و دوو ڕوویی بۆ ڕۆشنبیران لێکدەدرێتەوە.

تەنگژەی ڕۆشنبیری لە کوردستاندا، زۆر قووڵ بووەتەوە، چارەسەرکردنیشی پێوەندی هەیە بە باری بزووتنەوەی سیاسی و یەکلابوونەوەی ئەم بارودۆخە نالەبارە و جێگیر بوونی ئاشتی و گەڕانەوەی خەڵک بۆ ناو ژیانی ئاسایی. لە هەر وڵاتێک شەڕ ڕوو بدات، ڕاستەوخۆ ڕۆشنبیران تووشی تەنگوچەڵەمە دەبن، چونکە ئەوانە گەورە پیاوانی ئاوەدانکردنەوە و بیناکردنەوە وپەروەردە کردنی کۆمەڵن. ئەوانە دەتوانن روحی مرۆڤ دۆلەمەند بکەن، بەڵام هەرگیز ناتوانن بکوژن وویران بکەن. لە کوشتن وێرانکاریدا تەنیا فرمێسک هەڵدەرێژن و کۆتایی بە دەوری خۆیان دێن.لێرەدا مەبەتسم نیشاندانی جورئەت و قارەمانییەتی ئەوانە، چونکە نووسەران نایانەوێ لە وێرانکردندا پاڵەوان بن.

لەم گۆڤارەدا مەبەست تەنیا کردنەوەی دەریچەیەکی بچووکە لەسەر کاری ڕۆشنبیری، بەڵام دوور لە ڕاگەیاندنی سیاسی، بۆ ئەوەی نووسەران (ئەگەر بیانەوێ) بەرهەمە بچووکەکانیان بڵاو بکرێتەوە و جارجاریش دەردی دڵی خۆیان بنووسن. نامانەوێ لەم بڵاوکراوەیەدا پڕوپاگەندەی سیاسی بکەین و سەکۆیەکی تر بۆ شەڕی ناوخۆیی دروست بکەین. هەر بۆیەش دەرگامان بۆ هەموو نووسەران واڵایە، بە تێکڕای بیروڕا سیاسیە جیاجیاکانیانەوە. بڕواشمان وایە ئاکامی ئەم کارەمان خزمەتکردنێکی بچووکە بە نیشتمانەکەمان. هیچ حزبێکیش لە خزمەتکردنی نیشتماندا زیانی پێناکەوێ، ئەگەر گۆڤارەکەکان ئەو ئەرکەی پێ جێبەجێ کرا، ئەوە خزمەتێکی بچووک پێشکەش دەکەین، خۆ ئەگەر ئەم بارەشی پێ هەڵنەگیرا، ئەوە قەرزداری هیچ لایەک نابینەوە.

١٩٩٦/٧/١١

[٢]

# با لۆكەی ناو گوێیەکانمان دەربکەین

ڤۆلتێر دەڵێ: ئامادەم خۆم فیدا بکەم تا موخالیفەکەم بتوانێ قسەی خۆی بکات و رای خۆی لەدژم دەرببڕێ. ئەم نووسەرە فەرەنسییە بەم دەربڕینە، بچووکی دەسەڵاتی سیاسیی زەمانی خۆی نیشانداوە،.لە هەمان کاتدا گەورەیی و جورئەتی رۆشنبیرانی سەلماندووە کە ئامادەنین تا سەر بینە کەرستەیەکی هەرزان بۆ پاساودانی دەسەڵاتی سیاسیی.تاسەر وەک ویژدانی زیندووی کۆمەڵ دەمێننەوەو لە پێناوی پێشکەوتنی کۆمەڵایەتی بەردەوام دەستەو یەخەی دەسەڵاتی سیاسیی دەوەستن، چونکە هەر بەسروشتی خۆی «دەسەڵات» زیاتر بەلای خۆپاراستن و پارێزگاریکردن لە بەرژەوەندییەکانی دەشکێتەوە، هەر بۆیە پارێزگارانە رەفتار دەکات.

لە کۆتایی سەدەی بیستەمدا ئەم وەچەیی ئێمە بەختەوەرە، چونکە لە زەمانێکدا دەژیت کە بەشێکی زۆر لە کێشە سەرەکییەکانی پێشوو بەلایەکدا شکاونەتەوەو ئەزموونی پرۆسەی رزگاری و پەرەسەندن و پێشکەوتنی کۆمەڵایەتیان لەبەر چاوەو رۆڵی رۆشنبیران لەم مەیدانەدا ساغ بووەتەوە. ئێستە تەماشای دووای خۆمان دەکەین، ئەو دەسەڵاتدارانەمان زۆر بە بەدبەخت دێتە بەرچاو کە ویستوویانە هەر خۆیان قسە بکەن و خەڵکیش و تەنیا گوێیان لێبگرێ و فەرمانبەر بێت و رۆشنبیرانیش بە ئاسانی رام بن و لە چوارچێوەی بەرژەوەندی ئەواندا، بیری دیکتاتۆری دابڕێژنەوەو لەبری پارچە نانێک، لغاو بکرێتە بەر زمانیان .

لە کوردستان، لە زۆر بواردا کە لەخزمەتی دەسەڵاتی سیاسیدا بووبێت ، مونافەسەیەکی توندو هەندێک جار خوێناویش کراوە، تەنیا لە بواری رۆشنبیریدا هیچ هەنگاوێک نەهاوێژراوەو بە بەیاری جێهێڵدراوە. خۆ ئەگەر لەمەو دووا تەنانەت ئەگەر بۆ خزمەتکردنی سیاسەتیش بێت - ئەو مونافەسەیە بە شێوەیەکی هێمنانە بکەوێتە بواری رۆشنبیریش، ئەوسا رۆشنبیران دەتوانن کەڵک لەو هەلە وەربگرن. ئەوسا ئەوانەی دژی لغاو کردن بن، ئەوە کاریان سەخت ترە، بەڵام بەرهەمیان گەورەتر دەبێ و دەکرێ زەمینەیەک بۆ دەربڕینی رای دژ بەیەرکدی و تەحەمول کردنی قسەی یەکدی برەخسێندرێ.

دیارە ،هەر دەسەڵاتدارێک بیەوێ رۆشنبیران بخاتە ژێر قامچی خۆیەوە، دەیەوێ کاتێک پشتی کردەوە، پێی پێبکەنن، هەڵبەت خەندەی رۆشنبیران لەم بوارەدابۆ گێلێتی دیکتاتۆرانە.

دووای راپەڕین نووسەرێک دەیگوت: «هەندێک سیاسەتکار کە ئیشیان لەگەڵ دەکەم وەک دیکتاتۆرێک لەگەڵم دەجوولێنەوە، تێگەیشتم دەیانەوێ لغاو بخەنە دەمم، من

گێل نیم بۆیە لغاوم پێویست نییە. هەر بۆیەش لێیان پشتریّ بووم».

لەناو رۆشنبیرانیشدا ئەوانەی سەودای دەمبەستنی خۆیان و خەڵکیدیکەن، هەلێکیان بۆ دێتە پێشەوە، ئەویش هەلی داماڵینی دەمامک و ماسکەکانە. ئێمە پێویستمان بە قسە هەیە، بۆیەش دەبێ لۆکەی گوێیەکانمان دەربکەین، چونکە لەم سەردەمەدا هیچ ئایدیۆلۆژیایەک بەتەنیا ناتوانێ کەرستەی بیرکردنەوەی رۆشنبیر دابین بکات . حزبایەتی بەرچاوتەنگ وەک زیندانی لێهاتووە.

ئازادی بەهیچ شێوەیەک و لە هیچ پاساوێکدا لەگەڵ تیرۆر و ترساندن هەڵ ناکات. هەمووشمان دەزانین سەردەم سەردەمی ئازادی و پەرەسەندنی دیموکراسییە.

١٩٩٦/٨/٥

[٣]

# رۆشنبیران لەناو دەمی گازی سیاسی دان

جیاوازییەکی زۆر لە نێوان دوو جۆر رۆشنبیردا هەیە.

مەبەستم رۆشنبیری سەربەخۆو رۆشنبیری سیاسی ، واتە ناسەربەخۆیە. رۆشنبیری سیاسی خاوەن هەڵوێستێکی سیاسی - حزبی دیاریکراوەو هەوڵ دەدات ئەڵتەرناتیڤی پەسەندی خۆی سەر بگرێو هەمیشە خۆی لە جوارچێوەی حزبێکی سیاسیدا دەبینێتەوە. بەڵام رۆشنبیری سەربەخۆ، زۆربەی هەرە زۆری نووسەرانو رۆژنامە نووسانو هونەرمەندان دەگرێتەوە، کە گرینگی بە کاری سیاسی نادەنو مەبەستیان حزبێکی دیاریکراو نییە، بگرە پتردیفاع لە ئامانجە بەرزەکانی کۆمەڵ، دەکەن و بە کاری ئەدەبیو فەرهەنگی گشتییەوە خەریکن.

رۆشنبیرانی سیاسی، لە وڵاتانی لە بابەت کوردستان، هەبوونو بەرژەوەندییان بەستراوە بە مانەوەی ئەو حزبەی تێیدا چالاکی دەنوێنن. هەر بۆیەش لە تێشکانو سەرکەوتنیدا خاوەن بەرژەوەندیو زیانن. رۆشنبیرانی سیاسی هەرگیز ناتوانن سۆزی گشتی هاووڵاتیان بەدەست بێنن، بەڵام رۆشنبیرانی سەربەخۆ، سنووری دابەشکرانی سیاسی دەبەزێننو خەڵک بە سامانی نەتەوایەتی خۆیان دادەنێن.

زۆربەی رۆشنبیرانی سەربەخۆی کوردستان، لەم قۆناغەی ئەمرۆی وڵاتەکەماندا لایەنی هیچ حزبێکیان نەگرتوە. ئەگەر لە دەزگاکانی یەکێک لەو حزبانەشدا کارمەندبن ئەوە تەنیا بۆ بەرێوە چوونی ژیانیانە.

جا بۆیە شایان نییە لە تێشکانو سەرکەوتنی لایەنێک ، ئەو بەشەی رۆشنبیران حیسابی تێشکانی سیاسیان بۆ بکرێوهەڵوێستیان لەسەر وەربگردرێت. چونکە رۆشنبیران ناتوانن دەست لە ژیان هەڵبگرن تاکو حزبەکان، کێشەی سیاسی نێوانیان تەواو دەبێت. هەربۆیە لەسەر بزووتنەوەی سیاسی پێویستە، بوار بە رۆشنبیران بدەن لەو جێگایانەی کاری گشتی تێدا دەکەن وەک خۆیان بمێننەوەو نەیانخەنە ژێر پاڵەپەستۆی سیاسی.

لەم دوو ساڵو نیوەی دووایی کە شەڕی ناوخۆ بەردەوامە، زمارەیەکی زۆر لە رۆشنبیران کەوتونەتە ژێر پەلاماری سیاسیو هەرەشەیان لێکراوەو ماڵیان تاڵان کراوە، لەسەر نووسینی لێرەو لەوێ چاویان لێسوور کراوەتەوە.

هەر لەم دووساڵەشدا هەڵوێستی بەرهنگاریش لە رۆشنبیرانی سەربەخۆدا بیندراوەو ملیان بۆ هەرەشەی سیاسی شۆڕنەکردووە. لە بۆنە میللیو رۆشنبیرییەکاندا بەشداربوونو سنووری دەستکردی نێوان حزبەکانیان بەزاندووە،

به جوان پێکەنیونو دزێویشیان کرهاندووه.

کورد نەرێتێکی له رەفتارکردن لەگەڵ رۆشنبیران هەیه کەله هەندێک میللەتی رۆژهەلات جیایی دەکاتەوه ،ئەویش دەست نەبردنه بۆ خوێنی رۆشنبیران. بەڵام بەداخەوه دەستی بۆنانو کاریان درێژ کراوه. جا پێویسته رەفتاری یەکەم بپارێزرێو بەشی دووەمی نەهێڵەرێو پتر دەرگا لەبەردەمیان بکرێتەوه. پێویسته زیاتر رێزی رۆشنبیرانمان بگیرێت، چونکه ئەوانه عەقڵو عاتیفەی نەشێواوی میللەته شێواوەکەمانن.

١٩٩٦/٩/٥

[٤]

# قڕانی مێشک

ڕۆشنبیری کوردستان لەبارێکی زۆر شەپرێوو پەرێشان دایە، ئەوە بۆ چەندین ساڵ دەچێ هیچ گرینگییەکی ئەوتۆی پێنەدراوە. ئێمە لەوڵاتێکدا دەژین کە نەکتێبخانەی تێدایەو نەکەسیش بۆی دەلوێ کتێب بخوێنێتەوە. لەلایەکی دی کوردستان وەک دورگەیەک وایە کە هەموو دەرگاکانی بەسەردا بەسترابێت.

کتێب و گۆڤارو ڕۆژنامە بیانییەکان ناگەنە خوێنەری کوردستان و لە وڵاتەکەشماندا هیچ ڕۆژنامەو گۆڤارێکی زیندوو دەرناچێت.

لەوڵاتێکی وا پەرێشاندا دەبێ ڕۆشنبیر چی بەسەر بێت؟ لەم وڵاتەدا تا ئێستا میلیشیاکان فەرمانڕەوایە و یاسا هیچ ڕۆڵێکی نیە. ئازادی بیرورِا هیچ زەمینەیەکی بۆ نەڕەخساوەو رای گشتی کوڵەوار بووە، چونکە هیچ سەکۆیەک نەبوو لەوێوە خواست و ئازارەکانی خۆی دەرببڕێ، داگیرکار ئەوەی لەدەستی هاتبێ لەزەمانی خۆیدا بەسەر ڕۆشنبیری وڵاتەکەمانی هێناوە، بەڵام جێگەی داخ ئەوەیە ؛ دووای رزگاریش خزمەتێکی بچووکیش بە ڕۆشنبیری کوردستان نەکرا، لە هەردوو کابینەی پێشوودا، خەڵکانێک وەزارەتی ڕۆشنبیری و دەزگاکانی بڵاوکردنەوەو چاپکردنیان بەدەستەوە بوو کە هیچ پێوەندییان بەدنیای ڕۆشنبیرییەوە نەبوو. کەسانی وەک شێرکۆ بێکەس و سەعدی پیرەو جەبار فەرمان وەزیری ڕۆشنبیری بوون کە یەکێکیان بالۆرەی بۆ تیرۆر دەگوت و ئەویتر داهێنانی تێدا دەکرد و سێیەمیشیان چی تەهریج بوو ئەوەی تێدا بڵاو دەکردەوە.

لەم حاڵەتەدا بوو کە ڕۆشنبیران لە داهێنان کەوتن و لە دەسەڵات دوور کەوتنەوە. بۆیە وەزارەتی ڕۆشنبیری لە کابینەی سێیەمدا پێویستە هەڵسەنگاندنێکی ورد لەسەر کاری ڕۆشنبیری دووای ڕاپەڕین بکات و بە جورێتەوە زەمینەی بوژاندنەوەی ڕۆشنبیری کوردستان (بە هەموو لق و پۆپەکانییەوە) برەخسێنێ.

لەم وڵاتەدا کەنوقمی برسێتی بووە، جیا لە حکوومەتی کوردستان لە توانای هیچ کەس و لایەنێکی دیکەدا نییە زەمینە بۆ کاری ڕۆشنبیریی بخوڵقێنێ. بۆیە دەخوازێ ئەم وەزارەتە زەمینەیەکی لەبارتر بۆ ئازادی ڕۆژنامەنووسی و بڵاوکردنەوەو چاپەمەنی دروست بکات، تا هەموو توانایەکان بکەونە خزمەت تۆکمە کردنی حکوومەتی کوردستان و بوژاندنەوەی باری مەعنەوی مرۆڤی کورد. پێویستە ئەم وەزارەتە پتەوترین سەکۆ بۆ ئازادی بیرورِا دەربڕین دروست بکات و گرینگییەکی تایبەتی بە چاپەمەنی و بڵاوکردنەوەو شوێنە گشتییە ڕۆشنبیرییەکان بدات. خەڵکی چاوەڕوانن کابینەی سێیەم سەرکەوتوانە لە تاقیکردنەوە مێژوویەکەی دەربچێت، بە

هەمان شێوەش چاوەڕوانی ئەوەن وەزارەتی رۆشنبیری گیانێک بە بەر لاشەی لە گیانەڵڵای رۆشنبیری کوردستان بکاتەوەو جیا لە تێرکردنی سک، با مێشکی مرۆڤی کوردیش زاخاو بدرێت.

١٩٩٦/١٠/٥

[٥]

# کتێب نییە،
# چونکە پێویست بە خوێندنەوە ناکات.

یەکێک لە بوارە وێرانەکانی فەرهەنگ لە کوردستاندا، نەبوونی کتێب و بایەخ نەدانە بە چاپ و بڵاوکردنەوە.

دووای راپەڕین حکومەتی کوردستان نەیتوانی بایی ئەوەندە لەسەر پێی خۆی رابوەستێ تا بیرێک لە باری فەرهەنگی کوردستان و کەموکوڕییەکانی پەرەسەندنی بکاتەوە. لەلایەکی دیکە حزبەکانیش و بەتایبەتی ئەوانەی دەستیان دەڕۆیشت جیا لە راگەیاندنی حزبەکانیان و چاپ کردنی چەند نامیللکەو کتێبێکی تایبەت بە حزبەکە، کە ئەویش هەر بەشێکە لە راگەیاندن، گرنگیان بە چاپکردنی کتێب نەدا. هەر بۆیە لە دوای راپەڕین بازاڕی کتێب لە کوردستان بەرەو کوێربوونەوە رۆیشت و وردە وردە کتێبخانەکانیش دادەخرێن و سیمایان دەسڕێتەوە .

چاپکراوی نوێ نابیندرێ. چاپخانەکانی کوردستانیش تەرخان کراون بۆ لە چاپدانی رۆژنامەو گۆڤاری حزبەکان.

لەم وڵاتەدا نەک هەر بایەخ بەو کتێبانە نادرێ کە بەزمانی کوردی نووسراون، هیچ دەرگایەکیش بەسەر دەرەوەدا نیە تا ئەو کتێبانەی بەزمانی دیکەی باو لە کوردستان نووسراون ،بگەنە خوێنەران .ئەم وڵاتە وەک دروگەیەکی داخراوی لێهاتووە کە هەموو بوارەکانی رۆشنبیریی و راگەیاندن ئاگای لە دنیای دەرەوە بڕاوە. هەر بۆیەش ژمارەی خوێنەران بەرەو کەمی دەچێ :

أ- لەبەر نەبوونی کتێب

ب- لەبەر نەبوونی پارە

نوسەرە کۆنەکان بەر دەوام نارەزایی خۆیان بەکاربەدەستە حزبیەکان دەگەین و دەڵێن نووسین و داهێنانی نوێیان هەیە، بەڵام خێرەومەندێک نییە بۆ خۆی چاپیان بکات.

چیرۆکنووسێکی ناسراو، پێی وتم ئەو زیاتر لە ٢٥ کتێبی دانراو و وەرگیراوی هەیە ئامادەیە هەموویان بە خۆرایی بداتە یەکێک کە چاپیان بکات. رۆمان نووسێکی دیکە دەیگوت دوا رۆمانم دەدەمە ئەو کەسەی چاپی بکات وهیچ پارەشم لی ناوێت .

لە دنیادا نووسەران بە داهاتی نووسینەکانیان شاهانە دەژین و لە کوردستاندا نووسین تەنیا برسیتی و بێدەسەڵاتی بۆ خاوەنەکەی دێنێ. لەم پێنج ساڵەی دواییدا

ڕەنگدانەوەی بایەخ نەدان بە چاپکردنی کتێب ،لە چەند بواردا بەسەر دانیشتووانی وڵاتەکەمانەوەدەرکەوتووە: لە لایەک پلەی ڕۆشنبیریی میللەتەکەمان زۆر دابەزیوە و کڵۆڵی تەواو بە ئاستی فیکریی کوردستانەوە دیارە. لەلایەکی دەیکەوە هیچ دەرگایەک لەبەردەم نەوەی نوێدا ئاوەڵانییە تا خۆی پێبگەیەنێ و وەچەی نوێ ڕۆشنبیران بێنە مەیدان.هەر بۆیە کە بەرەو ڕووی مەڵبەندە ڕۆشنبیرییەکان دەبێتەوە تەنیا پرچی سپی و ڕوخساری پڕ لۆچ دێنە بەرچاو.

لە کوردستاندا لەگەڵ کوێربوونەوەی کتێبفرۆشیەکان و داخران و تاڵان کرانی کتێبخانەکان، هیچ بازاڕێکی تایبەت بە کتێب نییە، هیچ حزبێک بیری لێناکاتەوە، هیچ دەوڵەمەندێکی بە مێشکیشمان نییە لەو بوارەدا سەرمایەکەی بخاتە گەڕ. حکومەتی کوردستانیش ماشاڵڵا بەرەکەتی لێبێت جاریٚ زۆری ماوە بگاتە ئەم بایەخدانەی ڕۆشنبیران کە پێیەوە ماندوون.

لەم وڵاتەدا گشت دیاردەکانی ڕواڵەتیش گۆڕاون. لە شوێنان کتێب بەشێکە لە زینەت و ڕازاندنەوە ماڵ و نووسینگەو وەزارەتەکان. کەچی لێرە لەلای وەزیرەکان، لێپرسراوانی گەورە زۆرشتی عەنتیکە هەیە وەک دوا مودێلی ئۆتۆمبیل، باشترین دیکۆر و جوانترین چراغ ، ئەسڵیترین فەرش و نوێترین جل و بەرگ و... بەڵام هەرگیز کتێبێک نابینی.

لە وڵاتێکدا کتێب نەبێت، دیارە خوێندنەوەش نییە. هەش بەسەری ئەو میللەتە دەکرێت کە بواری خوێندنەوەی پێنادرێت.

١٩٩٦/١١/٥

[٦]

# بەبێ رۆشنبیریی

## پاراستنی ئازادی و دیموکراسی خەیاڵە

جمووجوڵی رۆشنبیر لە حاڵەتێکدا دەردەکەوێ کە لە وڵاتەکەدا کەناڵی تایبەت بەخۆی بۆ دروست بکرێ. ئەم کەناڵانە بە پلەی دووەم دێن، دوای ئەوەی ئازادیی بیرورِا دەربرِین دابین دەکرێت.

کاری رۆشنبیریی و هونەری بەتەنیا نووسین نیە، بەڵکو پێویستی بە ئامرازی مادیش هەیە تا پرۆژە رۆشنبیریی و هونەرییەکان ببنە واقیع.

لە کوردستاندا ناوەندە رۆشنبیرییەکان زۆر کەمن و لە هەمان کاتیدا زۆر دەست کورت و بێ توانان. ژمارەی ئەو هۆڵانەی بۆ کاری رۆشنبیری و هونەری تەرخان کراون زۆر کەمن. بۆ نموونە لە هەولێردا تەنیا سێ هۆڵ هەیە کە لە حەوت ساڵ لەمەوبەرەوە هیچ نوێکارییەکیان تێدا نەکراوە. لەوانەیە لە دنیادا هیچ پایتەختێکی ئەوەندە کلۆڵ و هەژار نەدۆزرێتەوە. هەڵبەت بارودۆخەکە لە سلێمانی و دهۆکیشدا لەوەی هەولێر باشتر نییە.

لە کوردستاندا هیچ هۆڵێک بۆ شانۆ نییە و هیچ گۆڤارو ناوەندێکیش گرنگی پێدانی نابینرێت. بواری سینەما لە هەموو بوارە رۆشنبیرییەکانی دیکەدا وێرانترە. دەتوانین بە دڵنیاییەوە بڵێین لە کوردستان بوارێک بەناوی سینەما نییە و ئەو چەند سینەمایە کەلە سێ پارێزگەکانیشدا هەن زیاتر لە ڤیدیۆخانە دەچن و کەمترین شێوەو شێوازی سینەماییان پێوە دیار نییە. هیچ کارێکی سینەماییش لە کوردستاندا کە بە لایە کەمەکەی تەکنیکی سینەمای تۆمار کرابێت. ئەو فیلمانەی کە دەشخرێنە سەر پەردەی سینەماکان ڤیدیۆ کاسێتی دوور لە هەموو مەرج و خاسییەت و تەکنیکێکی سینەما جگە لە خافڵاندن و لە رێلادانی لاوان بە بەرهەمی سینەمایی پلە نزمی بیانی، هیچی دیکە پێشکەش ناکات. دەکرێ بڵێین ئێمە تاکە گەلێکی سەر ئەم زەمینەین کە سینەما هیچ رۆڵێکی لە پەوەردە کردنماندا نییە.

سینەما نە لە پەرەسەندنی رۆشنبیریماندا بەشدارەو نە لە داستانی بەرەنگارییەکانمان.

هونەرمەندا لەگەڵ ئەوانەیشدا میللەتەکەمان لە رووی مۆسیقاوە زۆر غەدر لێکراون. لەو وڵاتەدا جگە لە هەوڵە تاکە کەسییەکان هیچ مەڵبەندێک نییە مۆسیقاژەن و هونەرمەندانی هان بدات و لە پرۆسەی پێگەیاندنی رۆشنبیری و دنیای مەعنەوی

مرۆڤی کوردستاندا کەلێنی خۆی بگرێت. مۆسیقاژەنە باشەکانمان بەرەو هەندەران مل دەنێن و گـۆرانی بێـژەکـانیش لە سـایەی هونەرەکـەیاندا نەک هەر رێگەی پێشکەوتنی پیشـەکەیان لێگیراوە، بەڵکو نانیش نییەبیخۆن، هەر بۆیەشە لاوانی کورد تاموچێژ لە گۆرانی بیانی وەردەگرن.

ئێمە هیچ بوارێکی پێگەیاندنی رۆشنبیریمان کامڵ نییە و هیچ زەمینەیەکی بە کردەوەش بۆ پەرەسەندنی نابینین. هەر بۆیەشە رۆشنبیریی کوردستان لە پلەیەکی نزم دایە ولە چەقینێکی قورسدا کاس بووە.

ئازادی و دیموکراسی بەبێ رۆشنبیرییەکی کامڵ هیچ زەمینەیەکی لەبار بۆ پێرەوکردنیان دروست نابێت. بگرە لە دنیاو لە هیچ وڵاتێکدا ئازادی و دیموکراسی و بەبێ میللەتێکی رۆشنبیرو پێگەیشتوو بوونی نەبووە. ئایە حکومەتی کوردستان بایەخ بەم بوارە گرنگە دەدات؟.

١٩٩٦/١٢/٥

[٧]

# ڕووناکبیری کورد لە هەندەران ون بووە، پێویستە لێرە خۆی بدۆزێتەوە

ڕۆیشتن بەرەو هەندەران، لە وڵاتەکەماندا دیاردەیەکە شایەنی باسە. لەو خەڵکەی ڕوو دەکاتە ئاوارەیی، ژمارەیەکی زۆر لە ڕۆشنبیران دەگرێتە خۆی. هەموو ئەوانەی کوردستان بەجێ دڵێن، باس لە نەبوونی کارو ئاسایش و ترسان لە داهاتووی خۆیان دەکەن، ڕۆشنبیرانیش جیا لەو سێ هۆکارەی سەرەوە، هیچ جێگەیەک بۆ ڕۆڵگێران و داهێنان نابینن، بۆیە دیاردەکە بە فراوانی ئەوانیشی گرتۆتەوە، خۆ ئەگەر دەست کورتی نەبوایە ئەوە بەدەگمەن کەسانی ڕۆشنبیری کاریگەر لە کوردستان دەمانەوە.

من باس لەوە ناکەم ئەم دیاردەیە دەکرێ چەند بەرەنگاری بکرێ، یان دەرچوونەکی چەند بەسوودە، بەڵام جێگەی باس ئەو ونبوونەیە کە ڕۆشنبیران لە دەرەوەی کوردستان تێیدەکەون.

ئەوە زیاتر لە بیست ساڵە ،زۆر بە فراوانی، خەڵکی کوردستان ڕوو لە ئەورووپا و ئەمەریکا دەکات، سەرەنجام جالیەیەک پێکهاتووە، بەڵام هیچ ناوەندێکی دەستڕۆیشتووی ڕۆشنبیریی، یان ڕاگەیاندنیان پێکنەهێناوە، تا دوور لە کارتێکردنی ناوەوەی کوردستان، بەکەڵک وەرگرتن لەو ئازادییەی لەوێدا هەیە، بەشداری لە پرۆسەی ڕۆشنبیرییدا بکات. هەر بۆیە ئەو ڕۆشنبیرانەی دەگەنە دەرەوە ، دەستیان بە هیچ شوێنێک ڕاناگات تا بیروڕاو بەرهەمەکانی خۆیانی تێدا بڵاو بکەنەوە، ئەمە جیا لەو زیانەی لەئاکامی نەزانینی زمان ، بەریان دەکەوێت.

ئێمە لە کوردستان زۆر بە ڕوونی هەست بە کاریگەر نەبوونی ڕۆشنبیرانی دەرەوەی وڵات دەکەین و لە هیچ ناوەندێک بیروڕایەکی نوێ ناخوێنینەوە کەلەلایەن ئەوانەوە پێشنیار کرابێت.

نەبوونی ناوەندێک لە دەرەوە بۆ کاری ڕۆشنبیریی، دەگەڕێتەوە بۆ دەستکورتی و پەراوێزی جالیەی کورد لە ناو کۆمەڵی ئەورووپا و ئەمەریکادا. ئەم جالیەیە لە چاو جالیەکانی پێش خۆی، ساواو بێ دەسەڵاتە و هیچ مەڵبەندێکی ماددی بۆ خۆی دروست نەکردووە، تەنانەت بە شێوەیەکی ماقووڵ شوێنێکی بۆ خۆی لەناو کۆمەڵی شارستانیدا نەدۆزیوەتەوە. جا بۆیە ناتوانێ بیر لەدروستکردنی ناوەندێکی کاریگەر بکاتەوە، هەر بۆیەش هیچ کەناڵێکی تەلەفزیۆن، یان ڕادیۆ، یان گۆڤارێکی هەمەگیر نابیندرێ. بۆ نموونە جالیەی عەرەب و تورک و فارس و جولەکە بە پێچەوانەی کوردەوەن و ناوەندی زۆر گەورەی ڕۆشنبیری و ڕاگەیاندنیان هەیە.

لێرەدا مەبەست باس کردنی واقیعی هەندەران و رەخنە لێگرتنی نییە، بە قەد ئەوەی دەمەوێ بڵێم پێویستە لە کوردستانەوە دەبێ بیر لە دروستکردنی ناوەندێک لە دەرەوەی وڵات بکرێتەوە، بۆ ئەوەی بەهاوکاری جالییەی کورد، سەرەتای ناوەندێکی راگەیاندن و رۆشنبیری بنیاد بندرێ. تا پردێک لە نێوان ئەو جالییەیە و داهێنانی رۆشنبیرانیان لەگەڵ کوردستان هەڵبەسترێ.

پێویستە لە کوردستانەوە هاوکاری رووناکبیرانی دەرەوە بکرێ تا بەشداری لە پرۆسەی رۆشنبیریی کوردستان بکەن و لە هەمانکاتدا دەوری خۆشیان لەکارتێکردنی رای گشتی دەرەوە ببینن ،بۆ زیاتر هاوکاری کردنی میللەتەکەمان و تێگەیشتن لە گرفتەکانی ولاتەکەمان .لەوانەیە ئەمە یەکێک بێت لە تایبەتمەندییە سەیرەکانی کوردستان کە لە هەموو میللەتانی دنیا جی دەکاتەوە، هەر وەک چۆن واقیعی سیاسی و ژیوپۆلەتیکی ولاتەکەمان شتێکە تایبەت بە خۆمان و هیچ میللەتێک بە قەد ئێمە بەدبەخت نییە.

١٩٩٧/١/٥

[٨]

# نەوێران و دواکەوتن

لە کاری نووسیندا، بوێری مەسەلەیەکی زۆر گرنگە، مەبەستم، لە بوێری تەنیا بۆ نووسینی سیاسی نییە، بگرە بەشەکانی تری نووسین لە ژیانی کۆمەڵیشدا دەگرێتەوە.

نایشارمەوە، تەنگوچەڵەمەی سیاسی و کۆمەڵایەتی و ئابووری و مێژووی بە شێوەیەکی زۆر زەق لە کەسایەتی و جۆری بیرکردنەوەی نووسەرانی میللەتەکەشماندا رەنگی داوەتەوە. خۆ ئەگەر رەنگدانەوە لەهەندێک بورای دیکەی ژیانی کۆمەڵی کوردەواری بە زەحمەت بدۆزرێتەوە و بخوێندرێتەوە، لەسەر کەسایەتی نووسەرانمان بە ئاسانی هەستی پێدەکرێت. هەڵبەت من ئەمەیان بە خۆشبەختی نازانم، چونکە جۆرێکە لە بێ بەختییەکانی میللەتەکەمان، هەر بۆیەشە کەسایەتی نووسەر لە ناو کوردا ئەو سەنگەی نییە کە لەناو وڵاتانیدیکەداا دەبیندرێ. جا دەیڵێمەوە لەو قسەیەمدا ئەو غەدر و ئاستەنگانەم لە بیر نەچووە کە بزووتنەوەی سیاسی لە کوردستاندا بۆ نووسەرانی خوڵقاندووە.

لە دنیادا کەباس لە بوێری نووسەران دەکرێ، لە پێشەوە ئاماژە بۆ ئەو بەشەی دەکرێ کە لە بواری دەربڕیندا نیشانی دەدەن؛ جورئەت لە دەربڕینی ئەو مەسەلەیەی نووسەر بڕوای پێ هەیە، بایەخێکی زۆری لای خوێنەران دەبێ و بەهێزێکی زیاترەوە کار دەکاتە سەر جۆری پێگەیاندنی بیر کردنەوەی کۆمەڵی. نوسەری کورد لەو بوارەدا کەموکورییەکی زۆری هەیە و پاشکەوتنێکی زۆری پێوە دەبینرێ، زۆر جار بە زەحمەت دەکرێ لە نووسەرێک بگەیت تا بزانی دەیەوێ چی بڵێ.

کاتێک تێناگەی نووسەرێک دەیەوێ لەو نووسینەیدا چیت پێ بڵێ، کەواتە ناتوانێ بزانێ چۆنیش بیر دەکاتەوە؟ هەر بۆیە لەوانەیە زۆر بە هەڵەدا نەچووبین ئەگەر بڵێین هەر لێرەوە دوور نییە ژمارەیەکی زۆر لە نووسەران هەر نەوێرن بە ئەندازەی پێویست بیر بکەنەوە،لەوانەیە هەر ئەو نەوێرانە وایکردبێ لە دەربڕینی ئەو بابەتەی مەبەستیەتی سەرکەوتووبێ.

باس و گفتوگۆ لەسەر بیرکردنەوە و بڕوای فەلسەفی و کۆمەڵایەتی، یان هەڵسەنگاندن و دەربڕینی دەرەنجامە مێژووییەکان، لای نووسەری کورد زۆر کەمە. ئەوەی هەشە زۆر لاوازە و روخساری دیار نییە ، باش تێتناگەیەنێ. بە ساکار و جۆرێک لە دواکەوتوویی دێتە بەرچاو. لە دەربڕین و بیرکردنەوەدا زۆر لە دوای سەردەمی خۆیەتی. لەلایەک زۆر راڕاو سادەیە و لەبیرکردنەوەدا قەناعەت بە بەرامبەرەکەی خۆی ناهێنێ. ئەوەش وایکردووە هەر خۆی بە سروشت گۆشەگیر و

پاشکۆ بێت. واته یان به یەکجاری لادەچێ و دروشمی تەنیایی و دوور لەهەموو رووداوێک هەڵدەگرێ. یان یەکسەر دەبێتە مرۆڤێکی بێ ئیرادە و پاشکۆ و پێهەڵاگۆ. هەڵبەت ئەم دووسیفەتەش لە هەموو کۆمەڵێکدا بەتایبەتی لە کۆمەڵی کوردستاندا زۆر پەسند نییە.

هەندێک لە نووسەران، دەڵێن ئێمە وەک پێویست بیرمان کردۆتەوە و نووسیویشمانە، بەڵام جارێ وەختێ کە مردم با ئەوکات بڵاوبکرێنەوە. جا لەلایەک کێ دڵێ ئەوانە راست دەکەن، لەلایەکی دیکە ئەگەر راست بکەن، دیارە بڕوا بە نەسڵی خۆیان ناکەن، شتێکی دیاریشە هەر مرۆڤە لە زەمانی خۆی و لەگەڵ نەسڵی خۆی دەژێت.

سیفەتێکی دیکەی زۆر ناحەز لە نووسەری کورددا نەوێرانە لە بەرەنگاربوونەوەدا. واتە کاتێک بڕوایەکی خۆی دەردەبڕێ و بڵاویشی دەکاتەوە، جورئەتی پێویستە تا لەسەری سوور بێ و لێی پاشگەز نەبێتەوە. بە داخەوە تۆبەکاران لەناکاو نووسەرانی کورددا کەم نین.

ئەو سیفەتانەی باسیان دەکەم، تەنیا تایبەت بە کوردستان نین، بەڵکو کاتێک روو لە هەندەرانیش دەکەن ئەو سیفەتانەیان هەر دەمێنێ. بۆیە سەرەڕای بوونی ئازادی و پاراستن ، شتێکی نوێ لە نووسەرانی کورد نابیندرێ.

نووسەری کورد هەند بێجۆرئەتن، تەنانەت ناتوانن دیفاع لە خۆشیان بکەن.

هەر بۆیەش وەک لە بواری بیرکردنەوەدا جێ پەنجەیەکی ئەوتۆیان بەسەر فیکردا نیە، نەیانتوانیوە لە بواری سەکۆ و سەندیکاکانیشیدا هیچ بۆخۆیان بکەن. بەبێ دەربەستی دەڵێم ترس و دواکەوتن پانتاییەکی زۆری لە کەسایەتی نووسەری کورد داگرتووە.

١٩٩٧/٢/٥

[٩]

# تۆ بڵێی پێویستمان بەبێ هەڵوێستی بێت؟

لەم رۆژانەدا زۆر باس لە بوێری و نەوێری رۆشنبیران دەکرێ. لەو باسانەشدا وا لێکدەدرێتەوە کە رۆشنبیر بۆی نییە لە تەنگژە سیاسییەکاندا رای هەبێت، یان لەسەر رووداوێک هەڵوێست وەربگرێت. هەندێک پێیان وایە هەر هەڵوێستێک رەنگدانەوەی سیاسی خۆی دەبێت ورۆشنبیریش ئەگەر بیەوێ لەسەر پەیامی خۆی بەردەوام بێت، ئەوە نابێ نزیکی دنیای سیاسەت بکەوێتەوە، وەک بڵێی هەر راو هەڵوێستێکی رۆشنبیر لە بەرژەوەندی یەکێک لە دوو حزبە رکابەرەکەدایە، هەر بۆیە رۆشنبیر دەبێ خۆی لە رادەربڕین دووربخاتەوە وچاوی بەسەر خراپ بوونی دنیادا ببەستێ!

هەڵبەت کێشەی سیاسی لە کوردستاندا، لە زۆر رووەوە رۆشنبیرانی سەربەخۆی تەنگاو کردووە و جاری وا هەیە لە هەلومەرجێکی تایبەتیدا، لە ژێر کۆمەڵێک هۆکاری کارتێکراودا نووسەرێکی ناودار دوای خۆپاراستنێکی زۆر، لەسەر بەردێکی شلی بەردەبازەکەدا خلیسکێکی پێبدەن و وەک دڵێن ‹تووشی دەکەن›. پیاو لەو کاتانەدا شێوازی تووشکردنی ئەو ئافرەتانەی دێتەوە یاد کە لە کۆمەڵی نابەرابەردا هەڵیاندەخلیسکێنن. لەو جۆرە خلیسکانانەشدا رۆشنبیر بەرەو ئەو شوێنە پاڵ پێوەدەنێن، تا زیاتر نقوم بێت و ئیتر بواری پشوودان و بیرکردنەوەی نەمێنێ.

ئەمەیان جۆرێکی ناشیرینی ئەو ستەمەیە کە دەرهەق بە رۆشنبیران دەکرێ، لەلایەکی دیکەشەوە کاردانەوەی رۆشنبیران لە بەرامبەر باری سیاسی وڵاتەکەدا زیاتر خۆ گۆشەگیرکردن دەبێ.

هەڵبەت رۆشنبیر وەک هەر مرۆڤێکی زانای ئەم وڵاتە، بۆی هەیە لە کێشەی سیاسیدا بەشداری بکات و بە گوێرەی قەناعەتی خۆی هەڵوێست وەربگرێ، تەنانەت بەشداری لە سەرکردایەتی بزووتنەوەی سیاسیشدا بکات. لە چیکۆسلۆڤاکیا دا ڤاسلاف هاڤیل لە کۆمۆنیزمەوە بۆ دیموکراسی سەرۆکایەتی گۆڕانکاریەکانی کرد، کەچی ناوبراو نووسەرێکی شانۆیە. بۆیە ئەو بۆچوونە هەڵەیە کە پێیوایە رۆشنبیران نابێ لە سیاسەتدا بەشدار بن، پێچەوانەی ئەم رایە راستیەکەیە، واتە بزووتنەوەی سیاسی کاتێک لە ناماقوڵێتی دوور دەکەوێتەوە و بە شێوەیەکی شارستانی بەڕێوەدەچێت کە رۆشنبیران تیایدا بەشدارییەکی زۆریان هەبێت.

لەلایەکی دیکەوە، زۆر لە رۆشنبیران نایانەوێ هەڵوێستی حزبیانەیان هەبێت و زیاتر بەکاری رۆشنبیریی خۆیانەوە خەریک دەبن، ئەمەش نابێ بەو مانایە بێت کە هیچ هەڵوێستێکی سیاسیان نەبێت، یان لە هەڵوێست وەرگرتندا دوور بکەونەوە، تا هێڵی هاوبەش لەگەڵ یەکێک لەو دوو حزبەی رکابەرایەتی یەکدی دەکەن، دروست

نەبێت،.بەرای من رۆشنبیران لە کاتی پێویستدا ، لە روانگەی بەرژەوەندیی گشتیدا، نابێ لە هەڵوێست وەرگرتن سڵ بکەنەوە، لەوەش نەترسن کە رەخنە ئاراستەی کام لایەن دەکەن، یان ئەم هەڵوێستەیان بە شێوەیەکی کاتی لەوانەیە لەگەڵ فلان لایەن یەکبگرێتەوە. خۆ نابێ لە بیرمان بچێ کە دەبێ کۆتایی بەم تەنگژە سیاسییە بێت وهێمنی بۆ وڵاتەکەمان بگەڕێتەوە. ئەم کۆتایی هاتنەش ئەگەر بمانەوێ بە ماقووڵی بێت، دەبێ بەشدارییەکی ماقووڵی تێدا بکرێت. هەڵبەت لە مێژووشدا کەم نین ئەو هەڵوێستە ماقووڵانەی باجیان بەدواوە بووەو رۆشنبیران ئازاریان لەسەر چێشتووە؛ بۆ نموونە هەڵوێستی (یەشار کەمال) لە بەرامبەر سیاسەتی تورکیا، (گارسیا مارکیز) لە بەرامبەر کۆلۆمبیا، (عەزیز نەسین) لە بەرامبەر کێشەی سەلمان روشدی، لە سیاسەت بە دوور نەبوون.

١٩٩٧/٣/٥

[١٠]

# داهێنان بەبێ شەرتی چەقۆ

قسەیەکی زۆر کۆن هەیە دەڵێ، نووسەران لە ژێر سانسۆردا، لە داهێنان دەچنەوە. گومان لەم قسەیەی سەرەوە ناکرێ کە ئازادی رادەربڕین و ئازادی لە هەڵبژاردنی شێوازدا، لە پێداویستییە سەرەتاییەکانی هەر نووسەرێکن. مرۆڤ پێویستە هەست بکات راوناندرێ و بەرژەوەندیشی ناکەوێتە مەترسییەوە ئەگەر هاتوو بە ئازادانە بۆچوونە ئەدەبییەکانی خۆی لەو شێوە هونەرییەی بەباشی دەزانێت، دەربڕی.

لە کوردستاندا حکومەت رێگە لە ئازادی بیروڕا دەربڕین ناگرێت و هیچ دەقێکی یاساییش سنوور بۆ کاری داهێنان دانانێ. ئەوەی من باسی دەکەم سانسۆری شاراوەی وەزعی سیاسییە لە کوردستاندا.

هەر نووسینێک جا چ ئەدەبی بێت، یان رادەربڕین و لێکۆڵینەوە، ئەگەر رەخنەی لە یەکێک لە باڵە سیاسییەکان گرت، ئەوە زۆر بە ئاسانی دەکەوێتە بەر پەلامار، بۆ ئەوەش چەندان جۆر فرت و فێڵ و هەڵگێڕانەوە لەسەر نووسەراندا پێڕەو دەکرێت. لەم دواییەدا لێکۆڵینەوەی ئایینی و کۆمەڵایەتی و فەلسەفیش هەڕەشەیان بۆ دروست کراوە، بۆیەش هیچ نووسەرێک لەو بوارانەدا جورئەتی بیرکردنەوە بەخۆی نادات. لە کوردستاندا هەر حزبە جۆرێکی تایبەت بە سیاسەتی خۆی، خۆی بەخاوەنی بەشێک لە فیکرو ئەندێشەی مرۆڤی کورد دەزانێت و بەکەسیشی رەوا نابینێ سەربەستانە بیر بکاتەوە.

هەر لەو باسەدایە بەدرەنگەوە لەو وتەیەی یەکێک لە نووسەرانی هەولێر گەیشتم کە دەیوت: سێ رۆمانم هەیە و هیچیشیان بڵاوناکەمەوە، چونکە هەریەکەی لایەنێکی دەسەڵاتدارم لێ دەوروژێنێ.

ئێمە لە کوردستاندا وا بەتاقیکردنەوە فێری حکومەت بەڕێوەبردن دەبین و بەتەجرەبەش تێدەگەین کە شەڕی ناوخۆ بەهیچ جێگەیەکمان ناگەیەنێ و بەتەجرەبەش هەڵبژاردنمان کرد، بەڵام ماویەتی تا تێدەگەین هەموو ئەوانەی سەرەوە کاتێک داهێنانیان تێدا دەکرێ کە ئازادی رادەربڕین و نووسین بەشێوەیەکی موتڵەق هەبێت و لایەنە سیاسییەکان کۆت و بەند نەخەنە سەر دەستی نووسەران. هەر ئەو کاتیشە ئەو لایەنانە فێر دەبن ئەگەر هاتوو موناقەشەی یەکتریان کرد بەهێرشی راگەیاندن و سەرەتای شەڕی گەرمی نەژمێرن، چونکە دەکرێ لا باڵە سیاسی و فکرییەکان تێر موناقەشەی یەکتر بکەن و رەخنە ئاراستەی سەرتاپای یەکتری بکەن، بەبێ ئەوەی پەنا بۆ چەک ببەن. جا ئەگەر نابێ پەنا بۆ چەک لەبەرامبەر فیکردا ببرێت، دەبێ پیلان و دەورەدانی سیاسیش لەسەر نووسەران و

بەرهەمەکانیان لاببرێت، ئەگینا مەنتیق هەر مەنتیقی چەک دەبێ. وای بۆ حاڵی ئەو میللەتەش کە بزووتنەوە سیاسییەکەی، رەخنەو گفتوگۆی لە «فریزەر» هاوێشتبێ.

١٩٩٧/٥/٥

## [١١]

# «فروغ» باشە بەڵام نامانەوێ

باس لە ئازادی ئافرەت کردن، بەشێکە لە فکری پێشکەوتنی کۆمەڵایەتی. زۆریش روونە کاتێک باسی ئازادی ئافرەت دەکرێ، مەبەست ئازادکردنی نیوەی ئەو کۆمەڵەیە کە نیوەکەی دیکەی بە «ناو» ئازادە. بەکردەوە سەلمێندراوە هەرگیز نیوەی کۆمەڵ بەتەنیا ناتوانێ کەڵک لە ئازادی وەربگرێ، هەروەک چۆن ئەو میللەتەی کە دەسەڵاتە سیاسییەکەی خۆی میللەتێکی دیکە دەست بەسەر دەکات، ناتوانێ خۆیشی ئازاد بێت.

مرۆڤ خۆی ئازاد نەبێ چۆن بژی و چۆنیش بەشداری ژیانی کۆمەڵایەتی بکات؟. ناتوانێ داهێنەر بێت، دەبێتە سەربارێکی رەزاقورسی کۆمەڵ، نەمێشکی کار دەکات و نەدەستیشی بەرهەم دێنێت. وڵاتی ئێمە راست لەو حاڵەتەدایە، جێگای خۆشحاڵی نییە.

ئافرەت لە وڵاتی ئێمەدا وەک زۆربەی دەوروبەر نەک هەر ئازاد نیە و زەمینەش بۆ ئەو ئازادییە تەواو نەڕەخساوە، بەڵکو بەشێکی زۆر لە نیوەکەی دیکەی کۆمەڵیش بەکۆتی ئەوانەوە بەندەو بەم چەشنە شتێک بەناوی ئازادی مرۆڤ لەناو کۆمەڵی کوردەواریدا بوونی نیە.

لێرەوە دەچمەسەر مەبەستی سەرەکی، ئەویش کاری داهێنانی و هونەری و فیکرییە لای ئافرەتی کورد، دیارە کە بۆچی نیوە بەندەکەی کۆمەڵی کوردەواری داهێنانی لێ ناوەشێتەوە. ئەوەش کاتێک بە باشی دەردەکەوێ کە مرۆڤ چاو بە بەرهەمی ئافرەتە قەڵەم بەدەستەکانی وڵاتەکەماندا دەگێڕێ. نووسینی ئەوانە زیاتر لە پرۆژەی ئەو گەنجە کوردانە دەچێ کە دەیانەوێ تازەو بەبێ کامڵ بوون بکەونە دنیای ئەدەب و هونەر. هەڵبەت سنووری ئازادی لای کوڕە گەنجێکی بێ ئەزموون زۆر زۆر لەو قەیرە ئافرەتە فرەوانترە کە دەیەوێ بەکەزی سپییەوە کاری ئەدەبی، یان هونەری خۆی پەرە پێ بدات. هیچ کاتێک شاعیرێکی ئافرەت ،وەک شاعیرێکی پیاو جورئەت بەخۆی نادات لە خەیاڵی خۆیدا بکەوێتە داهێنان، چونکە ژیانی کۆمەڵایەتی ئەو زەمینەیەی بۆ نەڕەخساندووە. خۆ ئەگەر نیازی یاخی بوون و بەرەنگاربوونەوەشی هەبێت، ئەوە داب و نەریتی باو دوور نییە «داغی» بکات. هەر زمان و پەنجەیەکیش داغ بکرێت، چاوەڕوانی ناسکی و نەخشاندنی لێ ناکرێت.

ئێمە یەک ساڵمان بەسەر تەمەنی (رامان)دا گوزەراند. لەزۆر رووەوە جێگەی پەنجەمان دیارەو بەشایەتی رووناکبیرو خاوەن بیرانیش توانیومانە لە بواری ئەدەب و هونەری پیاواندا مێرووله بخەینە گۆمێکی مەنگ. لەو بوارەشدا زۆر رێزمان

لێگیراوەو بەباشی هەڵسەنگێندراوین. پێیان وتووین :ئافەرین بۆ ئازادیتان. بەڵام لە کۆتایی ئەمساڵەدا ئەوەی سەرنجی راکێشام بەشداری زۆر کەمی نیوە بەندەکەی کۆمەڵی کوردەوارییە، هەڵبەت چەند هەوڵێکی نیوەچڵمان داوەو چەند قەڵەمێکی ئافرەتی بوێریش بە ئەندازەی توانای خۆیان بەشدارییان کردووین، بەڵام گلەیمان لەخۆمان و لە واقیعەکە ئەوەیە: نەمانتوانیوە بەتەواوی ئەو دەستە نەخشێنەرانە بگرینەوە کە لە شل و کوتیدا خەریکە بەردەبنەوە. گەروا نەبوایە ئازادی و بوێرییەکە پڕ بە باڵای گۆڤارەکەمان دەبوو.بەخۆڕیی نیە خوێنەری کورد حەز دەکات شیعری شاعیرانی ئافرەتی وەک «فرووغی فەرووخزاد»ی بۆ بکرێتە کوردی.. خۆزیا وا نەبوایە..!

١٩٩٧/٦/٥

[١٢]

# له دنیای بچووكدا .. ئەدیبی گەورە هەڵدەکەون

له واقیعی ئەدەبی ئێمەدا دوای شیعر، چیرۆک پانتاییەکی بەرفراوانی داگیرکردووە. هەر چەند تا ئەم رۆژگارەش شیعر زیاتر لەگەڵ زەوقی گشتیی هەڵدەکات، بەلام لە رووی کاریگەرییەوە بۆ سەر ژیانی کۆمەڵ، گومانی تێدا نییە چیرۆک رۆڵی یەکەم دەگێڕێ.

رۆمان لە ئەدەبی کوردیدا ساوایەو کەمترین پانتایی داگیرکردووە، هەرچەند ئەگەر هاتوو رۆمان پانتاییەکی گەورەتر وەربگرێت، له ژیانی کۆمەڵدا کاریگەری گەورەشی دەبێ..

ئەدەبی کوردی زیاتر بە شاعیرەکانییەوە ناسراوە، چیرۆکنووس و رۆمانووسی ئێمە لە دەرەوەی خۆمان ناویان نابیسترێ. هەڵبەت ئەوەش جێگەی داخە ئەگەر مەبەستمان کەمکردنەوەی رۆڵی شیعر نەبێت.

شیعری کوردی تێکەڵاوی شۆڕش و راپەڕینەکانی میللەتەکەمان بووە، بەلام پاشکەوتوویی ئابووری و کۆمەلایەتی میللەتی ئێمە، تەکنیکێکی شیاوی نەداوەتە دەست هونەرمەندان، تا بەرهەمی چیرۆکنووس و رۆماننووسەکانمان بخەنە بەرچاوی خەڵک و ئەو کاریگەرێتییەی هەبێت کەوا لێی چاوەڕوان دەکرێ. شیعر بە سروودو خوێندنەوە دەگاتە خەڵک، بەلام کاتێک سینەما و شانۆو تەلەڤزیۆن نەبن، ئەوە چیرۆک هەرگیز دەرناکەوێت. دوای نەبوونی سەربەخۆیی میللی و ئازادی رادەربڕین بە درێژایی مێژوومان، ئەوەی سەرەوە (تەکنیک) بە پلەی دووەم دێت.

ئازادی رادەربڕین و هەست بە دڵنیایی کردنی نووسەر، رۆڵێکی زۆری لە بەرهەمە ئەدەبییەکاندا هەیە و لەوانیشدا چیرۆکنووس بە ئەندازەیەکی زیاتر پێویستی بەو ئازادییەیە.

لە کوردستانی دوای راپەڕیندا، قۆناغێکی نوێ لە ژیانی مرۆڤی کورد دەستی پێکرد، بەلام رەنگدانەوەی ئەم قۆناغە کەمتر بە چیرۆکی کوردییەوە دیارە. من مەبەستم ئەوە نییە چیرۆک هێندە سادە بکەمەوە کە بە پێهەڵاگوتنی دەسکەوتەکانەوە خەریک بێت، لە هەمان کاتدا پێویستە ناوەڕۆکی ژیانی سیاسی و کۆمەلایەتی ئەم قۆناغەش بەدەربخات.

لە زۆربەی چیرۆکەکانی ئەم ژمارە تایبەتییەی (رامان)دا، باسێکی دوای راپەڕین هەیە، بەلام ئەگەر خۆت لە کوردستان نەژیا بیت، ئەم چیرۆکانە ناتخەنە بەردەم واقیعەکە، لەوانەیە ئەمە سەرنجی تایبەتی من بێت، یەکێک لە باشییەکانی ئەم ژمارە

تایبەتییە لەوانەیە خستنەوە بەرچاوی نووسەران بێت، کەوا تا چ ئەندازەیەک توانیویانە لە ئاست واقیعەکەدا بن، لەهەمان کاتیشدا ئەو ئابلوقە رۆشنبیرییەی بەسەر کوردستاندا سەپاوە، لە چیرۆکەکاندا دەردەکەوێ کە لەرووی تەکنیک و ئەزموونی ئەم دە ساڵەی دواییە لە بواری چیرۆکنووسیدا، نووسەری کورد چەند لە دنیای دەرەوە دابڕاوە، ئەو دنیایەی لەم کۆتایی سەدەی بیستەمەدا « بەگوندێکی بچووک» ناو دەبرێ. هەڵبەت لەو گوندە بچووکەشدا «ئەدیبی گەورە» بە ئاسانی هەڵدەکەون، بەلام ئەدیبی سەردەمی خۆیان.

١٩٩٧/٧/٥

[١٣]

# دەبێ ویژدانی زیندوومان بپارێزین

ئێستا لە کوردستاندا، جموجۆڵێکی رۆشنبیریی شایانی باسکردن هەیە، باشییەکەیشی دەگەڕێتەوە بۆ وەزارەتی رۆشنبیریی و دەزگاکانی رۆشنبیریی لە دهۆک وهەولێردا کە بەکاری بلاوکردنەوە خەریکن. هەر بۆیەش رۆشنبیران خەریکی دەرخستنی بەرهەمەکانیانن کەوا بۆ حەوت ساڵ دەچێ تۆزیان لەسەر نیشتووە.

لە هەولێری پایتەخت، لە چەندین تریبۆنی جۆراوجۆردا بوار بە رۆشنبیران دراوە بیروڕاکانی خۆیان دەرببڕن، بەمەیش کەشێکی هەستپێکراو لە گۆڕینەوەی بیروڕاو دەرکەوتنی رەوتە فکری و ئەدەبییە جیاجیاکانەوە دروست بووە. لەبەر ئەوەشە جارجار دەنگی رۆشنبیران لەسەر ئەو دیاردە و رووداوانەی سەرنجیان رادەکێشن، دەبیسترێ،. زێدەگۆیی نییە ئەگەر بڵێین خەریکە بەستەڵەکەکە دەشکێندرێ. جا لە حاڵەتی ئاوهادا، ویژدانی سەردەم کە رۆشنبیرانن جیا لە بەشداری کردن بۆ پێگەیاندنی بیروڕا وزەوقی گشتی، لە رووداوەکانیشدا بێهەڵوێست نەبن.

تا بەر لەماوەیەک ،هەموو لایەک گلەییان لە رۆشنبیران دەکرد کە بۆچی بێدەنگ و بێ هەڵوێستن؟. وەڵامەکەی بە ئاسانی دەبیسترا کە وایدەگەیاند: دەنگی رۆشنبیر بەرهەمەکانیەتی و هەڵوێستیشی ئەو کاریگەرێتە دەبێ کە دەیخاتە سەرهەوڵێستی خەڵک.

لە پایتەخت و ناوچەکانی دیکەی ژێر دەسەڵاتی حکومەتی کوردستان، نیمچە ئازادییەک بۆ رۆشنبیران دەستەبەرکراوە و کەرستەی بە کردەوە کردنی ئەو ئازادییەش لەو تریبۆنانەدا دابین کراوە کە رێگەی بلاوکردنەوەی بەرهەم دەدات و بوار بۆ رۆشنبیران خۆش دەکەن.

لەم دواییەدا لە سلێمانی ژمارەیەکی زۆر لە ئەیب و رۆشنبیر و هونەرمەندە ناودارەکانمان لەسەر لاپەڕەی رۆژنامەکانی یەکێتی نیشتمانی، هێرشیان کرایە سەر و سووکایەتییان پێکرا. هۆیەکەشیان بۆ گوفتارو کرداری بێلایەنانەی ئەو رووناکبیرانە دەگێڕایەوە.

ئەو هێرش و سووکایەتیکردنە، سکرتێر و ئەندامانی سەرکردایەتی یەکێتی نیشتمانی کردیان و من نامەوێ پەرەگراف لە قسەکانیان وەربگرم، چونکە بە پێویستی نازانم.



ئەم هەڵوێستەی سەرکردایەتی یەکێتی، بە پێشێل کردنی بە ئاشکرای مافی

دەربڕین و بڵاوکردنەوەی ڕۆشنبیران و هونەرمەندان دەژمێردرێ و ئاشکراترین جۆری پێشێل کردنی مافی مرۆڤە.

ڕۆشنبیرانی کورد موڵکی هیچ حزبێک نین وناشبنە زۆڕنای سیاسەتی ڕۆژ، ئەوانە سامانی مەعنەوی و ڕۆشنبیری ئەم وڵاتە ڕەنج دیتوەن. دەستدرێژی کردنە سەریان لە مێژوودا بە **خەتی ڕەش** تۆمار دەکرێ. پێویستیش ناکات بیگێڕینەوە: هاوار بەحاڵی ئەو سیاسەتەی دەست بخاتە گەرووی ڕۆشنبیرانەوە، چونکە دەمێکی بە قەد هەموو مێژووی بەرەنگاری تواندنەوەی نەتەوەیی و دەنگێکی بەهێزی وەک هاواری ئەنفالکراوەکانی بەڕوودا هەڵدەزۆقێتەوە.

ڕۆشنبیران نە فێڵیان لێدەکرێ و نە دەمیان دەگیرێ. هەر ئەوانیش پێوەر ونیشانەی ڕادەی پێشکەوتنی هەر ڕەوتێکی ناو کۆمەڵن، جا چ کۆمەڵایەتی بێت، یان لاباڵێکی سیاسی.

کێبەرکێ لە هەموو بوارەکانی سیاسی و سەربازیدا فێڵی تێدا بکرێ، ئەوە لە بواری ڕۆشنبیریدا غەش و فڕوفێڵ هەڵناگرێ.

١٩٩٧/٨/٥

[١٤]

# بۆ ئەوەی ون نەبن ، پێویستە خۆیان بپارێزن

ژمارەیەکی زۆر لە نووسەرانی کوردستان، ئاوارەییان هەڵبژاردووە لە وڵاتانی ئەوروپا پەراگەندە بوون. لەو ژمارە زۆرەشدا چەند کەسێک نەبێ ئەوانی دیکە گشتیان دوای راپەڕین بە ئارەزووی خۆیان وڵاتیان بەجێهێشتووە.

دیارە لە کارکەوتنی دەزگا ئیداری و ئابوورییەکان، بووە مایە بێکاربوونی زۆربەی هەرە زۆری رۆشنبیران و هەموویان کەوتنە بەردەم هەڕەشەی برسێتی. هەروەها بەردەوامی شەڕی ناوخۆش بە تەواوەتی ئاسۆی لەبەردەمیان لێڵ کرد. لەلایەکی دیکەش کەمبوونی ئازادی، ئازارێکی کوشندەی دیکەیە. ئەوکەسەی سکی برسی بێت و زمانی بەسترا بێت، ناکرێ گلەیی لێبکرێ کە وڵاتەکەی جێدەهێڵێت.

پرسیار ئەوەیە :لەو بەجێهێشتنەدا چی زیاتریان بەدەست هێناوە؟ لە ئاوارەییدا نانێکی نەمر و نەژین دەست دەکەوێت، بەڵام ئەمەیان نەبووەتە مایەی داهاتێکی حەزراکێش.

لە رووی ئازادییەوە کەڵکێکی ئەوتۆیان وەرنەگرتووە، چونکە زۆربەیان بە درەنگەوە فێری زمان دەبن و زۆر درەنگیش دەتوانن بە زمانی بێگانە کەڵک وەربگرن، کە ببێتە مایەی پێشکەوتنی خۆیان. هەر بۆیە دەکرێ بڵێین زۆربەیان هەر لەو ئاستەدا وەستاون کە سنووری کوردستانیان پێی بەزاند. ئەوەش تووشی تەنگژەی داهێنانی کردوون، چونکە دواکەوتوون.

بوونی کورد لە دەرەوەی کوردستان، نەبووەتە جالیەیەکی دەوڵەمەند و خاوەن هیچ پێگەیەکی ئابوری نیە، هەر بۆیەش هیچ ناوەندێکی راگەیاندن و رۆشنبیری لە دەرەوە نابینرێ کەوا نووسەران بتوانن لەوێدا بەرهەمەکانیان بڵاو بکەنەوە. ئەو هەوڵەی دراویشە بۆ تەقەللای چەند رۆشنبیرێک دەگەڕێتەوە کە نەیتوانیوە بۆشاییەکە پڕ بکاتەوە.

بەڕای من، نووسەرانی ئاوارە بۆ رزگار کردنی خۆیان وەک ***داهێنەر*** تەنیا یەک رێگەیان لە پێشە ئەویش گەڕانەوەیە بۆ وڵات. ئەگینا ئەم وەچەیەی ئێستا کوردستانی بەجێهێشتووە لە ساردوسڕی ئاوارەییدا وشک دەبێ و لە بیر هاوزمانەکانی خۆی دەچێتەوە.

ژمارەیەک - هەرچەند کەم- لە نووسەران و رۆشنبیران، رێگاکەی دوایان هەڵبژاردووە و هاتوونەتەوە ناو وڵات. پێموایە ئەمە هەنگاوی یەکەمی ئەو جموجۆڵەیە

که دەبێ پێچەوانەکەی روو بدات، ئەویش :هاتنەوەیە لە دەرەوەی وڵات بۆ ناوەوە.

ئەم هەنگاوە پێویستە، تا ون نەبن و بوونی خۆیان بپارێزن.

١٩٩٧/٩/٥

[١٥]

# مۆسیقاو پیاوی ماقووڵ

«خەنجەر پیاو دەخاتە باوەشی مەرگ و تەنبوور زیندووی دەکاتەوە.»

ئەمە قسەی رەسوڵ هەمزە تۆڤە. ژیان بە بێ مۆسیقا لە زیندانێکی بێدەنگ دەچێ. لە کۆمەڵگا خۆپارێزەکاندا، مۆسیقا بە پێویستیەکی رۆژانەی ژیان داناندرێ و مرۆڤ بۆی نییە بە ئارەزووی خۆی لەگەڵ موسیقای دڵخوازی خۆی تێکەڵ بێت.

هەر وەک چۆن هەموو کەس بە خۆیرەوا نابینێ شایی بکات یان گۆرانی بڵێتەوە. هەر بۆیە پەرەسەندنی مۆسیقا پێوەندی راستەوخۆی بە پێشکەوتنی کۆمەڵەوە هەیە. لە کۆمەڵگا دواکەوتووەکانی لەبابەت ئێمە، دەوروبەر تێکەڵ بە پێوەندی مرۆڤ و مۆسیقا دەبێ و جۆرێک لە دوورەپەرێزی و خۆپارێزی دەسەپێنێ. هەر بۆیەش لای زۆربەی هەرە زۆری خەڵک باوە کەوا مۆسیقا وگۆرانی تایبەتە بە هونەرمەندانی بورای خۆی و «پیاوی ماقووڵ» دەبێ بە «ئەدەبەوە» لە گەڵ مۆسیقا رەفتار بکەن. دەوروبەریشیان پێویستە بە ماقووڵێیتی ئەوان بجووڵێنەوە. واتە نابێ مۆسیقا بیانهەژێنێ و «مرۆڤی ماقووڵی» کوردەواری دەبێ رکە لەگەڵ هەژاندنی مۆسیقا بکات. سەرەرای ئەوەی لە ناخەوە خۆی لەبەر ناگرێت، بەڵام لە رواڵەتدا پێویستە بەرەنگاری ببێتەوە و بۆ دەوروبەر بیسەلمێنێ کە مۆسیقا و گۆرانی کار لەو ناکەن، دروست وەکو بەرد.

هەڵبەت لە کۆمەڵێکی ئاوها خۆپارێزدا، هونەری مۆسیقا بە تەواوی بواری بۆ نارەخسێت تا توانا هونەرییەکان دەربخات. بۆیەش لە کوردستاندا بە ماندوبوونێکی زۆر هونەرمەند پێدەگات و بۆ پێشکەش کردنی بەرهەمەکانیشی هاوکاری پێویست ناکرێت.

ئەوە جیا لەوەی جەمهووری مردوو و بێدەنگ، گەورەترین سەرکوتکارەوەی هونەرمەندانی مۆسیقان.

لە وڵاتانی بچووکی وەک ئێمەدا، چارەنووس وایە؛ ئەگەر حکومەت هاوکاری چالاکییە رۆشنبیری و هونەرییەکان نەکات، خودی ئەو هونەرە ناتوانێ لەسەر ئاستی بازار و جەمهوری خۆی پێشکەوێت و هونەرمەندانیش بە هونەرەکەیان لە جیاتی تێربوون، برسیتر دەبن.

واقیعی مۆسیقای کوردی، وەک هەموو بەشەکانی دیکەی رۆشنبیریی، پتر لە کارەسات دەچێ و تووشی پاشکەوتنێکی زۆر هاتووە. دەزگاکانی تەلەفزیۆن و رادیۆ توانای بەهانا هاتنی هونەرمەندانی بواری مۆسیقایان نییەو هۆڵ و هوتێلەکانیش

لەوە ویرانترن بۆ ئەم مەبەستە بەکار بهێنرێن. لەو کاتەیدا دنیا بووەتە گوندێکی بچووک و رۆژانە خەڵک شێوەی نوێی مۆسیقای جیهانیان دەبیستێ، مەیدانی مۆسیقای خۆیی بە چۆڵ دەبینێ، هەر بۆیە بۆشاییەکی گەورە لە زەوقی گشتیدا خولقاوە.

ئەوەی هەست پێدەکرێ، لە ناو کۆمەڵێک ئاستەنگدا دوویان بە زەقی دیارترن: یەکێک نەبوونی داودەزگای تایبەت بەهاوکاری کردنی هونەری مۆسیقا لە کوردستان، ئەوەی دیکەیان خۆپاریزی مرۆڤی کورد لە رەفتار لەگەڵ مۆسیقادا. ئەگەر گرفتی یەکەمیان چارەسەر بکرێ، زەمینەیەکی لەبار بۆ دزر خستنە ناو دووەمیان دەرەخسێنێت.

١٩٩٧/١٠/٥

[١٦]

# تیرۆری فیکر
# کێشەی سیاسی چارەسەر ناکات

هەوڵدان بۆ تیرۆر کردنی چیرۆک نووس حەمەفەریق حەسەن، بێزارییەکی بەرفراوانی لەناو نووسەران خوڵقاند. بۆ یەکەمین جاریش نووسەرانی دەرەوە، بەم فراوانییە لەسەر نووسەرێکی ناوەوەی کوردستان بە دەنگ دێن.

دیارە رۆشنبیرانی کوردستان ئەگەر شەڕی ناوخۆ نەیتوانی یەکدەنگیان بکات، تیرۆری سیاسی لەسەر خۆیان یەکیخستن. مەبەست یەکخستنێکە لە توانایدا هەیە ببێتە پەرژینێک لەسەر ژیان و ئازادیی نووسەرانی کوردستان.

دەبوایە هاودەنگییەکی بەرفراوانیش لەگەڵ بێزارییەکەی نووسەرانی کوردستان، لەلایەن حزب و رێکخراوە پیشەیی و جەماوەرییەکان بکرێت، چونکە لەو کارەدا مەبەست دژایەتی کردنی حزبێک نییە بەو ئەندازەیەی مەبەست داخستنی دەرگەی تیرۆر و تۆقاندنە بەسەر رۆشنبیرانی کوردستان ،بۆ ئەوەی حزبە سیاسییەکان نەیکەنە عادەت، بۆ ئامانجی سیاسی خۆیان ،دەستدرێژی بکەنە سەر رۆشنبیران وخاوەنفکران.

تۆقاندنی نووسەران لە ژێر هەر بیانوویەک و بۆ هەرە مەبەستێکی سیاسی بێت، لە کۆتاییدا دەبێتە تیرۆر لەسەر فیکر و کپ کردنی دەنگی ئازادی. جا بۆیەش دیفاع کردنی نووسەران لە خۆیان ،دیفاع کردنەلە ئازادی بیرکردنەوە. لەوەشدا هەنگاوێک لە پێشەوەی حزب و رێکخراوە سیاسییەکان بوون. لە هەمانکاتدا دەنگ بەرزکردنەوەی نووسەران، بێدەنگییەکەی حزب و رێکخراوە سیاسییەکانی زەقتر کردووە و بەمەیەش دەستەوایی یەکتردانەوە و لاواندنەوەی سیاسیی نێوان حزب و رێکخراوەکانی دەرخست. هەر بۆیەش بەجێیە ئەگەر رەخنەی توند ئاراستەی حزبەکان بکرێت.

لە ماوەی ساڵێکدا ئەوە بۆ جاری چ[illegible]ەمە ،لە سلێمانی لێپرسراوانی (ینک) هەڕەشە وگوشار دەخەنە سەر نووس[illegible] و رۆشنبیران. ئەوان بۆ موونافەسەی سیاسی هێرش دەکەنە سەر رۆشنبیران. ئەوەش دیاردەیەکی زۆر ترسناکە و نابێ لە کێشەی ناوخۆی کوردستاندا رێگەی بۆ بکرێتەوە. هەر بۆیە دەبێ بە بەرفراوانتر ئەم سیاسەتە تۆقێنەرەی (ینک) ئیدانە بکرێت.

١٩٩٧/١٢/٥

# [١٧]
# گۆشەگیری جۆرێکە لە نامۆیی

لە دوای مانگی سالّی ١٩٩٧، مانگی رابردوو دەنگ و باسێکی زۆر لە سەر نووسەران کرا، ئەوەش لە دوای ئەو دەستدرێژییەوە هات کە لە سلێمانی کرایە سەر نووسەرانی ئەوێ .

هاودەردی و نارەزاییەکی زۆر باش دەربڕدرا و نوسەران و رۆشنبیران دوور لە بەرژەوەندی و دژایەتی حزبایەتی، بە هاواری یەکترەوە هاتن و هەر بەو بۆنەیەشەوە دیفاعێکی زۆر باشتر لە ئازادی بیرورا کرا، چونکە لە ولاّتی ئێمەدا لە دوولاوە هەڕەشە لە نووسین و ئازادی دەربڕین دەکرا،؛یەکێک لە لایەن حزبەکانەوە کە نموونەی کاملّی ئەوەی ئەم دواییەی سلێمانییە. دووەمیان سانسۆرو چاو سوورکردنەوەی بنیاد گەراییە لە سەر ئازادی تاک و بیروراکانی.

سیمیناری دووەمی گۆڤاری (رامان) بۆ زیاتر کاکلّە پێکردنی ئەم دوو نیازەی سەرەو بوو. چونکە دیموکراسی بەبێ ئازادی بیرورا شایەنی ئەوە نییە هەر بیریشی لێ بکرێتەوە. هەولّ و تەقەللای دەزگای گولاّن و نووسەرانی هەندەرانیش تەنیا لەیەک جێگە یەکیان گرتەوە و یەکگرتنەوەکەشی راستگۆیی و بەرژەوەندی مرۆڤی کوردی تێدا بوو.

من چەند جارێکی دکەیش وتوومە کەوا یاری پێکردنی سیاسی ئەگەر لەگەلّ هەموو توێژەکانی کۆمەلّ بکرێت لەم سەردەمەدا لەگەلّ رۆشنبیران سەرناگرێ . ئەو دەسەلاّتەش خۆی ریسوا دەکات ئەگەر بیەوێ زاری نووسەران بدورێت. هەندێک لێپرسراوی سلێمانی ویستیان پاساو بۆ کردارەکانی خۆیان بهێننەوە ، پەلاماری دەزگای گولاّن و خودی منیان دا،

ئێمە دەستمان لە هیچ پیلانێکدا نەبووە تەنیا (**پلانی چاپ و بلاوکردنەوەی رۆشنبیری و کاری راگەیاندن**» نەبێت، شانازییەکە ناتوانین خۆمانی لێبەدەربخەین.

هەر بەو بۆنەیەوە، دەرکەوت کاتێک رۆشنبیران بیانەوێ دەتوانن رۆلّێکی بەرچاوی ئەوتۆ بگێڕن جێگەی رێزلێنانی خەلّکی ولاّتەکەشمان دەبێ. پێموایە ئەو هەڕەشەیەی لە سلێمانی لە نووسەران کرا و ئەو بەدەنگەوە هاتنەی رۆشنبیران لە پێناوی خۆیان کردیان، رۆشنبیرانی بە تۆبزی لە گۆشەگیری «کەمێک» دەرهێناو خستیە ناو ژیانی سیاسی و کۆمەلاّیەتییەوە.



١٩٩٨/١/٥

[١٨]

# رۆشنبیری کورد دەبێ دەرگا داخراوکان بکاتەوە

ئایا ئەدەب و رۆشنبیریی ئێمە داخراوە؟

پرسیارێکە و هەڵوێستەمان پێدەکات ، بە ناچاری دەبێ بزانین رۆشنبیریی ئێمە چەند کراوەیە، بەتایبەتی کەوا دوو ساڵی دیکە هەموو دنیا پێدەنێتە ناو سەدەی بیست و یەکەم. ئەم سەدەیەی کەوا مرۆڤایەتی بە هەموو شارستانییەتی خۆی، دەیەوێ کاتێک دەچێتە ناو سەدەی داهاتوو، زۆربەی هەرە زۆری گرفتە مرۆڤایەتییەکانی چارسەر کردبن.

بە درێژایی مێژووی چەند سەد ساڵی رابردوو، مرۆڤ لەسەر لێکتر جیابوونەوە لە شەڕو بەرهنگاری دابووە. ئێستا سەرەتای یەکگرتنەوەی دانیشتوانی جیهانە. یەکێتی ئەورووپاش باشترین نموونەی ئەم بابەتەیە. جاران ماندوبوونێکی زۆری دەویست تا رۆشنبیرێک هەندێک زانیاری لەسەر ژیان و رۆشنبیریی گەلانی دیکە پەیدا دەکرد، ئەمرۆ منداڵەکانمان بە درێژایی بیست و چوار سەعات هەموو ساتەکانی گەلانی تر دەبینن. نەک هەر رۆشنبیرەکان، بەڵکو نەخوێندەوارەکانیشمان دوا رووداوەکانی دنیا و داب و نەریت و یاخی بوونەکانی دنیای دەرەوە دەبینن و هیچ پێویستیشیان بە لێکدانەوە و گێڕانەوەی خەڵکانی دیکە نییە.

ئەنتەرنێت سەرانسەری دنیای تەنیوەتەوە و هەر کەسێک بیەوێ بە هەندێک توانا دەتوانێ رۆژنامە و رووداو و ئاکارەکانی هەموو دنیا بزانێت وکامە وێنەی سەرەنج راکێشی رووداوەکانیشە دەیبینێ. خۆ بینینی هەردوو رووخسار و دەم و چاوەکانی بەناوبانگی ئەمرۆی جیهان و بە زیندوویی دیتنی هەموو رووداوە شاد و دڵتەزێنەکانی دنیا، کارێکی ئاسانە و هەموو کەسێک لە توانایدایە بەهرەمەند ببێ.

لەم زەمانەدا هەموو سنوورەکان تێکشکاون. هەموو دەرگا داخراوەکانیش لە گرێژنە چوێندراون و لەسەر گازی پشت کراونەتەوە. دوای نیو سەدە بڕوا بۆ سۆڵژنتسەن و بۆریس پاسترناک گەڕاندرایەوەو رێز لە بت شکاندنەکانیان گیراو بوون بە نموونەی بەرز بۆ ئازادی بیرورا وشکاندنی دیوارەکانی ئایدیۆلۆژیا. ئەمەریکا سەروەری دنیایە. کەچی روداوەکانی ناو ماڵی بیل کلینتۆن خرانە سەرپەردەی تەلەفزیۆن ولاپەڕەی رۆژنامەکان. هەموو رۆژێک کوشتارە دڵتەزێنەکەی جەزایر بە چاوی خۆمان دەبینین و هەموو دنیا لە ماتەمینی شاژنی تەلاقدراوی بەریتانیا کە لەگەڵ دڵدارەکەی لە شەقامێکی پەنهانی پاریس پیاسەی دەکرد و لە پڕێکا بە کارەساتێک کۆچی کرد، بەشدار بوون. هەر ئەم شارستانییەتە پادشای بەریتانیای ناچار کرد سەری رێز بۆ بێوەژنە تەلاقدراوەکەی خۆی دانەوێنێ. هەر لە بەرهەمی ئەم سەردەمەشدا یەکێک لە

کارەساتەکانی مێژووی کورد بە هانای میللەتەکەوە هات و لە کۆڕەوی (١٩٩١) دا دنیا لە پەردەی تەلەفزیۆنەکانەوە ئاگاداری مەینەتیەکانمان بوو، هاوکاری کوردی کرد. ئەم هەلەی ئێستای بۆ رەخساند.

پێشکەوتنی تەکنەلۆژیا، چوارچێوە وشکە کۆمەلایەتییەکانی تێکشکاندووە، چونکە نە مرۆڤ دەتوانێ لە ماوەیەکی کەمدا زانیارییەکی یەکجار زۆر بەدەست بێنێ، زانیاری زۆریش بیروڕای زۆرتر و هەلوێستی زیاتر و سەرەنجام سەربەستی هەرە زیاتر بۆ مرۆڤ دەستەبەر دەکات. هەر بۆیەش کاری پاراستنی مافی مرۆڤە بووەتە دەنگی هاوبەشی هەموو دنیای پێشکەوتوو. لە «جیهانی بچووکی» ئەمڕۆدا مرۆڤایەتی ئاگای لە هەموو کەلەبەر و ناوچە لەبیرچووەکانی گێتی هەیە و هاوکاری و هەمبەستەیی مرۆڤ بە ئەندازەیەک پەرەی سەندووە کە مرۆڤ بووەتە بونەوەرێکی پیرۆز و شایستەی دیفاع کردن لە مافە تایبەتییەکانی.

لەم دنیا تازەیەدا، هیچ رۆشنبیرییەکی داخراو فرسەتی مانەوەی لە پێش نییە و ناتوانێ دەرگاش لەسەر گەلەکەی خۆی دابخات. چونکە هیچ دەرگایەک نەماوە. هەر بۆیەش هەموو هۆکارەکانی ژیان پالەپەستۆ بۆ ئەو کۆمەلانە دێنن کەوا دواکەوتوو و داخراون. مرۆڤایەتی بەرەو کراوەیی و ئازادی دەڕوات. رۆشنبیرییەکانیش دەبێ بەر لەهەموو بوارێکیتر سنوورەکان هەلگرن و زەمینەی مەعنەوی بۆ پێشکەوتن برەخسێنن.

بۆیە پێمـوایە ئەدەب و رۆشنبیری کوردیش ناتوانێ بەم داخراوەییەی ئێستـە بمێنێتـەوە. چونکە وا لەناو مـالەکـانمان زەنگی سنوورشکاندن لێـدەدرێ و گەنجەکانیشمان لە هەلپەی تێکەل بوون لەگەل دنیای دەرەوەدان. ئەم کۆچکردنە بە کۆمەلەی لاوەکانمان بەشێکی زۆری بۆ خواستی سەردەمەکەمان دەگەڕێتەوە.

جا بۆیە لە جیاتی ئەوەی دەرگاکانمان بشکێنن، خۆمان بیانکەینەوە باشترە لە هیچ دیاردەیەکی رۆشنبیری گەلانی دیکە نەترسین، چونکە تەنانەت لایەنە سەلبیەکانیش وردە وردە جێگەیان لەق دەبێ و روخسارە ئیجابیەکان دەچەسپێن. لەوانەیە لە سەدەی بیست ویەکەمدا مرۆڤ داوای هاوولاتێتی جیهانی (المواطنە العالمیە) بکات و لە چوارچێوەی بەرتەسکی نیشتمانی دەرچێت. نابێ چیتر لە رەخنەو گازاندەی دیاردە کۆمەلایەتییە کۆنەکان بترسێین، تا دەتوانین دەبێ پشتیوانی سەربەستی مرۆڤ بین بەرەو پێشکەوتن، بووژانەوەی کۆمەلایەتی لەو کاتەدایە رۆشنبیری لە تەنگژە دەردەچێ و تەعبیر لە خواست و بەختەوەری مرۆڤ دەکات. چونکە شالاوی رۆشنبیری و زانیاری وا دەرگاکانمان لە گرێژنەدەبات.

١٩٩٨/٢/٥

# [١٩]
# قەیرانی دەق

نووسەری کورد لە گشت بوارەکانی ئەدەبی و سیاسی و کۆمەڵایەتی و فەلسەفیدا، ژمارەیەک ئاستەنگی ئەوتۆی لەبەردەمدا هەیە کە بواری بڵاوکردنەوەی بەرهەمەکانی لێدەسەنێتەوە.

کەمی دەرفەتی بڵاوکردنەوەی **دەقە** فیکری و سیاسی و ئەدەبییەکان ،تەنیا هەر لەبەر هۆکاری مادی نییە، واتە تەنیا نەبوونی چاپخانە و بازاڕ نییە، بگرە **قەدەغە** لە هەندێک بواردا ئاستەنگێکی زلی دیکەیە کەوا نایەڵێ نووسەری کورد، وەک خۆی دەیەوێ دەقەکانی خۆی بڵاو بکاتەوە، بەبێ ئەوەی هیچ هەڕەشەیەک لەسەر بەرژەوەندی و گیانی هەبێت. هەربۆیەش جۆرێک لە خۆپاراستن بە نووسینە کوردییەکانەوە دیارە و نوسەر ناچارە لە شێوازی خۆیدا شوێنی بۆ بکاتەوە.

لە وڵاتێکی بچووکی وەک کوردستان ،کە گشت سەرمایەکانی بواری بڵاوکردنەوە لە دەست حزبەکان و حکومەت دایە، ئەوانیش لە تەنگژەیەکی کوشندەی وەک ئێستادا بەسەر دەبەن، بواری بڵاوکردنەوەی، جیا لە کەمبوونەوەی، خستووەتە ژێر ژمارەیەکی زۆر پێوەرو تێڕوانینی جیاجیا.

ئەوەش ژمارەی **قەدەغەکانی** لەسەر نووسەران یەکجار زۆر کردووە. هەر ئەو هۆکارەشە مۆرکی ئازاد بیرکردنەوەی لە رووخسار و ناوەرۆکی بەرهەمەکانی نووسەری کورد کەم کردۆتەوە.

جیا لەوەی ئێستا لە کوردستان زۆر نووسەری سیاسی و ئەدەبی و فیکری هەن نووسینەکانی خۆیان بۆ دەرفەتێکی دیکە -کەوا دیار نییە کەی دەبێ- هەڵگرتووە. ئەمەش قەیرانێکی دیاری بۆ دەقە کوردییەکان خوڵقاندووە.

ئایا بەراستی لە کوردستاندا قەیرانی دەق هەیە؟

زۆر کەس ئەم پرسیارەی کردووە . من پێموایە واقیعەکە ئەوەندە دیار و تاڵە کە گومان هەڵناگرێت، قەیرانێکی کوشندە بۆ دەقەکانمان هەیە. ئەم قەیرانە لە نووسینی سیاسیدا زۆر بە ئاشکرا دیارە ودەیان نووسەر و سیاسەتمەدار راستییەکانیان لە توێی نووسین و بیرەوەرییە بڵاونەکراوەکاندا شاردۆتەوە . هەندێکی دیکەش پێیانوایە هەر پێویست ناکات بنووسن، چونکە هەرگیز بڵاو ناکرێتەوە!.

هەڵبەت لە بواری ئەدەبی و فیکریشدا هەمان دەرد هەیە و دەقەکان بەسەر یەکتریدا کەوتوونەتەوە و ***سانسۆر و تیرۆرێکی رانەگەیەنراوی سیاسی و ئایینی و کۆمەڵایەتی دەرگای بەسەریاندا خستووە***. ئەوە لەکاتێکدایە کەوا کۆمەڵەکەمان

لەتەنگوچەڵەمەیەکی قووڵی سیاسی و فیکریدا دەژێت و جۆرێک لە بێ ئومێدی و ڕەشبینی وەک دیاردەیەکی هاوبەشی گشت قەیرانەکانی دنیا، لە کوردستانیش لە پەرەسەندندایە و قەیرانی دەقەکان، ڕۆژانە لە درێژایی و پانتایی قەیرانە گشتییەکە زیاد دەکات.

لە کوردستان قەیرانی دەق دیاردەیەکی کوشندەیە.

١٩٩٨/٣/٥

[٢٠]

# پێویستە ئاوارەکان میوان بکەین

بوونی ژمارەیەکی زۆر لە ڕۆشنبیرانی کورد لە دەرەوەی وڵات، دیاردەیەکی نوێی ژیانی ڕۆشنبیریی ئێمەیە. هەرچەند ئەو ڕۆشنبیرانە لەسەر بەرنامەیەکی لە پێشدان ئامادەکراو نەچوونەتە هەندەران، بەڵکو لە ئاکامی نا بەسامانی ناوخۆیدا ئاوارەییان هەڵبژاردووە. هەربۆیە لە دەرەوە بە جۆرێکی شیاوی خۆیان دانەمەزراون. هەڵبەت ئەم قسەیەم وا ناگەیەنێ کە لەوێدا هیچ شوێنێکیان لە ژیانی ڕۆشنبیریی وڵاتەکەمان نەگرتبێ، بە پێچەوانە مەبەستمە. ئەو بەشە لە ڕۆشنبیران، لە بارودۆخێکی دیکەی پڕ لە شارستانیدا گیرساونەتەوە، لەوێوە بەوپەڕی ئازادی دەتوانن کاربکەنە سەر ڕەوتە ڕۆشنبیرییەکانی کوردستان.

هەرچەند دیاردەی کۆچکردن بۆ هەندەران جێگەی پەسند نییە و زیانێکی زۆری بە کوردستان گەیاندووە، بەڵام هەر ئەوەی قەوماوە دەکرێ هەندێکی شایەنی باسی بەخێر بگەڕێندرێتەوە. یەکێک لەو بەخێر گەڕانەوەیە، بەرهەمی فیکری و ئەدەبی ڕۆشنبیرانی ئاوارەی کوردە کە ڕاستەوخۆ کەڵک لە کولتوری دنیای شارستانی وەردەگرن. وەک پردێکی ڕاستەوخۆ دەتوانن بیگوازنەوە ناو فەرهەنگی داخراوی کوردستان. هەروەک چۆن هۆکارەکانی ڕاگەیاندن و بەتایبەتی تەلەفزیۆن، بەردەوام لەرزە دەخەنە بەربینای فەرهەنگی داخراوی کوردستان، ڕۆشنبیرانی دەرەوەی وڵات دەتوانن خشتە فەرهەنگییەکانمان بە وەستاییەکی کارامانە دابڕێژنەوەو تەواوکاری پرۆسەی ڕۆشنبیریی ناوخۆیی بن. بەتایبەتی ئەو ئازادییەی ڕۆشنبیرانی ئاوارە هەیانە، ئەو توانایەیان پێدەدات تا شوێنێکی شایەنی باس لە پێشەنگایەتی ژیانی ڕۆشنبیریی کوردستان داگیر بکەن.

ئەو توانایەی ڕۆشنبیرانی ئاوارە کاتێک کاریگەر دەبێ، کە لێرەوە دەستی هاوکارییان بۆ درێژ بکرێ و ئەو پردەیان بۆ هەڵبەسترێت کە بەسەریدا قاچێکیان بگێڕنەوە کوردستان. چونکە گومانی تێدا نییە کە ڕۆشنبیری کورد پێویستییەکی لە ڕادەبەدەری بە تێکەڵبوون بە ڕۆشنبیریی کراوە هەیە. ئەو تێکەڵبوونەش بەشێکی زۆری لە ڕێگەی ڕۆشنبیرانی کورد لە هەندەران دەکرێ، ڕۆشنبیرانی ئاوارەش تەنیا لە کوردستان بوونی خۆیان دەدۆزنەوە.

١٩٩٨/١١/٥

***ئەم زنجیرە وتارەی لەم بەشەدا هاتووە، وەرگێرانی رای ژمارەیەک نووسەری بە ناوبانگی بنیان تیروانینی ئەوانیشمان لەسەر رووناکبیر ، فەرهەنگ[رۆشنبیری] کردووەتە بەشێک لەو مناقەشانەی لەم کتێبەدا هاتوون.مەبەستم کاملکردنی فکرەکە بوو.تاکو بابەتەکە تەنیا لە روانگای رووناکبیرانی خۆمان لێکنەدرابێتەوە.دوو ساڵبەر لەئێستا، وەک نامیلکەیەک بلاوکرایەوە.***

# مانەوەمان لە ئارامیی رۆژهەلاتیمان دایە

## شاهرۆخی تویسرکانی - ئێران

تۆ بلێی ئازادیی چەمکێک (کاتگۆری) بێت هیچ پەیوەندی بەکات و شوێن وباری مێژوویی ، کۆمەلایەتی ، ئاینیەوە نەبێ؟ ئایا رۆشنبیر مانای گوزەری زەین و ناساندنێکی میکانیکی نییە؟

بەگوێرەی پێناسەی کۆمەلناسی، رۆشنبیر خەلکانی بیر روناکن.جا من پێموایە نەک بیر، بەلکو پێویستە (رۆشناییەکەشی) شیبکەینەوە؛ روناکبیر، خۆر دەکوژێنێتەوە تاکو فانۆسە بچکۆلانەکەی خۆی داگیرسێنێ و تاریکایی ‹دەربرینەکانی خۆی› نیشان بدات. هەلبەت ئەوانەی زانیاریش کۆدەکەنەوە بە رووناکبیر دادەندرێن، بەلام ‹رۆشنبیرکەرەوە› زۆر کەمن. مەبەستم ئەوانەن کە لە شایی لەدایکبوونی خۆری ئەزەلی، ئامادەن سۆمای چاوی خۆشیان ببەخشن.

رۆشنبیر ‹نیچە› نیە ک دەلێ: « منیش یەکێکم لە خوداکان»، کاتێکیش کار دەگاتە ناساندنی رۆشنبیران دەبێژێت: ئەوان وەک ئەو مێشولانەن بە دەوری رۆشنایی و ئازادیدا دەخولێنەوە، دوا جاریش دەبنە تاریکبیری گۆشەنشین. «مارکس»یش رۆشنبیر نییە، چونکە وەختێک تاریفی ئەم توێژە دەکات دەلێ : «رۆشنبیر ئەو کەسانەن کە لە رێگای قەلەمەوە نان دەخۆن».

تۆلستۆیش رۆشنبیر نییە، کە دەلێ: «رۆشنبیران وەک ئەو مرۆیە کەرانەن وەلامی پرسیاری ئەوتۆ دەدەنەوە، لێیان نەپرسراوە.».دوایش لە کتێبی ‹هونەر چیە› دا پێ لەوەش زیاتر هەلدەبرێ و دەلێ ‹تایبەتمەندی نووسەرە تازەکان لەوەدایە ؛ هەموویان لە ژیان بێزارن وحەزیان لەوەیە لە دەربرینی چەمکی ئازادی بیرورادا بە پێچەوانەی رای گشتی بیر بکەنەوە و خۆیان بەسەیر و سەمەرە بێننە بەرچاوان. کاتێک قسەی ئەم گەورە پیاوانە ،بە مەنتیق وەردەگیرێ کە لە جێگۆرکێی وشەکان

گەیشتبێن، ئەگینا ئەگەر بە دوای مانازانیندا بگەڕێین ،ئەوە ڕۆشنبیران، هەمیشە لە ناو بێدەنگی و هاواردا دەژین: بێدەنگن بەر لە بڕیار وەرگرتندا، بە هاواران لە نارەزایی دەربڕیندا.

بەراستی ڕۆشنبیر کێیە؟ بە پێی بیروڕای ‹کانت› لەسەر چەمکی ڕاسیونال (عەقل)، نابێ چاوەڕوانی لە ڕۆشنبیر بکرێ، بچێ ڕێگایەکی خۆشنەکراو بکوتێتەوە، تاکو بیسەلمێنێ خۆی پێشڕەوی کاروانی مرۆڤایەتیە. بەتایبەتی لە هەلومەرجی ئەمڕۆدا. ڕەخنەکەی نیچە ئامادەمان دەکات تاکو شتێکی ئاسمانی و دروو لە زەوی، لەسەر ڕۆشنبیر لە زەینماندا دروست نەکەین. تێبینییەکەی (ڕاسێل)یش لەسەر زمان باوەڕمان پێدێنێ کە هەر توێژە و زمانی تایبەتی خۆی هەیە، هەر زمانەیش تایبەتمەندی خۆی ، بەکارهێنانی خۆی ، هەر بەکارهێنانێکیش کات و شوێنی دیاریکراوی خۆی گەرەکە. دەڵێ: تاکە تایبەتمەندی پایەدار و هاوبەشی هەموو ڕۆشنبیران، لە قۆناغە جیاجیاکانی مێژوودا، بریتیە لە خۆدابڕین لە داب و نەریتە کۆنەکان، نەک وەستان لە دژیاندا، کەواتە دەڵێ پێویستە نەریتە کۆنەکان بە مەرجێک وەربیگرێن، کە لەگەڵ بیروڕایەکانی ئەوکاتدا بگونجێن.

ئایا هەر لەبەر ئەم جەسارەتە هوشمەندانەی ڕۆشنبیرە ڕاستەقینەکانە کە نابێ هەڵسوکەوتێکی ئازادانەیان لەگەڵدا بکرێ؟ ڕۆشنبیری ڕاستەقینە کەللە سەری هەر میللەتێکە ، هەر میللەتێکیش لە کەللەسەرەوە دەدرێتەو بەر شالاو، هەر بەویش پەیوەندی بە جیهانەوە دەگرێ.

ڕۆشنبیر دروست ئەو شتەیە کە ‹ئۆکتاڤیوپاز› لە باریەوە دەڵێ: ‹دەبەنگە ئەگەر خەڵک قبوڵ نەکات و تەنیا خۆی بە نیشانەی واقع بزانێت، کەسێکی ئاوها ڕۆشنبیرنمایە›. ڕۆشنبیر ئەوەیە کە ‹هەرتسن› لە بارەیەوە دەڵێ: ‹ژیان ئەرکێکی گەورەی کۆمەڵایەتییە و ڕۆشنبیری ڕاستەقینە دەبێ بەردەوام خۆی بکاتە قوربانی کۆمەڵەکەی›. ئەوەی هەست ڕادەگرێ بزانێ ‹با› لەکام لاوەدێت، ئەوە بە ڕواڵەت هۆشیارە، بەلام ڕۆشنبیر [ڕووناکبیر]نییە.

*ئەو کەسەی کە تەماشای سیمای دەسەلاتداران دەکات تا بزانێ چیان دەوێت ، خێرا خۆی دەخزێنێتە بن پەساری ئەوان و هۆشیارانە دەکەوێتە دەرۆزە کردنی ئازادی، ئەو کەسە قەت ڕووناکبیر نییە.*

ڕۆشنبیر ئاوێنە و ڕەخنەگرێکی سروشتی ناو کۆمەڵە، نەک هەمسازی دەسەلات. هەروەها ئەو کەسەیە کە ‹عونسرلمەالیکی کەیکاوس› باسی دەکات: ‹ئەو کەسەیە دەچێتە شوێنێک ، ئەگەر خەڵک بیدۆزنەوە، لە هەمان شوێن دایدەنێنەوە تاکو شەرمەزار نەبن. لە چاکەی خەڵک ماندوو نابێ و لۆمەی کەس ناکات. ئەو کەسەیە کە ڕاستی بە نرخی گیانی خۆی دەکرێ›. هەروەها ‹عەینولقوزاتی هەمەدانی› لەبارەیدا دەڵێ: «ئەو کەسەیە بە جوانییەکی ئەزەلی دارێژراوە»، واتە ڕۆشنبیر عاشقێکی بەدەردئاشنا و ئاگایە، مرۆیەکە پتر لە سێبەری پیغەمبەران دەچێ. ڕۆشنبیری ڕاستەقینە بانگدەری یەکێتی عشقە ،هەر وەک ئەوەی ‹محیەدین بنی عەرەبی› گەیشتە هەمان پلە: «پێشدان ڕووم لە برادەری خۆم وەردەگێرا ئەگەر بیروڕاکەی لەگەڵ من نەگونجابا، بەلام ئەمڕۆ دڵی من بووەتە پێشوازی هەموو چەشنە نیگارێک، لەوەڕگای مامزان، کونجی ڕەبەنان، بتخانە، کەعبە، تابلۆکانی تەورات، «مەسحەفی

قورئان»، من سەری خۆم بە ئاینی یەکێتی عشق سپاردووە».

بانگدەرانی سـڕینەوەی ژەنگی نەزانین و خـورافـات لەسـەر زەینی نەزانان کـەم نەبوون: لە ئیسلامدا کە دینێکی دروستبین و پاکگیرە، عاشق و بڕواراستی زۆری تێدا هەڵکەوتوون ، هەندێکیان گیانی خۆشیان لە پێناویدا داناوە ، بەم شێوەیە مەشخەڵی هەق و ئازادیان بە گیرساوەیی ڕاگرتووە. دەکرێ لە ‹شەمسی تەبریزی› فێربین کە بە حەزێکی عاشقانەوە دەڵێ: «ئەهلی ئەندیشە– ئەو حەکیمانەن بۆ بەرژەوەندی خەڵک بیر دەکەنەوە.»

رۆشنبیری ئەمڕۆ ئەو هەموو ئەزموونەی لە پشتەو ئاگای لە چەندێتی و چۆنیەتی ورد و درشت هەیە ، دەزانێ رۆژگاری زۆربڵێی و هەردەم مخالیف بوون و رووبەروو وەستانی بێجێ و بێ ئامانج لەگەڵ بیروڕای خەڵکی دیکە ،نەماوە.

# ڕۆشنبیرانی جیهانی سێیەم تووشی خۆ دۆڕاندن بوون

محەمەد باقر ئەنساری - ئێران

ڕۆشنبیر، بەو کەسە دەوترێ کە ،خاوەنی هۆش و ئاگاییەکی شیاو بێت، توانای بیرکردنەوەی هەبێت. بە پێی دابی گشتیش ئەو کەسە بە ڕۆشنبیر دەژمێردرێ کە جیهانبینییەکی بەرفراوانی هەبێت و دژی خورافات بێت. چونکە خوێندەواران، خەڵک بە نموونەی خۆیان دەزانن و ڕێزی دەگرن، هەڵبەت دەبێ واشبێت چونکە زانست و لێهاتوویییەکانی دیکەی ڕۆشنبیر، پایگایەکی کۆمەڵایەتی لەباری بۆ دەرەخسێنێ. بەداخەوە لە جیهانی سێیەمدا ڕۆشنبیر، لە گەڵ جۆرێک لە خۆدۆڕاندن تێکەڵاو بووە، ئەوەش لە ژیانەوە دێت کە ئەوان لە کۆمەڵگای پاشکەوتوو دەیبەنە سەر. هەندێکیان ڕۆژئاوا بە تەکنەلۆژیا و دیموکراسی و ئەخلاق و فەلسەفەی ژییانەوە دەکەنە نموونەی وڵاتی خۆیان. هەندێکیشیان شەیدای مارکسیزم بوون. هەڵبەت ڕۆژگاری هەردووکیان بەرەو کۆتایی چووە. بەهەر حاڵ ڕۆشنبیری سەربەخۆ لە بیرکردنەوەدا، زۆر کەمن. مەبەست ئەو کەسانەیە کە دەچنە قوڵایی فەرهەنگ و ئاین و چاکە ، بایەخە مرۆڤایەتیەکانی ناو کۆمەڵگای خۆی ، لەوێوە پەیامی کۆمەڵایەتی خۆیان دەخەملێنن، ڕۆشنبیری لەو بابەتە ،ڕۆڵێکی گرنگ لە ژیانی کۆمەڵکەی خۆیدا دەبینێ.

# خووی ڕۆشنبیران

## کەیخوسرۆ جەمشیدی - ئێران

هەوڵدان بۆ تێگەیشتن لە نەریتە ڕۆشنبیرییەکان، یەکێکە لە پێویستترین باسە کۆمەڵایەتییەکانی ئێمە. هەرچەند ناساندن و سنوور بۆدانان هێندە لەسەر دڵان خۆش نیە، بەڵام کاتێک سنووره سروشتیەکان شێوێندران ،ئەوکاتە دانانی سنوور و دیسپلین، بایەخی بیر لێکردنەوەی دەبێت.

باشترین هەنگاو بۆ دیوار هەڵچنین، دانانی یەکەمین خشتە. کەواتە ڕۆشنبیر، ئەو کەسەیە کەخاوەن بیرکردنەوەیەکی ڕوون بێت، ئەوەی کۆمەڵ بەگشتی تێی دەگات، ئەویش وەریدەگرێت. هەر بەوەندەش نابێتە ڕۆشنبیر، بەڵکو پێویستە زیاتر لە کۆمەڵ ، زووتر لە خەڵکی دیکە، هەست بە پرۆسەکان بکات. بوون بە ڕۆشنبیر، هەوڵو تەقەلایەکی زۆر دەخوازێ، پێی دەڵێم تەقەلا بە درێژایی تەمەن. ڕووناکبیر پێویستە هەمیشە لە تەقەلا دابێت و زانیاریەکانی خۆی پێشکەش بە کۆمەڵ بکات. عومرێک خەریکی فێر بون دەبێ و هێندەی دیکەش بە بیرکردنەوە و تاقی کردنەوە مژوڵە. ئەو کەسەی هەر زانیاری کۆ بکاتەوە بەلام نەتوانێ بەکاری بهێنێ، ڕۆشنبیر نییە، عەنبارێکی بێکەڵکە. کەواتە ئەو ڕەگەز و زانیاری و بیرکردنەوەیەی ڕۆشنبیر لێیدروست دەبێ، واتە تێگەیشتن لە جموجوڵی مێژووی مرۆڤایەتی، لە کۆن و نوێ دا ، توانایی لە فێربوونیان و دەرککردن بە پێگەیشتنی مێژوویی، تاکو دەرک بە پرۆسەکە بکرێت، بۆ ئەوەش فکر بخرێتە کار، ئەوە دوو نەریتی زەقی ڕۆشنبیرانن.

مرۆڤ لە ڕێرەوی پێگەیشتنی خۆیدا چەندان ڕێگای تاقی کردۆتەوە و لە هەر ڕێگایەشدا ڕاستیەکی دۆزیوەتەوە، ڕۆشنبیر پێویستە ئەم ڕاستیانە بزانێ و لێیان قوڵبێتەوە. هەندێک لەو ڕاستیانە نابنە مایەی دروستبوونی ڕۆشنبیران، بەڵکو وەک شتی سەرپێیی، لەناو کۆمەڵ وەگرین وەک؛ ڕاستگۆیی لە درۆزنی باشترە، دیموکراسی لە دیکتاتۆری چاکترە وشتی لەم بابەتە. ئەوانە ڕۆشنبیریان پێ دروست نابێ، لەوانەیە یەکەمین کەس هەستی بەم چەمکانە کردبێ، ئەوکات بە ڕۆشنبیر ژمێردرابێت، بەلام ئێستا وا ناژمێردرێت. زانین و هۆشیاری، دیسپلین بە دوای خۆیدا دێنێ ، ڕۆشنبیر پێویستە لە خۆیدا هەست بەم بەرپرسیە بکات ، بەرامبەر بە ئاگایی خۆی مولتەزم بێت. ڕۆشنبیر هەمیشە هەق پەرستە و بە دوای هەق دەگەڕێت، کاتێک عەدالەت بۆ کۆمەڵگایەک بە پێویست زاندرا، بە ناچاری دەبێ لە پێناویشی تێبکۆشێت. هەر کەسێک هۆشیار بێت، بەلام بە کردەوە هەنگاوی بۆ نەنێت، ئەوە بە ڕۆشنبیر دانانرێ. ئەوانە دەشزانن بەلام وەک قوتبنەما هەر جارەی بەلایەکدا دەسوڕێن، نەک ڕۆشنبیر نین بەڵکو خیانەتکارن.

مرۆڤ به کارەوە زیندووە ، رۆشنبیریش وەک مرۆڤێک، تایبەتمەندی خۆی هەیە، ئەویش نەسرەوتن و قبوڵ نەکردنی بێدەنگیە. رۆشنبیران لە ئەنجامی کرداری خۆیان بەپرسن. ئەم کارەش زۆر زەحمەتە، چونکە دەمخاتە سەر دوو رێگا: جەنگاوەرێکی زانا، یان پیاوێکی قوتبنەما، واتە خیانەتکار.

# راستگۆ نین، درۆزن

برنارد شۆ (بەریتانیا)

«هەر ئەوەیە، کەهەیت» یان «ئەوەی دەینوێنی، ئەوبە». هەر ئەم رستــە ســادەیە، گوزارش لە هەمە چەشنەیتی رووحی مرۆڤی خۆبنیادنەر ئەکات، نەک مرۆڤی سادەی عامە کە مادەکەی وەک ئاوێنە وایە و ستروکتوری وجوی خۆی لە دوورەوە دەنوێنێ. بەڵام لەو شوێنەرا کە مرۆڤ کە پێ بە پێی تەونی کۆمەڵایەتی خۆی بڕوات، لەبەر هەمەچەشنەبوونی بڕواو هزرەکانی، تووشی چەند باوەڕێکی غەریب دەبێ کە دۆزینەوەی خەڵکانی بیرکەرەوەوەیە، خەڵکی بیرکەرەوەش، خاوەن پێوەرن و لە فەرهەنگی عیبری و مەسیحی و فەرهەنگەکانی دیکەی وڵات، یەکەمین کەس کە پێوەر و بەڵگەی (قیاس و برهان خلف) دۆزیەوە «شەیتان» بوو. ئەو شەیتانە هەزار روخسارەی لە خوارەوە دەکەوێتە بەر قسەکردنی برناردشۆ. هەڵبەت برنارد شۆ لەم ئەهەریمەنەدا، دیمەنێک دەبینێ کە لە دواجاردا بکەوێتە ئاشکرا گوێی لەسەر مرۆڤی خۆبنیادنەر، ئەو مرۆڤەی بە گوێرەی خواستە کۆمەڵایەتی و مێژووییەکانی، تەنیا بۆ رۆشنکردنەوەی ماڵی خۆی، کەڵک لە رووناکی فکر وەردەگرێ وکاری بەسەر دراوسێکەیدا دانیە.

شۆ، لێرەدا رۆشنبیری فەردپەرستی بەخۆژیوی هەلپەرست ،دادگایی دەکات، خۆشی وەک رۆشنبیرێکی ئەهورایی و خەڵکی دیکەبزوێن، دەگاتە مانایەکی تر بۆ ئەم بابەتە.

لە راستیدا، رەفتاری شۆ، واتە «شەیتان» لەم کورتە باسە پڕ مانایەدا، رەفتاری سوقراتە لەگەڵ کریتون، کریتۆن و سوقرات هەردوو رۆشنبیرن بەڵام بەیەک رێباز. برنادر شۆ دەڵێ:

*دۆستەکانت زلترن بزنن، ئەوەی تا ئێستا من دیتونم. برادەرەکانت جوان نین، خۆیان رازاندۆتەوە. پاک نین ریشیان تراشیوە و خۆیان ئارایش کردووە. قۆز نین جلیان بە مۆدەی رۆژ پۆشیوە. زانا نین، بڕوانامەی زانکۆیان هەیە. بە دین نین، دەچنە پەرستگا. بە ئەخلاق نین، پەیرەوی دابن. خۆپارێز نین، ترسنۆکن. تەنانەت بەدکاریش نین، وەلێ سستن. هونەرمەند نین، شەهوانین. دەوڵەمەند نین، پارەدارن. دڵ فراوان نین، بەندەی ملکەچن. پابەندی ئەرک نین، وەک مەڕ، خۆبەدەستەوە دەرن. خەڵکیان ناوێ، خاکیان دەوێ. دلێر نین، کەچی شەڕ هەڵایسێنن. لێبڕاو نین، منجڕن. لێهاتوو نین، پایە پەرستن. رێزی خۆشیان ناگرن، تەنیا پۆز لێ دەدەن. مهیرەبان نین، گوڵ خوازن. بەراورد ناکەن، چاپلوسی دەکەن. زانا نین، فکری خۆیان*

*فەرز کـردووە. هێـزی خـەیاڵیـان نیـە، خـورافـاتین. دادپەروەر نین، تۆڵە سـتـێنن. دیسپلینیان نیە ،ڕێشمـە کراون و قەت ڕاستگۆ نین درۆزنن. هە رهەموویان یەک یەک تا قوڵایی ڕۆحیان ئاوهان.*

لە «ڕووبەشەیتان» وەرگیراوە.

# کەسایەتی و پەیامی ڕۆشنبیران

د. مەهدی پەرهام (ئێران)

نارەزایی و رەخنەگرتن، نەکوشتن و گفتوگۆ، پێکەوە ژیان بە ئارامی و نسبیگەرایی، لایەنگریکردن لە دیموکراسی، ئەوانە هەموویان تایبەتمەندی ڕوناکبیری ئەم سەردەمەن. لێرەدا گەرەکمە بە کورتی باسێک لەسەر- نەک هەر-ناسنامە و کەسایەتی و پەیامی رۆشنبیر بکەم، بەڵکو هەوڵ بدەم هۆیەکانی بێدەنگی ئەم توێژە لەم برگە زەمانییە بخەمە ڕوو.

لێرەدا مەبەستم نییە مێژویی سەرهەڵدانی ئەم چەمکە و قۆناغەکانی گۆڕانی بێنمە بەر باس لێوەکردن، لە جیاتی ئەوە، زیاتر ناساندن و شەرحدانی ئەرکەکان و لێکۆڵینەوە لە تایبەتمەندیەکانیان، دەخوازێ منیش لەم روانگەیانەوە باسەکەم دەستپێدەکەم.

زۆر تەعریف بۆ ئەم چەمکە کراون و هەموشیان ئەوە دوپات دەکەنەوە کە رۆشنبیران ئەو کلمەکەڵ کەسانەن کە کاری فکریان، لە کاری دەستی زیاترە. بەم زیادکردنەی کاری فکری، لە ئاست کاری دەستی دا، وا دێتە بەرچاو کە چینە رەنجدەرەکانی وەک کرێکاران بە جارێک لە دەرەوەی ئەم توێژە حساب بکرێن. کەچی رۆشنبیر، کەمایەتییەکە لە ناو هەموو چینە کۆمەڵایەتییەکان بەرچاو دەکەوێ. چەمکەکە تا رادەیەکی زۆر خۆی ناسێنەری، ناوەرۆکی خۆیەتی، کەسێکمان پێ دەناسێنێ کە ئاگایی و زانیاریەکانی بە جۆرێکن، بیری روون دەکەنەوە تاکو هەموو ئەو شتانەی لە ژینگەی کاروکۆمەڵایەتی ئەودا هەن، یان نین، لێک جیا بکاتەوە، واتە ئەو کەسەی دیدو تێڕوانینی هەیە. ئاساییە ئەم جۆرە کەسە کەموکوڕی دەوروبەری کارکردنی خۆی تێبگات. ناتوانێ بۆ پاکتاو کردنی کەموکوڕیەکە پرۆژەیەکی نەبێت. لە ئاکامدا تێکڕای رۆشنبیران، لە هەموو بوارەکاندا بۆ پێشخستن و پێگەیاندنی کۆمەڵ تەقەلا دەدەن.

هەر کاتێک، پێگەیاندن و پێشخستنی کۆمەڵایەتی، بووە مەبەست، ئەوە ڕۆڵی رۆشنبیر دەردەکەوێ ئەویش بریتییە لە رەخنەگرتن لە وەزعی ئێستای جیهان، چونکە هیچ پێگەیشتنێک نایەتەدی ئەگەر وەزعی ئێستای جیهان نەگۆڕدرێت، گریمان ئەگەر وەزعی جیهان لە عەقڵ و عەدالەت نزیکیش کەوێتەوە ئەوجا سروشتی نوێخوازی مرۆڤ هەر بەدوای وەزعێکی لەبارتر لەوەی هەیە دەگەڕێ ، ئەم وەزعە لەبارترەش رۆشنبیر پێش هەموو کەسێک لێکیدەکاتەوە و هەستی پێدەکات، چونکە هەر لە بنەڕەتەوە ئەو، بیر لەوە دەکاتەوە کە کۆمەڵ نیەتی و دەبێ هەیبێ، بۆیەش

ڕەخنە لەوەی هەیە، دەگرێت. لەوەڕا دەکرێ بێژین گۆڕانی وەزعی ئێستا و ڕەخنەگرتنی ڕۆشنبیران، کارێکی بەردەوامە، هەر وەک چۆن پێگەیشتن پرۆسەیەکی بێ وەستانە. *تا ڕۆشنبیر لە ژیاندا مابێ و ناوی بهێندرێ، ڕەخنەگرتنیش لە سروشتی ئەودا زیندووە. کەواتە ڕەخنەگرتن یەکەمین و ئەسڵیترین تایبەتمەندیی ڕۆشنبیرانە.*

ئەم ڕەخنەگرتنە چییە کە هێندە پێگەیشتنی کۆمەڵی مرۆڤایەتی پێو بەندە؟

ڕەخنە، یان کۆمەڵ چاک دەکات یاخود بناغەی کۆمەڵ بۆ چەسپاندنی پڕۆژەیەکی نوێ، ژێرەو ژوور دەکات واتە وێرانی دەکات. لە هەردووک باردا، کۆتوبەندی کۆمەڵ دەپسێنێ و ئازادیەکی زیاتر دەستەبەر دەکات.

کەواتە ئەنجامی ڕەخنەگرتن «ئازادییە» و پەیامی ئەسڵی و دوایی ڕۆشنبیرانیش تێگەیشتن و دابینکردنی ئازادییە بۆ کۆمەڵی خۆی و تێکڕای کۆمەڵگای مرۆڤایەتی. ئەم پەیامە زۆر مەزنە.

ئایە بە درێژایی مێژوو ،ڕۆشنبیر قەت گەیشتۆتە ئەم پەیامەی خۆی؟

گومانی تێدا نییە وەڵامەکەی، بەڵێیەو پۆزەتیڤە. بەڵام جۆری بە ئەنجامگەیاندنی ئەم پەیامە، هێندە بەگەوە و پێچاو پێچە کە بۆ ڕۆشنبیرانیش بەدیار ناکەوێ ، بۆ ئەوان هەمیشە هاوکات بووە لەگەڵ بێبەشی. ڕۆشنبیران لە جموجۆڵی ئازاد سازی خۆیاندا، هەمیشە دوو هەنگاویان بۆ پێشەوە و هەنگاوێک بۆ پاشەوە گەڕاونەتەوە. لە ئاکامدا کۆمەڵیان هەنگاوێک بۆ پێشەوە بردووە و هەر ئەم هەنگاوەشە شارستانیەتی مرۆڤی بنیاد ناوە. بۆ نموونە بە درێژایی مێژوو، ڕۆشنبیران داینەمۆی شۆڕشەکان بوون و خەڵکیان بۆ هەنگاونان بەرەو ئازادی هانوپاڵ داوە.

با بزانین، ئاخۆ ڕۆشنبیر چۆن خۆی مەیدان بەجێدێڵێ؟ گرنگیەکە لێرەدایە؛ کە ناتوانێ بگرێ و بکوژێت. وەک ئەلبیرکامۆ دەڵێت: ڕۆشنبیر پارێزەری گیانی مرۆڤە. جا کە دەست بۆ گیانی خەڵک نەبات، خۆی دەکوژێ یان ناچار دەبێ مەیدان چۆل بکات و چاوەڕوانی پازدانی دواتر بێت.بەداخەوە مێژوو فەرمانڕەوایی درێژخایەنی ڕۆشنبیرانی «ڕاستەقینەی» تۆمار نەکردووە. ئەگینا جیهان بەهەشتی بەرین دەبوو.

ئەلبیر کامو ئەم باسە لە نووسینەکانی خۆیدا زۆر باش لێکدەداتەوە:

«... هونەرمەندە ڕاستەقینەکان، سەرکەوتووی باش نابن، چونکە ناتوانن مردنی منافیسی خۆیان قبوڵ بکەن. من ئەوە باش دەزانم . لای ژیان دەگرن نەک لای مەرگ... تەنانەت لەگەڵ ترسناکترین تاوانبارانیشدا هەر وان، چونکە پاکییە هەمیشەییەکەی مردن دەبینن، کە ئەویش ڕەنج و ئازادییە ».

هەرچەندە پلەی ڕۆشنبیریی زیاتر بێت، ئەندازەی کوشت و کوشتار کەم دەبێتەوە. کامۆ پەیامی ڕۆشنبیر بە جوانترین شێوە دەردەبڕێت: «... پەیامی ئەوان تا مردن، دیفاع کردنە لە مافی ئەو دوژمنەی جیا لە خراپە هیچی دیکەیان لە دەست نایەت. ڕادەگەیەنن ئەگەر بە هەڵەبچن و کەس نەکوژن ودەرفەتی قسەکردن بە خەڵکی دیکە بدەن، باشترە لەوەی لەناو بێدەنگی لاشەی کوژراوەکاندا، هەق بپارێزن. تێدەکوشن، تاکو بیسەلمێنن ئەگەر شۆڕش بە کردەوەی ڕەق و زەبروزەنگ سەربکەوێت، تەنیا بە گفتوگۆ دەتوانێ پایەدار بێ و بپارێزرێ.»

ئەم تێگەیشتنە، لە پەیامی رۆشنبیران، وای لە ڤۆلتێر کرد بڵێ: «ئامادەم گیانم فیدا بکەم تاتوێ دژی من ،بتوانی قسەی خۆت بکەیت.»

بەداخەوە، هەموو لایەک بەباشی لەم مانایە، ناگەن. یەکێکی دەوێ بە بەرزی ڤۆلتێر، لەم مانایە بگات و قبوڵی بکات ، لەوەش گرنگتر، کاری پێ بکات. کاتێک رۆشنبیر لە جیاتی کوشتن، لە مەیدان دەرچوون هەڵدەبژێرێ، ئا لەو کاتەدا هەنگاوەکەی بەرەو دواوە دەهاوێ. بەڵام ئەو هەنگاوە، خۆ خەرکردنەوەی پازدانەکەی دوایی ترەو، خۆشحاڵیشە کە کۆمەڵگاکەی هەنگاوێک لە حەزی دڕندەیی کوشتن و کوژران دوور خستۆتەوە.

ململانێی هەڵبژاردن لە رۆژئاوادا، بە بێ کوشتار ئەنجام دەدرێ، ئەوەش بەرهەمی ئەو یەک هەنگاوەیە.

لە رووی زەمانیەوە ماوەی نێوان پازدانەکان بەرەو پێشەوە، لەگەڵ ئەو هەنگاوانەی بەرەو دواوەن ،زۆر کەمە. بەڵام راوەستان لەسەر ئەو هەنگاوانەی بەرەو دواوەن، هەندێکجار چەندین ساڵ دەخایەنێ. وەلێ خۆشبەختانە، رۆژ بە رۆژ ئەم وەستانە کەم دەبێتەوە، لە رۆژئاوادا لە سفر نزیک کەوتونەتەوە، حزبە جیاجیاکان، هەریەکە و بۆ ماوەیەک رۆشنبیرانی خۆیان بەکار دێنن و لە دەزگاکانی دەوڵەتدا دەسەڵاتیان پێ دەدەن، بۆیە توانیان بە ئازادی و پەرەدانی مەودای دیموکراسی بەرەو پێشەوە برۆن.

رۆشنبیر *چ لە رۆژهەڵات و چ لە رۆژئاوا، قەت رازی نابێ. «نارەزایی» تایبەتمەندیی دووەمی رۆشنبیرانە*، چونکە ئەگەر *رازی* بوو، *ناتوانێ رەخنە بگرێ*. رەخنەگرتن و *نارەزایی* پێکەوە جمکن و *ناسنامەی ئەو دروست دەکەن*.

تایبەتمەندی سێیەمی رۆشنبیر، نە کوشتنە. ئالبێرکامۆ هێندەی بەرز دەکاتەوە، پێدەڵێ، دیفاع کردن لە گیانی ئەو دوژمنەی کە هاوڕای ئەو نییە. ئەمەش لە رۆشنبیردا، باڵاترین ترۆپکی بەرزییە.

تایبەتمەندی چوارەمی رۆشنبیر، «گفتوگۆیە» کە لە جیاتی ئامرازی کوشتن و سەردەمی دڕندەیی، بەکاری دێنێت. دانیشتن و باس کردن و رەخنەگرتن، وەک مەیدانی نەبەردا وایە. *باوەڕپێهێنانی منافیس، لەسەرنگون کردنی و لە خوێن گەوزاندنی ئەو* کەمتر نییە. ئەمەش رووی لێکجیاکەرەوەی رۆشنبیرانی راستەقینەیە لە رۆشنبیر نمایانە. رۆشنبیرنمایان، خەڵکانێکی سازشکار و کوڕی رۆژن، کە برناردشۆ، زۆر بە ناسکی باسیان دەکا: ئەوانە، دۆستی راستەقینەی شەیتان و نەزیری شەیتانن و بەم شێوەیە سیفەتەکانیان دەژمێرێ:« دەوڵەمەند نین، بەڵام پارەیان هەیە. شەر هەڵایسێنن بەڵام خۆراگر نین. نیشتمان پەرستن، بەڵام دلێر نین. لێهاتوو نین ،پایەپەرستن. خۆپارێز نین ،ترسنۆکن. خاوەن بیر نین ،بیر دزن». ئەوانە سیفەتی رۆشنبیرنمایانن لە هەردوو قۆناغێکدا . کەسانی لەبابەت ئالبیرکامۆ، ژان پۆل سارتەر ، ئاندەری مالرۆ، برناردشۆ لە دنیادا زۆر کەمن و بەئەنگوست دەژمێردرێن . بەداخەوە زۆربە بەلای رۆشنبیرنمایان دایە. بەڵام ئەو پازانەی تا ئەمرۆ مرۆڤایەتیان بەرەو پێشەوە بردووە ، ئەم شارستانییە سەرنج راکێشەیان بنیاد ناوە، هەموو لە بەرەکەتی ئەو پازدانە کورتیلانەیە کە رۆشنبیرانی راستەقینە، بە قسەکانی خۆیان کۆمەڵیان پێڕاهێناوە و بەرەو پێشەوە پاڵیان داون. پازەکان هەرچەند کورتن، بەڵام ستروکتوری پێشوویان تێکشکاندووە و پاشماوەی گوفتار و

کرداریان هەر ماوە.

*لە نێوان رۆشنبیرانی راستەقینە و رۆشنبیرنمایاندا، ئەو رۆشنبیرانە هەن کەواچاکە پێیان بڵێین واقعیین. ئەوانە، بەپێی بارودۆخ سازش دەکەن، بەڵام نەک بۆ بەرژەوەندی خۆیان، بەڵکو بۆ بەرژەوەندی ئەو کۆمەڵەی تیایدا دەژین.*

ئەو رووناکبیرە سازشکارانە، بە پێچەوانەی رۆشنبیرە راستەقینەکان- کە زیاتر ئایدیالگەران، واقیعەکە هەست پێدەکەن و تێدەگەن کە دەبێ لە کەنار چەندان دەستەی تەپی کۆمەڵایەتی و سیاسیدا بژین. ئەوانە پرۆژە دارێژەری «پێکەوە ژیانی بە ئارامین». ئەوانە داهێنەری مافە نێودەوڵەتیەکان و ژیانی نێودەوڵەتین. هەر ئەوانەن کە وازیان لە سپێتی و رەشیەتی موتڵەق هێناوەو، بۆ روانگەکانی خۆیان رەنگی بۆریان هەڵبژاردوە.

پێنجەمین تایبەتمەندی رۆشنبیری ئەم زەمانە، بریتیە لە تێگەیشتنی ئەم پێکەوە ژیانە.

کاتێک رۆشنبیر، وازی لە بیرکردنەوەی موتڵەق هێنا، لەبەرچاوتەنگی ئایدیۆلۆژیا دوور کەوتەوە، ئەوجا تایبەتمەندی شەشەمی سەرهەڵدەدات، کە ئەویش چوونە بەرەو بیرکردنەوەی زانستی و وەرگرتنی مانای نیسبیەت. «نسبی گەرایی» تایبەتمەندی ئەسڵی رۆشنبیری ئەم رۆژگارەیە.

پەیامی واقیعی لە مل ئەم رۆشنبیرە نیسبیگەرایانەیە. ئەوانەن دنیای ئایدیالیان جێ هێشتووە و فێر بون چۆن لەگەڵ پێشینەکانی ناوخۆ و دەرەوە بژین. ئەوانە «سیاسەتمەدارە راستەقینەکانن».

ئەزموونی حەفتاساڵەی کۆمۆنیزم، نیشانیدا کە هیچ حکومەتێکی دیکتاتۆر، بیەوێ دنیا رابەرایەتی بکات سەر ناگرێ. مرۆڤ دژی قالب وکلێشەیە، ئەگەر دوو کەس بوونی وەکیەکیان هەبێت، ئەوە فکری وەکیەکیشیان دەبێت.

هەڵبەت هەرکەس، لە هەندێک کاروباری ژیانیدا، لەگەڵ ئەویتر هاوبەشە و هاوئاهەنگیش دەکەن، بەڵام لە بەشەکانی دیکەی ژیان، پشت بەرای خۆی دەبەستێ.

لەسەردەمی ئەفلاتونەوە کە ویستی بەهەشتی بەرین، لەسەر زەمینی (سیراکوز) بخولقێنێ و نەیتوانێ، هەروا تێکرای ئەو فەیلەسوف و نووسەرانەی، کە ویستوویانە باسی سەرزەمینی ئایدیال (یوتوپیا) بکەن، لەگەڵ داهێنەری ئاین و ئایدیۆلۆژیاکان، ئەوانەی بە تەنگ خۆشبەختی ئەم جیهانە و جیهانەکەی دیکەوە بوون، ئەم دەرەنجامە دەکەوێتە چنگ، کە مرۆڤ قالب هەڵناگرێ و کلێشە قبوڵ ناکات، ئەگەر نەتوانێ دەسکاری تێدا بکات و بەرەو چاکتری بەرێت. چونکە مرۆڤ لە سروشتی خۆیدا، ئازاد و سەربەخۆ خولقێندراوە. حەز دەکات، خۆی زیاتر لە خەڵکی دیکە، دەستی لە دارشتنی قالبەکانی ژیانیدا هەبێت.

دوا ئەزموونی کۆمۆنیزم، شێوەکەی سۆڤیەت (مارکسیزمی شێوێنراو) بوو کە دارما.

لەو هەموو تەجرەبانە، دەگەینە ئەم ئاکامە، کە دیموکراسی ئەگەر بەرێکوپێکی پێشبکەوێت، لەبارترین (ئامرازە) بۆ گەیشتن بە ئازادی ژیان و فکر. هەڵبەت نابێ لە

بیـرمـان بچـێت کـه دیموکـراسی «ئامـرازه» نەک ئامـانج. ئامـانج بریتـیـه له پەروەردەکردنی توانای داهێنەرانەی مرۆڤ و ئازادیەکەی ،له پێناو بنیادنانی خودی مرۆڤ. هەلبەت ستەم کردن له میللەتان به بیانووی راهێنانیان به دیموکراسی و دوا جـار کـوێرکـردنەوەی وزەی داهـێنانیـان «ئەوەی تـا ئەمـرۆ رۆژئـاوای کـۆلۆنیـالی کردوویەتی» راست پێشێل کردنی ئامانج و بەرزکردنەوەی ئامرازەکەیه.

تایبەتمەندی حەوتەمی رۆشنبیر، لەم سەردەمەدا (تێگەیشتنی دیموکراسیه). ئەمە لەبارترین ئامرازه بۆ گەیشتن بەو ئامانجەی رۆشنبیر عەودالیەتی، که ئەویش ئازاد سازییه.

دواجار، دیموکراسی تەنیا بەمانا کتێبییەکەی نییه، واته فەرمانڕەوایی گەل بەسەر گەلدا، بەڵکو رۆڵی ئەسڵی دیموکراسی، لەبەرزەفتکردنی دەسەڵاتدارانه، بەهۆی دژه دەسەڵاتداران. دیموکراسی خولقێنەری بنەماکانی دژه دەسەڵاتدارانه. دەسەڵات هەر که چاودێر و رەخنەگری نەما، بەرەو بۆگەنی و فەساد دەچێ.

له کۆتاییدا پێویسته بڵێم: رۆشنبیر راستڕەو و چەپڕەوی نییه، وەک باسم کرد، کەمینەیەکی دیاریکراوه، له هەموو چینەکاندا هەیه، به پێی هۆشیاری خۆی لەسەر دەوروبەر رەخنه دەگرێ و له رەخنەگرتنیشدا تێڕوانینی خۆی هەیه. کرێکارێکی رۆشنبیر که بەماقوڵی رەخنه دەگری، له زانکۆییەک که له دیدگایەکی بیرتاریک یان بێلایەن، که بەردەمی خۆی نابینێ، سەد هەزار جار باشتره ،ویژدانیشی رۆشنتره، خوێندەواری زۆر ،بڕوانامـه هەبوون و کـاری فکر، نیـشـانەی رۆشنبـیـری نیـیـه. رۆشنبیر دەبێ له ئەرکی رۆشنبیرێتی خۆی تێبگات.

# رۆڵی نووسەر لە جیهانی سێیەمدا

تاهیر بن جەللود (مەغریب)

**فلیپ روت، نووسەری ئەمەریکایی، لە لێدوانێکیدا بۆ رۆژنامەی لومۆند، باسی تەنیایی نووسەرانی ناو کۆمەڵگای ئەمریکایی کردووە و دەڵێ: «زۆر بەزەحمەت دەتوانی، یەکێک بدۆزیتەوە وسەعاتێک لەسەر کتێبێک قسەی لەگەڵدا بکەیت. نازانم ئەو دیاردەیە لە هەموو جیهاندا هەیە یان نا؟ بەڵام دڵنیاتان دەکەم لە ئەمەریکا بەتایبەتی لە نیویۆرکدا شتی وا هەیە».**

**تاهیر بن جەللود، نووسەری عەرەب، خەڵکی مەراکیشە، ئەم وەڵامەی بۆ نووسیوەتەوە و لە هەمان رۆژنامەشدا چاپ کراوە:**

دەمەوێ بە فلیپ روت، رۆماننووسی ئەمەریکایی بڵێم؛ نووسەر بوون لە جیهانی سێیەمدا، زۆر خۆش و بە زەوقە. نەک خەڵک رێزی لێدەگرن، بەڵکو بەرهەمەکانیشی دەخوێننەوە و یارمەتیان لێ دەوێ و رەخنە و لێکۆڵینەوە لەسەر نووسینەکانی دەکەن، چاوەڕوانی دیداری دەکەن و پێشوازی لێدەکەن، یان بە پێچەوانەوە رووی لێوەردەگێڕن و لە خۆیانی دوور دەخەنەوە. بە کورتی یان زۆر ستایشی دەکەن و رێزی لێدەنێن یان تۆڕیی دەدەن.

نووسەر لە جیهانی سێیەمدا، هەڵسوکەوتی ئایدیالی لەگەڵدا دەکرێ ، دەکرێتە ئەفسانە. هەڵبەت ئەفسانەیەکی ئەوتۆ، ریشەکانی لە واقیعدا رۆچووبن. هەروەها وەک قسەکەری خۆیان واتەزاری ئەو خەڵکانەی کە ناتوانن نیازی خۆیان دەرببڕن. ئەگەر ئەوە نەبێ، نووسەر دەبێتە هەقایەتخوێن و لە خۆیەوە یان لە چیرۆکەکانی خەڵک ،داستان دادەرێژێ.

نووسەر، نەک هەر دەبێ داهێنەر بێ، بەڵکو پێویستە موحامی و فریاگوزاری کۆمەڵایەتی و ردێنسپی و کوێخاش بێت. واتە هەق بداتە چنگ هەقدار. هەروەها سەرگەرمکەر و پەروەردەکار و راهێنەر و مەحرەمی نەهێنییەکانیان بێت ، لە تەنگانەشدا، هونەرمەندی کۆنەکار و لیهاتوو بێت.کاتب یاسین، نووسەری گەورەی مەغریب، لە کۆنگرەکەی ئوپسالەدا لە ٨ شوباتی ١٩٦٧، وتی: «بچینە جەزایر، یەکێک لە خەڵک، باسکت لێهەڵدەکا، قۆڵت دەگرێ و پێت دەڵێ: تۆ وتت نووسەرم؟ واتە دەتوانی فکرم بخوێنییەوە» .ئەمەیە تاریفێکی سادە و راستەوخۆ بۆ نووسەران، کەوا دەبێ چاودێر و ئاگادار و گوێ لەمەستی خەڵک بن. واتە لە خزمەتی ئامانج و خواستە کۆمەڵایەتییەکاندا دابێت. لێی چاوەڕوان دەکرێ مولتەزیم بێت و لەسەر مەسەلە مەتافیزیکی و سیاسیەکان، زۆر بە سادەیی و بەرچاوی، هەڵوێستی هەبێ و

لەزاتەوە حەزی لەم شتانە بێت، مرۆڤێکی مەسئولیەتناس بێت.

هەر کاتب یاسین، لە ساڵی ١٩٦٠دا رایگەیاند: «لەسەر زەمینی ئێمەدا، تا ئێستاش رۆشنبیر لە خەڵک جیانەبوونەتەوە. بەڵام کاتێک توێژی رۆشنبیران و خوێندەواران و هەڵکەوتووانی (نخبە) خاوەن ئیمتیاز و مشەخۆر دێنە وجود، لە خەڵک خۆیان دوور دەگرن ، دواجار دەبنە خۆپەسەند و لە توانایی دەپوکێنەوە، ئەو کاتە بارەکە ترسناک دەبێت.» .

لە ئەوروپاش نووسەر، چاودێر و ئاگادارە، بەڵام پێش ئەوەی چاودێری خەڵک بێت، ئاگاداری خۆیەتی. ئەوەش زۆر ئاساییە، چونکە خواست و چاوەڕوانی خەڵک لە نووسەر، لە ئەوروپا و جیهانی سێیەمدا فەرقی هەیە. شاهیدیدان و ئۆباڵ هەڵگرتن و «شیفابەخشین»ی نووسەر، بەو ئەندازەی لە جیهانی سێیەم هەیەو پێویستە، لە ئەوروپا هێندە نیە.

نووسەران، هەرچەندە لەسەر سنووری ئەدەب بدوێن و بڵێنەوە، بۆ نموونە کتێبێک بۆ ئەو منداڵانە بنووسن کە لەبرسان خەریکە دەمرن، ناگەنە هیچ ئامانجێک. شیعرێک، رۆمانێک ناتوانێ دیکتاتۆرێک وەدەرنێت و ئابوری وڵاتێک بگۆرێت. ئەم شتانە بێهودەن و خوێنەران بە خۆدزینەوە لە بەرپرسی و ئیتلزام هەڵگرتن رادێن. رۆماننووس ناتوانێ بۆ داکەوتنی دڵی خۆی بنوسێت، دەبێ خواست و چاوەروانی خەڵکیش لەبەرچاو بگرێت. دەزانێ کە ئەو جێی چاوان و خواستانە. هەر بۆیە دەبێ لە ئاست ئەم چاوەڕوانیەدا، حساب پێشکەش بکات، چونکە خەڵک ئاوهایان لێیدەوێ، هەرچەند زیاتر خۆشیان بوێت، لەگەڵیدا سەختگیرتر دەبن، هەر بۆیە ئازادییەکەی کەمتر دەکەنەوە.

دیسان، هەر پەنا بۆ کاتب یاسین دەبەینەوە، چونکە هەر خۆی باشترین شاهیدی ئەم واقیعەیە، لە ساڵی ١٩٧٠ هەر لە رۆژنامەی لوموند دا باسی رەفتار کردنی خۆی لەگەڵ هاووڵاتیە «نەخوێندەوارە ئاوارەکان» دەکات: (ئەو نامانەی بە درێژایی هەفتە بۆیان دەهات دەیانهێنایە لای من، منیش بۆم دەخوێندەوە و وەڵامەکانیشم بۆ دەنووسنەوە. ئەم ئیشە، منی دەهێنایە سەر شەوق و زەوق، من مەحرەمی نهێنی هەڵگر و ئاوێنەدار و سکرتێری تایبەتی ئەوان بووم.)

فلیپ رۆت دەڵێ: «لەمەودوا، خوێنەر مرۆڤێکی گۆشەگیرە» کە هیچ هاودەم و هاودڵی نییە، کەچی لە مەغریب دا بە پێچەوانەوە، خوێنەر قەت تەنیا و گۆشەگیر نییە، چونکە هاودەنگی هەیە. کتێبەکەی بچووک بێت، دە کەس بە لای کەمەوە دەیخوێننەوە. کتێب دەستاودەست دەکات، هەڵبەت نەک تەنیا لە شوێنە دەوڵەمەندەکان، بەڵکو لەناو قوتابیانی جحێڵی ئامادەیی و خوێندکارانی زانکۆ، کە هەموویان کتێب خوێنی زۆر باشن. خەڵکی دەوڵەمەند، وەک (بەڕێوەبەران، بازرگانان، سیاسەتمەداران) زۆربەیان کتێب ناخوێننەوە. کەچی زۆرجاران هەر ئەوانە نارازین و دەڵێن کتێب گرانە. ئەو رۆمانە لە فەرەنسە نرخی ١٠٠ فرانکە لە مەغریب (ئەفریقا) سەرەڕای کەمبوونی نرخی پارە و هەزینەی بارکردن و گواستنەوە، نرخەکە دەبێتە دوو بەرابەر، کەچی گەنجەکانی گەڕەکە هەژارەکان، پارەی خۆیان کۆ دەکەنەوە و چەند کەس پێکەوە رۆمانێک دەکڕن. زۆر جارانیش بووە من یەک دانە کتێبم پێشکەش چەند کەسی خوێندکار کردووە و ناوی هەموویانم

له پشت کتێبەکە نووسیوە.

وەک دیارە، ئەوەی گەنجەکانی مەغریب ئازار ئەدات، نەداریە، ئەگینا حەزێکی زۆریان لە خوێندنەوەی کتێبە. هەر لەم بارەیەو باسێکم لەگەڵ ژان ژنە کرد، ئەو دەیگووت: «هەر وەزرێکی رۆشنبیری پێویستە گەشتوگوزار بۆ گەنجە نەدارەکان رێک بخات، تا بتوانن تابلۆکانی ڤان گۆگ و ماتیس و پەیکەرەکانی جیاکومەتی ببینن» .وایدەزانی ئەوە کەمترین شتە، کە دەوڵەت دەتوانێ پێشکەشیان بکات، بەتایبەتی کاتێک دەبینم گەنجان بۆ بەشداری کردن لە کورێکی شیعر، ریز دەگرن و ئامادەن زرمەزلێشی لەسەر بکەن، دەق ئەم رووداوە چەند ساڵ پێش ئێستا، لە دارلبەیزدا لەکاتی شیعر خوێندنەوەی مەحمود دەروێش هاتە پێشەوە. سەرەنجام پۆلیس بۆ بڵاوەپێکردنی سەدان گەنج، کە نەیانتوانیبوو بێنە هۆڵەکە، دابەزی.

نووسەرانی فەرەنسایی کە زانکۆ و قوتابخانەکانی مەراکیشیان دیتووە، دەتوانن شاهیدی بدەن خوێندکار و قوتابیانی ئێرە، زۆر زیرەکن و ئاگایان لە بەرهەمی نووسەرە فەرەنسەییەکان هەیە. کۆڕ بۆ کتێب خوێندنەوە و گوێ گرتن لەوانەی کتێبیان خوێندۆتەوە، رێک دەخەن. هەڵبەت ئەگەر ئەم حەزە بەرفراوانەی لە بەرچاو نەگرین، ئەوە دەبێ هەق بە فلیپ رۆت بدەیت. چونکە ژمارەی کتێب خوێنانی مەراکیش لە ئەمریکاییەکان زۆر کەمترە.

# ژیان بەبێ گفتوگۆ ناکرێ

## ئەلبێر کامۆ (فەرەنسا)

ئێمە لەرۆژگارێکدا دەژین کەخەڵکەکەی لەبەر بیروڕا پۆچ و دڕندانەکانیان، ڕاهاتوون لەهەمووشتێک بێزاربن؛ بێزارن لەخۆیان لەخۆشبەختی لەدۆستایەتی. ڕۆژگارێکە تیایدا«ڕاسین» لەنووسینی شانۆنامە«برنیس» شەرم دایدەگرێ و«ڕامبرانت» خێرا خۆی دەگەیەنێتە ئەنجومەنی سەری کۆڵانەکەیان تاکو ناوی خۆی بنوسێت ولەکێشانی تابلۆی«گەشتی شەوانە» پەشیمان دەبێتەوە.

بەم چەشنە نووسەر هونەرمەندانی ئەم زەمانە ویژدانیان ڕەنجاوەو لەلای خۆشمان بووەتەباو دەست لەپیشەکەیان بکێشنەوە.

ڕاستیەکەی ئەوەیە خەڵک خۆیان، ئێمەیان خستۆتە ئەم ڕێگایەو لەهەموو گۆشەو کەناری کۆمەڵگە سیاسیەکەشمان دەنگ بەرز دەبێتەوەو هانماندەدەن تا دیفاع لەخۆمان بکەین. پێویستە دیفاع لەخۆمان بکەین ؛ بۆچی بوونمان هێندە بێ هودەیەو بووینەتە خزمەتکاری ئامانجە ناپەسندەکان. کاتێکیش لەوەڵامدا دەڵێین زۆر زەحمەتە بتوانین لەو هەموو تاوانبارکردنە دژ بەیەکتریە پاک دەرچین. پێمان دەڵێن: بەڵێ هەڵبەتە ناکرێ لەکن هەموو کەس خۆتان بێگوناح لەقەڵەم بدەن بەڵام دەکرێ پشتیوانی بەخشندانەی هەندێک لەو کەسانە بەدەست بێنین کەخۆیان بەتاکە ئەلتەرناتیڤی ڕاستەقینە دەزانن و دەخوازن بکەوینە خزمەت ئامانجەکانیان. جا ئەگەر لەم ڕێگایەوە بەهیچ کوێ نەگەیشتن، بەهونەرمەند دەڵێن:«لەم خەڵکە بەدبەختە بڕوانن، ئێوە چیتان بۆ کردوون؟». هونەرمەند[ڕووناکبیر] لەوەڵامی ئەم هەقدەستیەی بێدەنگبوونە بێ شەرمانەیەدا دەڵێ:«بەلای کەمەوە من هیچم لەبەدبەختیەکەی خەڵکی بەدبەخت زیاد نەکردوە، بەڵام کێ لە ئێوە دەتوانێ ئەم قسەیەی ئێمە بکات؟»

هەڵبەت ئەگەر ئێمە لەکاری خۆماندا جدی بین ناتوانین لە ئاست هاواری خەڵکی بێ ئومێددا، بێلایەن بین. کەواتە دەبێ خۆمان بەکوتاهیکار دابنێین و بشزانین کەپاڵ دراوینە ناو ئوردگای دژی ئاین ، ئەوەش خراپترین شوێنێکە بەملیان داداوین. جا ئەم مەسەلە هێندەش ئاسان نیە چونکە لێمانیان دەوێ هەڵبژێرین وئەم هەڵبژاردنەش هێندە سادەو ساکار نییە ،بەڵکو بەستراوەتەوە بەو هەڵبژاردنانەی لە پێشکیدا دەیکەین.

یەکەمین هەڵبژاردنی هونەرمەند[ڕووناکبیر] ئەوەیە کە هونەرند بێت. جا ئەگەر هونەرنەندێتی هەڵبژارد، ئەوە بەپێی سروشتی خۆی و تێڕوانینی تایبەتی خۆی لەهونەردا ، هەڵوێستەکانی دیکەشی وەردەگرێت. خۆ ئەگەر لەم هەڵبژاردنەدا بڕوای

بەپاساوهێنانەوە هەبێت و بتوانێ داکۆکیان لێ بکات، لەوانەیە بشتوانێ هەڵوێستی خۆی لەبەرامبەر مێژوودا روون بکاتەوە.

ئەوەی کە من بیری لێ دەکەمەوە و دەمەوێ ئێستا وەکو رای تایبەتی خۆم، خریبمەوە سەر مەسەلەیەکی تایبەتی کە ویژدان تیایدا سەخڵەت نییە(چونکە من هەستی پێ ناکەم)، بەڵکو هەستێکی دوو لایەنەی دیکەیە لەبەرامبەر بەدبەختی خەڵک لەمندا هەیە، ئەویش بەحوکمی ئەو بەدبەختییە ویەیوەندبوونی بەپیشەکەمەوەیە.

ئێستا دەبێ دیفاع لەخۆمان بکەین و دەمەوێ بڵێیم بۆ لە سنوری توانایی و دەسەڵاتی فەردی ئێمەو ئەو جیهانەی لە کینەو نفرەت دا پروکاوەتەو، پەنابردن بۆ ئەو پیشەیەی کە توانایمان پێدەدات تاکو رابگەیەنین ؛ئێمە دوژمنی خوێنی هیچ لایەنێک نین. هەر ئەوەش لەخۆیدا جۆرێک دیفاع کردن و داکۆکییە، بەلام ئەوەی پێویستی بەروون کردنەوەیە ومنیش ناتوانم بەم روون کردنەوە هەڵسم مەگەر ئیشارەتێک بۆ ئەو جیهانە بکەم کەتیایدا دەژین و هەروەها ئیشارەتێکیش بەو کارە بکەم کەئێمەی هونەرمەندو نووسەران دەبێ ئەنجامی بدەین. دنیای دەوروبەرمان لەبەدبەختیدا نقوم بووە، لیمانی دەوێ بۆ گۆڕینی، تەکانێک بەخۆمان بدەین. ئەم بەدبەختیە چییە؟ زۆر سادەیە؛ لەم سالانەی دواییدا کوشتار سەرانسەری دنیای داگرتووەتەوەو لەوانەیە ئەم کارە بەردەوامیش بێت ، سەرەنجام فەزاکەمان بئاخنێ.

ئەمە شتێکی تازە نییە، مێژووی رەسمی هەمیشە بریتی بووە لە مێژووی بکوژان. هەر ئەمرۆ نییە قابیل، هابیل دەکوژێ و دەیەوێ خەلاتیش بەبەرۆکیدا بکەن.

بەڵێ لەژێر فشاری مێژوو لەقۆناغە درندەییەکان دا، قانونێکی زاڵمانە، جەلادی لە کۆمەڵ دوور دەخستەوە. جەلاد ئەو کەسەبوو کەبەحوکمی ئیشەکەی دەیتوانی دەست بۆ گیانی و ماڵی ئادەمیزاد درێژ بکات. ئەو بێزاری و نەفرەتی لێدەکرا ،خۆشی دەیزانی. هەر ئەو بێزاری و نەفرەتەش بایەخی ژیانی مرۆڤی نیشان دەدا. کەچی ئەمرۆ تەنیا نەنگ و شەرمەزاری لێدەکرێ. کەوابێ حەقیەتی چیتر نەیەوێ خزمێکی فەقیری ئەو خێزانە بێت ،چونکە چرنۆکەکانی پاک نین ولە چێشتخانەدا پێشوازی لێ ناکەن.

لەو شارستانیەی کەتاوان و دڵرەقی بەشێکە لە بروا فەلسەفیەکان وبەم زوانەش دەبێتە بەشێک لەبەها کۆمەلایەتیەکان، جەلادەکان تەواو حەقیانە بچنە ناو دەزگاکانی بەڕێوەبردن.. لەزۆر شوێنی دنیا تاوانباران لەسەر کورسی دەسەلات دانیشتون ،قەڵەمیان کردووەتە جێنشینی تەور...

بەدبەختی ئێمە لەوەدایە لە رۆژگارێکدا دەژین کە رۆژگاری ئایدیۆلۆژیای داخراوو خۆپەرستانەی ژیانە، واتە ئەو ئایدۆلۆژیانەی کەوا بەگێلانە هەق بەکورتبینی خۆیان دەدەن و پێی پشتگەرمن، وا دەزانن رزگاریی جیهان بە فەرمانڕەوایی ئەوان بەستراوەتەوە.

کاتێک هونەرمەند شتەکان لێکجیا دەکاتەوە، دەسەلاتدار تەخت دەکات. هونەرمەند لەقۆناغی گیان و عیشق دا دەژی و داهێنان دەکات و دەزانێ هیچ شتێک سادە نیەو لایەنی دیکەش هەیە. دەسەلاتدار دەیەوێ لایەنی دیکە نەمێنێ. جیهانی ئەو دنیای

خواوەندان وبەندەکانە ،واتە ئەو جیهانەی کەئێستا ئێمە تیایدا دەژین. کەچی جیهانی هونەرمەند جیهانی نارەزایی دەربڕین و تێگەیشتنە.

من هیچ دەقێکی مەزنم نەدیوە لەسەر وێرانی داهێنرابێ ،کەچی ئەمپراتۆری کینە زۆرن. کاتێک دەسەلاتدار بەپێی مەنتقی کردەوەکانی خۆی ،دەست بۆ کوستار دەبات، هونەرمەند ناچارە یاخی ببێت. لە کۆمەڵگای سیاسی ئەمڕۆدا تاکە رەفتار بۆ هونەرمەند پەرچدانەوەی بێدەربەستانەیە. ئەگینا دەبێ واز لەهونەرەکەی بێنێ. تەنانەت ئەگەر بیشەوێ ناتوانێ زمانی ئایدۆلۆژیانەی ئەم سەردەمە بەکار بێنێ. لەم رووەوە بێهودە و گاڵتەجارییە ئەگەر دەسەلاتداران بیانەوێ رێنوێنیمان بکەن و ئیلتزاممان بەسەردا بسەپێنن. *ئێمە هەمووومان مولتەزمین تەنانەت ئەگەر بشمانەوێ ، ئەوە تێکۆشان نییە کەدەمانکاتە هونەرمەند، بەڵکو هونەرە دەمانکاتە تێکۆشەر. هونەرمەند بەحوکمی پیشەی خۆی، هەمیشە ئازادیخوازەو ئەمەش ناسنامەکەیەتی کە زۆر جاران بەگران لەسەری دەوەستێ..*. تاوەزعی جیهان ئاوها بێت ئێمە بمانەوێ و نەمانەوێ مولتەزمین ولە ناخەوە دژی هەر بتێکی داتاشراوی میللی و حزبایەتین. هەڵبەت ئەمە لەئاکامی چاکەو ئەخلاقی خۆمان نییە. ئێمە پیاوی چاکە نین. چەکەکاری ئیشی پیاو چاکانی ولاتە کەوا دین و مرۆڤ پێکەوە ئەندازەگیری دەکەن. بەحوکمی خۆشەویستی مرۆڤ بۆ هەر مرۆڤێکی دیکەیە کە ئێمە هەمیشە پەنا بۆ ئەم کردەوانە دەبەین.

ئەرکی ئێمە دیفاعکردنە لەهەقی هەر کەسێکە ،هەر بۆیەش ئێمە قەت تەنیا نین. وەختمان کەمەو ناتوانین بەتەنیایی دەستبەکار بین. تۆلستۆی توانی گەورەترین رۆمان لەسەر ئەو جەنگە بنوسێت کەخۆی تیایدا بەشدار نەبوو، بەلام ئێمە تەنیا جەنگەکانی خۆمان پێ دەنووسرویتەوە چونکە«پێگی» و هەزاران شاعیری دیکەمان لەبەر چاو دەکوژن.

*هونەرمەندانی راستەقینە نابنە دەسەلاتداری سیاسی لێهاتوو. بەڵێ من ئەوە باش دەزانم– چونکە دەستەوەستانن لەوەی بەئاسانی مردنی موخالیفانی خۆیان بخوازن. ئەوانە لایەنگری ژیانن نەک مەرگ. ئەوانە نیشانەی گیانن نەک نیشانەی قانون.* ئەوانە بەحوکمی سروشتی خۆیان و چارەنوسیان، ناچارن دوژمنی خۆیان تێبگەیەنن وئاگاداریشی بکەنەوە. ئەوەش وا ناگەیەنێ کەناتوانن چاکەو خراپە لێکجیا بکەنەوە. ئەوان لەدڕترین تاوانباردا، پاکی هەمیشەیی مرۆڤ دەبینن. ئەویش ژان و رەنجی خودی مرۆڤە. هەر ئەوەشە لێمان ناگەڕێ حوکمی متڵەق بدەین. لەجیهانی مەرگدا کەجیهانی ئێمەی هونەرمەندانە، دوژمنی کەس نین، جگە لەجەلادان. هەر ئەوەشە ئێمەی«ژیروندی» ی هەمیشەیی خستوەتە بەر پەلاماری *راست وچەپ . ئەوەش هەر چەند زۆر ناڵەبارە بەلام مایەی سەربەرزیمانە.*

***رۆژێک دێت هەموو لایەک لەو دەگەن ، ئەو کاتە خەڵکە لێهاتووەکەمان ڕێز لەجیاوازیمان دەگرن و دەست لەهەڵڕینی یەکتری دەکێشنەوەو تێدەگەن بالاترین پەیامیان تا مردن ، دیفاع کردنە لەهەقی ئەو دوژمنەیە کە نایەوێ بێتە سەر رای ئەوان.*** ئەو کاتە دەڵێن: هەڵە بکەن بەلام کەس نەکوژن و رێگای ئاخافتین بەخەڵکی دیکەش بدەن، لەوە باشترە بەناو بێدەنگی مردوان دا هەنگاو بنێن. ئەو کاتە تێدەگەن ئەوان لەسەر هەقن. ئەوجا تێدەکۆشن تاکو بیسەلمێنن ئەو شۆڕشانەی بەئازار هاتونەدی ،هەر بەقسە دەپارێزرێن. جا تێدەگەن ئەم پەیامە بە ئازارە، خۆشترین

بڕوایان بەدیاری بۆ دێنێ. ئەو برایەی لە شەری گومان و مەزنێتی توونودتیژیدا، لە هەموو قۆناغەکانی هۆش، ململانێی کردووە تاکو لەبەرامبەر فەرمانە ئەبسراکتەکانی مێژوودا، فەرمان بەشت   ێک بدات کەلە مێژوو بەرزترە، ئەویش لەش و گیانی مرۆڤە، چ خۆش بێ وچ ناخۆش.

سەرانسەری ئەوروپای ئەمڕۆ، لەسەر کۆڕی خۆبەزلزانیندا، هاوار دەکاو دەڵێ: ئەمە کردارێکی گێلانەیە، بەڵام ئێمە بۆیە هەین تاکو پێچەوانەی رای ئەوان بسەلمێنین. هەڵبەت خواستی فەرمانڕەوایی بەسەر یەکێکدا بەمانای بێکەڵک کردن و کوشتنیەتی. بۆ دڵنیایتان چاوێک بەدەوروبەرتاندا بگێڕن. ژیان بەبێ گفتوگۆ ناکرێ، ئەمڕۆ لەبەشێکی زۆری جیهاندا کێشە جێی گفتوگۆی گرتۆتەوە.

سەدەی بیستەم سەدەی کێشمەکێش و یەکتر تاوانبارکردنە. لەنێوان میللەتان و لەنێوان کەسانیشدا لەسەر باسی زانستی کێشە هەیە، کاتێک باسەکە زۆریش بێ غەرەزو زانستیش بێت.

- هەزاران دەنگ شەوو رۆژ بەتەنیا دەرێسن وبشێوی دەنێنەوەو لێشاوی قسەی فریودەر بەسەر میللەتان دا دەژین.

ناوەرۆک و شێوەی کاری کێشەکە چییە؟

بریتیە لەوەی بەرامبەرکەت بەدوژمن بزانەو لەئەنجامدا بە هیچی دامەنێ، واتە چاوت نەیبینی. کاتێک من یەکێک تاوانبار دەکەم ،ناتوانم رەنگی چاوی ببینم و ناتوانم لێکبکەمەوە ئاخۆ پێدەکەنێ، ئەگەر وایە زەردە خەنەکەی چۆنە؟ لەئەنجامی کێشەو بەرەدا نیوەکوێر دەبم وئیتر لەجیهانی مرۆڤاندانیم بەڵکو لەناو تارماییامدا دەژیم. ژیان بەبێ باسی و لێکۆڵینەوە ناڕوات، کەچی ئەمڕۆ تەنیا هەڕەشە و ترساندن هەیە.

مرۆڤ کاتێک لەتەنیاییدا بژیەت ،دەزانی چەند شتێک هەیە بەیەکتری دەبەستێتەوە. کەچی ئەمڕۆ شتێکی ترمان کەشف کردووە، مرۆڤی ئەوتۆ هەیە ناکرێ بەباس وبەڵگە قسەی لەگەڵدا بکەیت. نەبووەوە نابێ دیلەکانی ناو ئوردگاکانی بێگاری بە بەڵگە قسە لەگەڵ ئەو کەسانەدا بکەن کە ڕەزیلیان کردوون و تێیانبگەیەنن کە نابێ ئاوا بکەن.چونکە ئەو کەسانە خۆ مرۆڤ نین بەڵکو ئەبستراکتترین بوونەوەرن. ئەو کەسانە ‹چۆن و بۆچی› لە ئیرادەیاندا نەماوە.ئەو کەسەی دەیەوێ دەسەڵات وەوبگرێ کەڕەو نابیتسێ .دەبێ لەبەرامبەریدا یان بمرێ یان بجەنگێ. هەر بۆیەش خەڵکی ئەم رۆژگارە لە هەراسانیدا دەژین.

لەکتێبی مردووەکانی میسری کۆندا ،هاتووە کەمرۆڤی دروستکار، لەکاتی پاڕانەوەمیدا دەبێ بڵێ:«من کەسم نەترساندووە». بەم چەشنە، لە گەورە پیاوانی زەمانی خۆمان کەمیان هەیە لەرۆژی سزادا بتوانێ بکەوێتە ریزی لێخۆشبوان.

ئایا ئەوانە گشتیان مەنتقین؟ کاتێک بیانەوێ سەرانسەری جیهان بەحوکمی فلان تیۆری یەکخەن ویەکسانی بکەن، هیچ رێگایەکی دیکە لەپێشڕوو نامێنێ جگە لەوەی ئەم دنیایە وەک تیۆریەکەی خۆیان وشک وبێگیان وکوێرو کەڕ بکەن. هیچ رێگایەکی دیکە نامێنێ جگە لەوشکاندنی رەگ وریشەی پەیوەندیەکانی مرۆڤ لەگەڵ سروشتدا. بەخۆڕایی نیەکە ئەدەبیاتی ئەوروپا دوای داستایوفسکی ئیتر باس لە ٢١٤

سـروشت ناكات. هـەروەها بەخـۆڕایی نیـە كـە بەناوبانگـتـرین كـتـێب لەم رۆژگـارەدا لەجیات گرنگیـدان بەترپەی دل و راستـیـەكانی ئەڤین ،تەنـیـا دەكەوێتە داوەریكردن وشـەرحدانی تومـەتەكان. لەجێی كردنەوەی دەریچـەیەک بەسـەر جـوانیـەكانی دنیـادا، هەراسـانی بۆ خـەڵكانی دنیا بەجـێدیڵێ. ئەوەش بەخـۆڕایی نیـە كەئەو فـەیلەسـوفـە گەورەیە تائێسـتـاش بەسـەر فكری هەمـوو ئەوروپاییـاندا زاڵە، دەیگوت: تەنیا شـارە تـازەكـان دەتوانـن خــەڵكی بە خــۆئـاگــایی ڕابێنن .هـەروەها دەیگـوت،ســروشت ئەبستراكتەو عەقل وپەیڕەو كارە. ئەمە بیرڕای هێگڵەو سەرەتای روداوێكی گەورەیە. ئەوەش سـەرەنجـام دەبێـتـە مـایەی كوشـتـنی هەمـوو شـتێک. ئەو مێشكـە مـەست و بێخەبەرانە لە تێڕوانینی سروشتدا تەنیا خۆیان دەبینن. ئەوەش ئەوپەڕی كوێرییە.

لەوە زیاتر چی بڵـێم؟ ئەوانەی شـارە وێرانەكـانی ئەوروپایان دیتـووە ،دەزانن من چی دەڵێم... كارەسـاتی گەورەی مرۆڤی رۆژئاوا ئەوەیە لەنێـوان ئەو و گۆڕانی مێـژوویدا هیـچ هێزێک نییە، نەهێزی سروشت و نەهێزی دۆستایەتی...

لەوانەیە لەم رۆژگارەدا خـەڵک بتوانێ هەمـوو شتێک بخـاتە ژێر ركێفی خـۆی، مەزنی ئەوانیش لەوەدایە. بەڵام شـتێک هەیە ئەوان قەت نـایبـنن، ئەویش هێزی عشـقەو لێیان دزراوە. هـەر بۆیەش خەڵک شـەرم دەكـەن و رۆشنبیرانیش هەقە لەم شـەرمەدا بەشدار بن، چونكە لەهێنانیدا بەشداربووین، بەڵام بەلانیكەم پێویستە بزانین شـەرم لەخۆیان دەكەنەوە نەک لەپیشەكەیان.

***شـەرەفی هـونەر لەمـخـالیف بوونی ئەم دنیـایەو پەرچدانـەوەیەتی. هەمـوو دەقـێكی هونەری لەبوونی خۆیدا سەركەوتنی ئایدیۆلۆژی ڕەتدەكاتەوە.***

یەكێک لەشاكارەكانی سبەینێی مێژوو، تێكۆشانێكە هەر لەئێستاوە دەستپێكردووە، ئەویش لەنێـوان دەسـەڵاتداران و هونـەرمـەندانە. كـەچی هەردووكـیـشـیـان یەک ئامـانجیان هـەیە، كاری سیـاسی وداهێنانی هونەری، دوو پرۆسـەی یاغی بوونن دژی ئاڵۆزییـەكـانی دنیـا. هـەردووک دەیانەوێ دونیـا یەكـبـخـەن. رۆژێرگـارێـک زۆر ئاواتی نوێخـوازیی سـیـاسـیی و ئامـانجی هونەرمـەند بەیەكـشت دەزاندران. بانگەشـەی بۆناپـارت هـەر بانگەشـەكـەی«گـۆتە»یە. هەڵبـەت بۆناپارت تەپڵـی لەقـوتابخـانەكـاندا بەجـێـهـێـشت و گـۆتە كـتـێـبی لاوكـەكـانی روحـی كـردە یادگـار ،وەلێ لـەو كـاتەوە ئایدیۆلۆژیای نوێ بە پشتیوانی تكنولۆژیا هاتۆتە مەیدان و بزووتنەوەیەكی زیرەكانە، پیاوی شۆشگێڕی كردووەتە دەسەڵاتدار. ئەم دوو بزووتنەوە فكریە لێكەڵبراون چونكە ئەوەی دەسـەڵاتداری راست یـا چەپ دەیخـوازی، یەكـبـوونێک نیـە ببـێـتـە مـایەی رێكخـسـتنەوەی كـاروباری مـخـالیفـان، بەڵكو گـشـتـێكی كـامـڵەو دەبێـتـە مـایەی نەهێشتنی نەیاران

# ڕۆشنبیرانی کۆتایی سەردەمی سۆسیالیزم

## ریچارد رۆرتی [ئەمریکا]

دوای ڕووداركانی سالآنی ١٩٨٩- ١٩٩١ دەرکەوتووە کە ڕۆشنبیرانی چەپڕەوی ئەمەریکا پێویستیان بەچەمکی سیاسیی تازە هەیە. ئەگەر بۆ دەربڕینی مەبەستەکانمان، وشەی سۆسالیزم بەکار بێنین ئەوە ئەو ڕێبوارانەی لەئەوروپای رۆژهەلاتەوە دوای شۆش هاتوونەتە لامان، بە حەپەساویەوە سەیرمان دەکەن. لەوانەیە دۆستەکانمان لەئەوروپای رۆژهەلات کەبۆماوەیەکی زۆر فشارو ئازاری حکومەتە بە ناو مارکسیستەکانیان تەحەموول کردووە، هیچ فەرقێک لە نێوان چەمکەکانی مارکسیستی و بالۆرەکانی نازیزم دانەنێن ،هەروەک چۆن حەق بەخۆمان دەدین گومان لەراستگۆیی یەکێک بکەین کەبە«سەرەڕۆییەکانی هیتلەر»دا هەلدەلێت .دەبێ ئەو حەقەش بەبرادەرانمان لەچکوسلۆفاکیا و هەنگاریا بدەین کاتێک ڕۆشنبیرانی ڕۆژئاوا باس لە«سەرەڕۆییەکانی ستالین» دەکەن، نارەزاییمان بەرامبەر دەببڕن. نابێ چیدیکە ئیدعاکانی تروتسکی باوەڕ بکەین کەدەیگوت ستالین خیانەتی لەگەڵ شۆڕشێکی هیوابەخش کرد. ئێمە هەمووومان راهاتووین لە جەنگی جیهانی دووەم بەباشی تێبگەین، کەچی زۆربەمان ڕاانەهاتووین تا لایەنە باشەکانی جەنگی سارد قەبووڵ بکەین. بەڵام خەڵکی(چیک) جەنگی سارد بەچاک دادەنێن و بە بیستنی ئەو بڕوایەی ئێمە خوێنیان بەجۆش دێت کەدەڵێین: ئەمەریکا دەبوا خۆی لەجەنگی سارد بپارێزێ ولەساڵی ١٩٤٨ دا سازشی لەگەڵ ستالین کردبا. هەروەک هەڵچوونی فەڕەنسەییەکان بەبیستنی ئەم بۆچوونە کەدەڵێ: دەبوا بریتانیاو ئەمەریکا هەروەک چۆن لەساڵی 1941 خیانەتیان لەگەڵ(بەنز) کرد، دەبوا لەگەڵ (دیگۆڵیش) هەروابکەن .

ئێمەی رۆشنبیرانی چەپڕەوی رۆژئاوا ،پێویستمان بەزەمانێکی درێژ هەیە تا رادێین و تێدەگەین کە وشەی سۆسیالیزم ئیتر هیچ تواناییەکی نەماوە، ڕاست وەکو ئەو وشانەی لەم سەرچاوەوە دەهاتن ووایاندەیانگەیاند کە ڕێگایەکی دیکەی جیا لەسەرمایەداری هەیە. نەک هەر دەبێ چیتر رستەی«ئابوریی سەرمایەداری» بەکار نەهێندرێ چونکە کارکردنی ئابورییەکی ناسەرمایەداریمان نەدیوە. هەروەها لە بەکاربردنی رستەی«فەرهەنگی دژی بورژوازی« خۆمان بپارێزین- چونکە نازانین فەرهەنگی دژی بورژوازی لە کۆمەڵگای پیشەسازیدا چۆن فەرهەنگێکە.

 ئێمەی تۆرژێرەوەکان، دەبێ هەوڵبدەین خۆمان لەو چەمکە مارکسیتیانەی کەپێیان ڕاهتووین و حەزمان لەبەرکارهێنانیانە ،بپارێزین. هەڵبەت هیوادارم لەوەش

هەورازتر برۆین: رابگەیەنین نەهیچ شتێک بەناوی«پایەی زانستی» بۆ کاری سیاسی هەیەو نە پێویستیشمان پێیەتی، هەروەک چۆن کارۆل پۆپەر چل ساڵ بەر لەئەمرۆ وتی: ئەفلاتون وکارل مارکس زۆر پێکدەچن. ئەفلاتون دەیگوت ؛هەرگیز عەدالەت نایەتەدی مەگەر پادشاکان ببنە فەیلەسوف و فەیلەسوفەکانیش ببنە پادشا. پوپەر ،تیۆریەکەی خۆی لەگەڵ روحی مرۆڤدا بە گونجاو دەزانی. ئەویپیوابوو بە قووڵی لە سروشتی کۆلیوەتەوە .کارڵ مارکس بڕوای وابوو عەدالەت نایەتەدی مەگەر سەرمایەداری برۆخێندرێ و دەست لە فەرهەنگی چەوساندنەوە بشۆردرێ: ئەویش پێی وابوو تیۆریەکان لەسەر ناسینی زۆر قووڵی ،پرۆسەی مێژوویی چەقیوون. هیواداوررم ئەو زەمانە هاتبێ کە پشت لە بیرورا هاوبەشەکانی ئەفلاتون و مارکس بکەین، کە باوەڕبوونە بە هاتنی شێوازی زانستی بریقەدار و رێگا کردنەوەیە لە بەردەم، هاتنی عەدالەت دا.

هیوادارم لە ژیان فێربین، بەبێ ئەوەی پێویستیمان بەو باوەڕە هەبێت کە پێیوایە بۆچوونی قووڵ و فەلسەفیانەی وەک رۆحی مرۆڤ، چارەنووسی مرۆڤ یان ستروکتوری مێژوو، ببنە بابەتی لەبار،ئیدی پرۆپاگەندەی سیاسیی کارنەکاتە سەر ژیانمان.

ئێمە دەبێ وەک حکوومەتی پۆلۆنیاو لیتڤانیا ،زۆر بەخاوی و کاڵی ئەزموونەکەمان دەست پێبکەین. جا ئێستا کە ناتوانین چیدیکە بە لینینیستی بمێنینەوە، دەبێ رووبەڕووی ئەو پرسیارانە ببینەوە کە لینینیزم خۆی لێیان دزیوەتەوە. ئێستا کە دەزانین کۆمەڵگای بۆرژوا- دیموکراتیک لەبارترین کۆمەڵە، دەکرێ ببێتە نموونەیەکی خەیاڵی.

ئەدی ئەو بۆشاییەی هەستی پێدەکەین چییە؟ ئایا لەوەوە دێت کەوا دەزانین هەژارەکان یەکسەر لەژێر چەوساندنەوەی دۆڵەمەندەکان نایەنەدەر، یان وادەزانین ئەو یەککگرتنەی لە کۆمەڵگای سۆسیالیستی دەبێ هەبێ قەت نایەتەدی؟ ئایا تێنوێتیمان بە داستانێکی عاشقانەی مێژوویی تێر نابێ کە زۆر بە قووڵی لە گۆرانکاریی کۆمەلایەتی دەدوێ؟ نیگەرانیمان بۆ خەڵکی زەحمەتکێشە یان هەندێک لەو حەزە گەرموگوڕەمان بۆ ئەو رۆلەیە کە بۆ خۆمان دانابوو؟

وەلام هەرچی بێت، پێموایە ئیمەی چەپە رۆژئاواییەکان، پێویستە بەهۆی چەمکی سیاسیی ئەوتۆ کە خەڵک تێیانبگات شۆڕشی ١٩٨٩-١٩٩١ دانپیانێین. پێشنیار دەکەم لە جیاتی (ئایدۆلۆژیای بۆرژوازی) باسی «تەماح و خۆپەرستی» بکەین. لەجیات رستەی «چەوساندنەوەی کرێکاران» کرێی نەمرو نەژی و بێکاری بەکار بێنین و لەجێی دابەشکردنی کۆمەڵ بۆ چەند چینێک، باسی پەیرەوکردنی جیاوازی لەناو پرۆژەکانی پەروەردەو تەندروستی بەپێی بەرژەوەندیی هەڵکەوتوان «دەولەمەندان» بکەین. پێشنیار دەکەم واز لەو بڕوایە بێنین کە دەڵێ رۆڵی رۆشنبیران بە کەڵکومرگرتن لە رەخنە گرتنی رادیکالانە ،لەوەدایە باس لەو راستییانە بکات کە لەو دیوی دیاردەکانن.

دەخوازم پەنابردن بۆ چەمکی بە «نهێنی و ئاڵۆز»و «ئایدۆلۆژیک» بەلاوە بنێین چونکە ئەو چەمکانە هێما بۆ ئەوە دەکەن، ئێمە پێگەیەکی ئەوتۆمان بۆ خۆمان داناوە کە ستروکتوری کۆمەلایەتی نەتوانێ فێڵمان لێبکات .یان گوایە دەتوانین ئەوەی لەودیو

ستروکتورەکە هەیە هەستی پێبکەین.

واباشە بەم قسەیە قەناعەت بکەین: لەوانەیە بتوانین کۆمەڵێکی لەوە باشتر بنیادبنێین، باشتر نەک بە مانای بەراود کردن لەگەڵ ئەوەی ئێستا هەیە بەڵکو بە مانای کەمکردنەوەی بێعەداڵەتی و نابەرابەریەکان. لەم رووەوە تەنیا رەخنەی ریفورمستانەبەکەلک دێن- نەک رەخنەی رادیکالانە. دەبێ چارەسەری بۆ رێکخراوە کۆمەڵایەتییەکان پێشنیار بکرێت، چارەسەری ئەوتۆ کە پێویستی بە مرۆڤی چەشنی نوی (انسان من نوع جدید) نەبێت. ئەمە لەگەڵ رەخنەکان شتێکی پێویستە. پێموایە رۆشنبیران پێویستە کەمتر خۆمان بە فەلسەفە و چمکی ئاکادیمیکی لە بابەت سیاسەت و رەخنەی ئایدۆلۆژیک مژوڵ بکەین. لە جیات ئەوەی وەختی خۆمان خەریکی چاککردنی یاساو دانانی سیاسەتی هەڵبژاردن و دارشتنی کەتەلۆگی (نوێ) بۆ ئەنجامدانی گۆرانکاری، بکەین، دەبێ دان بەوە دابنێین ئێستا ناتوانین چیتر دژی سەرمایەداری بجەنگین و هەست بە بۆشاییەکی زۆر گەورە دەکەین. چ بەباش و چ بە خراپ «سوسیالیزم» وشەیەک بوو شەوقی دەخستە دڵی شەریفترین مرۆڤی ئەم سەدەیەو چەندان ژن و پیاوی دلێر گیانی خۆیان کردە قوربانی ئەم، ئەوەش ئایدیایەک بوو هیچ سەرەنجامێکی نەهێنا.

بەهەرحاڵ، وێنەی لینین لە «ئیستگای فەنلاندا»، ئەو وێنەیەی دڵ و دەروونی باپیرانی ئێمەی داگیر کرد، لێرە جێی دەستکاری و زیندوو کردنەوەی بۆ نیە.

هەر ئەو وێنەیە لەسەنتپترزبۆرگی ئەمرۆ (لینینگرادی دوێنێ) یادهێنەری مۆتەکەیەکی گەورەیە. بۆ نەوەکانی ئێمەش هەر ئەم وێنەیە دەچێتە پاڵ وێنەی هیتلەر لە میتینگێکی نورمبەرگ و وێنەی مۆسولینی لەسەر گەوارەی کۆشکی ڤنیزیا.

ئێستا چ شتێک دەتوانێ مێشکی چەپرەوەکانی دنیا داگیر بکات؟ خۆ ئێستا کەس نایەوێ سرودی (ئەنتەرناسیۆناڵ) بچرێ. ئەی نەوەی داهاتووی خوێندکارە ئایدیالەکان چ سروودێک دەڵێنەوە؟ چ شعارێک ئەو گەنجانە کۆدەکاتەوە کە تێگەیشتوون ئەوەی باپیرانییان پێیان دەگووت «شۆرشی بۆرژازی»، نابێتە مایەی شۆرشی گەلان؟ ئەو گەنجانەی تێگەیشتوون ئەوەی باپیرانیان ناویان دەنا «ریفۆرمی وردە بورژوازییانە» بەلانیکەمەوە لە وڵاتە دیموکراتییە پیشەسازیەکاندا تاکە رێگای سیاسی بەردەمیانەو شۆرش لە وڵاتانی جیهانی سێیەم دا دژی تاقمێکی دیکتاتۆر، سەرەنجام ساخت و کارێکی باشتر لە دیموکراتیە پیشەسازیەکان ناهێتەدی، کام ژن و پیاوی قارەمان و کام رووداوی سەرکەوتوانە دەتوانێ مێشکی خوێندکارانی چەپرەوی ساڵی ٢٠١٠ بەخۆیەوە خەریک بکات؟

من هیچ وەڵامێکی نیهایم بۆ ئەم پرسیارانە نیە. ئەو وەڵامەی بەزەینم دادێت ئەوەیە: لەوانەیە وێنەی ڤاتسلاف هاڤێل شوینی وینەی لینین بگریتەوە و شەرحکردنی رووداوەکانی ١٩١٧ لە سەنتپترزبۆرگ، شوێنی خۆی بداتە رووداوەکانی ساڵی ١٩٨٩ی پراگ. راستگۆیی شایستەی هاڤێل، دیمەنێکی لەو دروستکردووە کە لینین نەیتوانی هەیبێت. بیرکردنەوە لەوەی نووسینەکانی هاڤێل ببنە رێخوشکەرێکی جیهانی و پر لە ئومێد بۆ هێنانی عەداڵەتی کۆمەڵایەتی، هێندە دوورو دژوار نیە. ئەو لە گفتوگۆیەکدا کە لە کتێبی «دوژمنایەتی لەگەڵ ئاشتی» دا، هاتووە دەڵێ «هیواداری بەمانای پێشگۆیی نیە». هاڤێل لەوێدا باس لە بروانەبونی خۆی بەهێزی

پەنهانی و قەدەری مێژوویی دەکات. ئەوەی لەسەر رووداوەکانی ساڵای ٦٩-١٩٦٧ دەینووسێت نموونەیەکی باشی ئەم چەشنە بیرکردنەوەمیەیە، کێ باوەڕی دەکرد- ئەویش لەکاتی گەندەڵی حکوومەتی (نۆڤتنی) و دابەزینی رەوشتی میللی، دوای تەنیا شەش مانگ هەر ئەو کۆمەڵە، نیشتمانپەروەرییەکەی بە دەست بێنیتەوەو ساڵێک دوواتر ئەو میللەتەی تا ئەوسا بەدبین و بێ ئومێد بوو، بەو هەموو دلاوەری و لێزانینە، لەرووی دەسەلاتێکی بیانی بوەستێت.هەر ئەو میللەتە دووای ساڵێکی دیکە بەخێرایی، بێئومێدی دایبگرێتەوە لە جارانیش قوڵتر دابگیرێتەوە؟کەواتە دوای ئەم ئەزموونانە پێویستە مرۆڤ بە پارێزتر دەرەنجامی ئەوە بچنێتەوەو بزانێ ئێمە چین و دەبینە چی؟

هەر چەندە هاڤێل باسی خەڵکی چیک وسلۆفاکیا دەکات بەلام بۆ هەموو مرۆڤایەتی دەگونجێت .ئەگەر بمانەوێ بۆ ئەم قسەیەی هاڤیل کە«هیواداری بە مانای پێشگۆیی نیە»،نموونەیەک لە کۆمەڵگای ئەمەریکا بێنینەوە، دەتوانین بڵێین: کێ دەیتوانی پێشبینی بکات چینی ناوەراست ‹سپی› کەپشتیوانی لە پرۆژەی ‹ترومەن›دەکرد بۆ بە یەک پارچە کردنی سوپا وجیاوازی نەهێشتن لە نێوان رەش و سپی، رێپێوان و خۆپیشاندانەکانی «کینگ» ی پەسەند کرد و مارتین لۆتەرکینگی کردە قارەمانی کتێبەکانی قوتابخانە سەرەتاییەکان، ئێستا هەمان چینی ناوەراست، کەمکردنەوەی باج بە باشتر دەزانی لە پاراستنی منداڵان لە چنگ مەترسی سورێژە! کێ دەیزانی دوای تێپەرینی یەک دەیە هەر ئەو چینە ناوەنجییە شەڕ بۆ تەماح و چڵیسی خۆی نەکاو دژی ئەو هەلپەرستانە نەوەستێت کە هاندەری ئەو هەڵوێستەی بوون؟

لینین نەیدەتوانی وەک هاڤێل بیر بکاتەوەو بڵێ:«دەبێ بەپارێزو لەسەرخۆ، بیر بکەینەوە ئاخۆ ئێمە چین و دەبێ ببینەچی و دەرەنجامی لێوەربگرین»، چونکە لینین وایدەزانی لە سۆسیالیزمی زانستیدا ئەو ئامرازە سیاسییە پێویستیە، بۆ هێنانەدی پێشگۆییەکانی. ئەگەر بەخت یارمان بێت، کۆتایی هاتنی لینینیزم دەبێتە کۆتایی هاتنی سۆسیالیزمی زانستی و بەشەکانی دیکەی پێشگۆیی (التکهن) تیۆری.

سەرەڕای ئەوەش، زۆربەمان بە پەیدا کردنی جێگرێکەوە بۆ مارکسیزم مژۆڵین ،بەدوای چوارچێوەیەکی گەورتری تیورین تاکو بەپێی ئەو بتوانین کۆمەڵەکەمان بخەینە پێگەیەکی نویی زیندوو. خۆزیا توانیبامان شتێک زیاتر لەو بەندە بڵێین کە ئێژی «مرۆڤ پێویستە زیاتر میهرەبان و بەخشندەتر بێت و کەمتریش خۆبین و خۆپەست بێت». هیچ هیوایەک جگە لە ریفۆرم کردن نیە لەسەر بنەمای ئەزموون، هەڵە یان راست دوو هەنگاو بچینە پێشەوەو هەنگاوێک بۆ دواوە بگەرێینەوە، راێک ئەوەی لە دیموکراسییەکانی رۆژئاوادا لە شۆرشی فەرەنسەوە تاکو ئێستا دەکرێت.

# ڕۆشنبیران و دەسەڵاتی سیاسی

مورتەزا هاشمی تاری (ئێران)

لەم زەمانەدا ڕۆشنبیری ڕاستەقینە، هەوڵ بۆ ناساندنی ڕاستەقینەی خۆی دەدات تا لە بوارێکی تایبەتیدا شارەزایی پەیا بکا.. شارەزایی بۆچوون و بیرکردنەوەیە. سەردەمی ئێمە، سەردەمی زانستە، ئەوەش زیاتر یەخەگیری ڕۆشنبیرانە، بۆیە هیچ کلیلێک نییە هەموو قوفڵێکی پێ بکرێتەوە. چەندان ساڵ دەخایەنێ تاکو ڕۆشنبیر تێدەگات «نازانم» بەشێکی گرنگی بیرکردنەوەیەتی. ئەو «ڕەخنەگرێکی پیشەیی» نییە تاکو لە هەر شتێکدا بە پەلە دادوەری بکا، بەڵکو دەبێ زانیارییەکەی پلیکانێک دروست بکا،تاکو ناساندنی فەلسەفەی خۆی پێئامادە بکات.

ئەگەر ڕۆژگارێک، خوێندەواری، نیشانەی ڕۆشنبیری بووبێ، ئەمڕۆ ئیتر تێڕوانینی قووڵ و بەرفرەوانی دیدگای لەگۆڕاندا بوونی توانایی بیرکردنەوەیە ئەبستراکت (انتزاعی)و گشتیپێدان (شمولی)، تایبەتمەندی ڕۆشنبیرانە. ڕۆشنبیران لە خەڵکی دیکە باشتر دەرک بە هەڵەی هەست و تێگەیشتن و مەنتقی خۆیان دەکەن ، زووتر دەکەونە ڕەخنە لەخۆگرتن.

**بیرکردنەوەو ڕەفتار لەناو کۆمەڵە نەخوێندەوارەکان**

ئیبن خەلدون لە بەرهەمە زیندووەکەی خۆیدا لەسەر ڕۆشنبیران و پلەکای بیرکردنەوەو قولایی بیرکردنەیاندا دەنووسێ:«بیرکردنەوە تایبەتە بە مرۆڤ و هەر بەوەش لە گیاندارانی دیکە جیادەکرێتەوە، بە لێوردبوونەوەی پلەکانی (هۆ) و (هۆکار) لە ئەندیشەی کەسێکدا ،دەکرێ پەی لە پایگای مرۆڤایەتی ببەیت. هەروەک چۆن هەندێک کەس لە «هۆیی»دا دوو یان سێ پلە لە بیرکردنەوەدا بەکار دێنن و هەندێکیش لەوە زیاتر ناڕۆن ،بەڵام هەشن تا پێنج و شەش پلەی بیرکردنەو دەڕۆن. ئەو کەسانەی دوایی لە باڵاترین پایگای مرۆڤایەتی دان».

**چۆنیەتی بیرکردنەوە لە کۆمەڵی پیرۆزدا.**

لەو کۆمەڵگایانەی نەخوێدەواری بەرۆکی گرتوون «هەر گۆڕان و نوێخوازییەک زیاتر دەچێتە ڕووبەڕووی بەرەنگار بوونەوەیەکی کۆمەڵایەتی مەترسیدار. لەوەوەیە کە پەنا بۆ نەریتگەرایی (بایەخ-قیم)ە زاڵەکانی ناو کۆمەڵ دەبردرێ.. «لەم کۆمەڵە پیرۆزانە»دا، نەریت و پاشماوەی دابی باپیران لەناو خەرمانەیەکی پڕ لەسۆزو ڕێز دادەنرێ و لادان و فەرامۆش کردنیان بە گوناحێکی گەورە ئەژمێردرێ کە چاوپۆشینی تێدا نییە. بەگویرەی بۆچوونی (ماکس ڤوبەر) کۆمەڵگا نەرپتپەرستەکان چ ئەوانەی نووسینیان هەیە یان ئەوانەی کە نیانە، بەم چەشنە بەڕێوە دەچن: پیر

سالاری، باوکسالاری، حکومەتی میراتی یان پادشایی، سیستەمی تەکدەسەلاتی، حکومەتی زەمینداران».

کەواتە بڕوای نەریتگەرایی زۆر لەوە بەهێزترە کە ڕۆشنبیر بتوانێ بەبێ لەبەرچاوگرتن بتوانی گۆڕانکاری بکات.

پیشەسازی هۆکاریکی گرنگە کە زەمینە بۆ لێکهەڵوەشاندنی نەریتگەرایی خۆشدەکات، بەڵام سیاسەتمەدارو دەوڵەتدارانی ئێمە قەت لەبیری ئەوە دانەبوون، هەربۆیەش نەخوێندەواری نەریتگەرایی گەرومانی گرتووەو ناتوانین خێرا ئاستەنگەکان لابدەین و شارستانییەکی پیشەسازی دروست بکەین:«ڕۆشنبیران ئەمڕۆی ئێران نابێ وڵاتەکەیان لەگەڵ ئەوروپا بەراورد بکەن و خۆیان تووشی ئەم هەڵەیە بکەن... پێویستە بزانن ئێرانی ئەمڕۆ لە ڕیزی ئەوروپای سەدەی پانزدەو شانزدە دایە، نەک ئەوروپای سەدەی بیستەم، هەروەها ئیسلام، مەسیحیەت نییە!».

پرسیارەکە ئەوەیە: چۆن دەتوانین ئەم سێ چوار سەدە پاشکەوتوویییەی خۆمان قەدبڕ بکەین و قەرەبووی بکەینەوە؟

بەرەواڵەت دوو ڕێگا لەبەر دەمدایە:

١- گەڕانەوە بۆ دوواوە، ئەویش نەک دوواوەی راسیۆنالیزم (العقلیە)، بۆ دوواوەی رەفتارە کۆمەڵایەتیە چەسپاوە مێژووییەکان، واتە عیرفان و گۆشەنشینی... هەر لەوەشەوەیە لە کولتوری ئێمەدا (حافز)و (مەولانا) لە (ئیبن سینا)و (خەیام) ناسراوترن.

٢- گۆڕان لەڕێی شۆڕش و بەدەستەوەگرتنی دەسەڵاتی سیاسی، ئەوجا خەبات کردن لەدژی ئەنجامەکانی نەزانین، نەک دژی هۆیەکانی ئەو. ئەوەش لەناو ڕۆشنبیراندا بووەتە باو. کەواتە شۆڕشی مەشروتە بۆ بەدەستەوەگرتنی دەسەڵاتی سیاسی بووە نەک بۆ گۆڕانکاریکردن لەژێرخانی فەرهەنگ و ئابووری دا... هەڵبەت زۆریش لەم ڕێیەدا گیانی خۆیان بەخت کردووە، بۆیەش ڕۆشنبیریان لەگەڵ دەسەڵاتی سیاسی وەکیەک دەناساند، چونکە هەر لە کۆنیشەوە دەرباری پادشاکان پەناگای ڕۆشنبیران بووە. ئەمڕۆ ڕۆشنبیران دەیانەوێ ئەم پرۆسە دەروونی و ئابووری و کۆمەڵایەتی و مێژوویییە بەرەوکردنەوەی دەسەڵاتی دەوڵەتداران و تێکلاوبوون لەگەڵ خەڵک هەراش بکەن. هەرچەندە ***لە کۆنەوە هۆکاری (راکێشان) لەلایەن دەسەڵاتداران هەمیشە ژمارەیەکی زۆر ڕۆشنبیری- خستووەتە خزمەتی خۆیان.***

***لەولاشەوە هێزی پاڵنەر لەلای خەڵکرا، ڕۆشنبیری لەخۆی دوور خستۆتەوە. دەسەڵاتدارانیش هەمیشە پێویستیان بە ڕۆشنبیران بووەو بۆ بەرژەوەندی خۆیان داڵدەیان داون.***

***لەم ڕۆژگارەدا، دەزانن ڕۆشنبیر «رەخنەگرێکی زگماکیە» کەچی ئێمە رەخنەگرتن بە هەڵسەنگاندنی سیفەتی باش و خراپ دەزانین. هەر کاتێکیش ڕۆشنبیر خۆی لە دەسەڵاتداران بەشایستەتر زانی و لەم روانگایەوە دەستی کرد بە وەردەگلەیی، ئەوکاتە ڕۆشنبیر لە دیدگای سیاسیەوە دەناسرێت. لەو کاتەدا بیر لە (حکومەتی زانایانەی ئەفلاونی) دەکاتەوە، نەک لە دیدگایەکی فەرهەنگی و هونەری و نوێخوازی***

***ئەوتۆ کە هەموو بوارەکانی فکر بگرێتەوە بەبێ بیرکردنەوە لەوەی کە سیاسەتیش زانستەو بەکارهێنانی، پێویستی بە شارەزایی هەیە***. خۆ ئەگەر نەبێتە بێ حورمەتی بە کەس، ئەوە نابێ وەک دوای شۆڕشی ۱۹۷۹ی ئێران بیربکەنەوە. لەوکاتدا «گروپە سیاسیەکان» رۆشنبیریان بە سیاسی دەزانی. هەڵبەت هەموو کەس، لەلای خۆیەوە هەندێک سیاسیە، ئەگەر بەدرۆیان نەیشێوێنن. هەر بۆیەش لەو کاتدا رۆشنبیر هیچ گرنگی بەکاری کولتوری نەدەداو لەسایەی دیکتاتۆریدا بەسەر گروپەکاندا دابەش بووبوون و بە پەنهانی خەریکی بەجێهێنانی داب و نەریتەکانی خۆیان بوون و هەندێک خەت و هێمای ئەوتۆیان دادەهێنا کە (نا مەحرەم و عوام الناس) لێیان حاڵی نەدەبوون. لەو حاڵەتە لەنێوان دوو بەرداشی دیکتاتۆری و غەریزەی دیکتاتۆرپەروەری- عوام الناس-دا دەهاڕدران. ئالبرکامۆ دەڵێ: «هونەرمەندانی راستەقینە نابنە سیاسی سەرکەوتوو».

له ئەزموونەکانی ئەم دواییەی شۆڕشدا دیتمان کەسایەتییە فەرهەنگی و ئەدەبیەکان چۆن لە دیدگای سیاسییەوە سەیر دەکران، هەر لەوەشەوە بوو دەهاتن رەخنەیان لە «فیردەوسی» دەگرت و لەروانگای «سیاسیەوە» هەڵیاندەسەنگاند نەک لەرووی فەرهەنگی. کەچی رازی سەرکەوتنی فیردەوسی لە سیاسی بوونی دانییە چونکە «شاهنامە» سیاسەتنامە نیە تا بەشیعار دەست پێ بکاو بەشیعاریش کۆتایی بێت، «شاهنامە» راگەیاندنێکی رۆشنبیرییە.

سیاسەتگەرایی رۆشنبیران، ئەوانی لەبیرکردنەوە لەسەر کەموکوڕییەکانی رۆژانەی کۆمەڵ دوورخستۆتەوە چونکە ئەم باسانەی دوایی زۆر لە سیاسەت زیاتر شارەزاییان دەوێ.

گۆڕانکاریش لە فەرهەنگدا پێویستی بە کارێکی قووڵتر هەیە، پرۆژەکەش لە گۆڕانگاری سیاسی بەزەحمەت ترە.

پەرەسەندنی لە رادەبەدەری ژمارەی دانیشتوان، هەموو خزمەتگوزاریەکانی دەوڵەت و غەیرە دەوڵەت هەڵدەولوشی هەروەها کەمبوودی پێداویستیەکانی خوێندن، نزم بوونەوەی پلەی خوێندن، نەخوێندەواری بێزاری و خۆخواردنەوەی لاوان، پەرەسەندن لە خواردنی موخەدررات و... شتی لەم بابەتە، حکومەت بە دەست هەر کەسێکەوە بێت، لە پەلوپۆی دەخات.

نامانەوێ لە بایەخی کاری سیاسی رۆشنبیران بێنمە خوارەوە بەلام دەڵێم بیرکردنەوە لەم بابەتە ئاستەمانە، کاری رۆشنبیرانە. رۆشنبیران ئەو خەڵکەن کە لە (عوام الناس)ەوە پەیدا دەبن بەلام لەبەر نەزانی و کۆنەپەرستێتی خەڵک، رۆشنبیران لێیان دووردەکەنەوەو لەگەڵیان تێکەڵ نابن، هەڵبەت خۆشیان لێبزر ناکەن چونکە رێگاچارە هەر لە پەیوەندبوون بەم ناوەندەوە دەبینن. ئەو هێزەی رۆشنبیران دەبزووێنێ بریتی یە لە بیرکردنەوە، لێکدانەوە، دووبارە بیرکردنەوەو نوێخوازی گونجاو لەگەڵ ژیانی کۆمەلایەتی خۆیان. نابێ لەبیریش بکەین کە سیاسەت «زانستی دەسەلاتداریە» و لەگەڵ حەزو ئارەزوو و شیعاری سیاسی و خواستی دیکەدا ئاویان بە جۆگایەکدا ناڕوات. هەمیشە زیندو مەهدی ئەخوانی سالس دەڵێ:«سیاسەت لەم رۆژگارەدا بووەتە زانستێکی شاراوە و زۆر وردەکارانە. بە ئازاریشەوە ئیعتراف دەکەم کە.. من قەت داوەری سیاسیم نەکردووە تا دوای چەند

ساڵ تەماشا بکەم چیم لێقەوماوە تا ئەوسا هاوار بکەم: ئای بابەرۆ من چەند لەواقیعەکە دوورم. چەند بەرەواژوو بیرم کردۆتەوە چۆن کەوتومەتە ژێر کاریگەری جەوسازی و گرِوگەفی سیاسەتمەداران، بەراستی سیاسەت کاری هەموو کەسێک نییە.. هەروەها هیچ پێویست ناکات لە سیاسەتدا من بەشداربم. بۆ دەکرێ هەموو هەر شارەزای سیاسی بین؟ نا بابە مەسەلەکە هێندەش ئاسان نییە).